# (عُمْدَةُ الأَحْكَامِ مِنْ كَلَامِ خَيْرِ الأَنَامِ)

# بە كوردی

دانراوی زانای پایە بەرز

عَبْدُ الغَنِيِّ المَقْدِسِيُّ

٥٤١ - ٦٠٠ كۆچی

وەرگێڕانی

زانا فاروق حەمە ڕەشید

پێداچوونەوەی

مامۆستا خەلیل كەریم "گۆغەلانی"

پێشەكی بۆنووسینی

د. عبد اللطیف أحمد مصطفى

د. ئەحمەدی شافیعی

نارین




| | |
|---|---|
| نـــــــاوی کتێـــــــب | (عُمْدَةُ الأحْكام منْ كلام خيْر الأنام) به کوردی |
| نووســـــــــــــــینی | عبدالغني المقدسي |
| وەرگێڕانـــــــــــــــی | زانا فاروق حمه ڕەشید |
| پێداچـــــــــوونەوە | ئاکۆ جلیل کریم ((گۆخڵانی)) |
| پێشەکی بۆ نووسینی | د. عبداللطيف أحمد مصطفى- د. ئەحمەدی شافیعی |
| نەخشەسازی ناوەوە | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| نـۆرەو ســاڵی چــاپ | یەکەم ٢٠١٢ز |
| ژمـــارەی ســـپاردن | (١٧٦٩)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە. |

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
nareenpub@gmail.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# ( عُمْدَةُ الأحْكام منْ كلام خيْر الأنـام )

## به كوردی

دانراوی زانـای پـایه بەرز

عبدالغني المقدسي

٥٤١ – ٦٠٠ كۆچی

## وەرگێڕانی

زانا فاروق حمه ڕەشید

## پێداچوونەوەی

ئاكۆ جلیل كریم ((گۆخڵانی))

## پێشەكی بۆنووسینی

د. عبداللطیف أحمد مصطفی

د. ئەحمەدی شافیعی

نارین

# پێشەکی : د.عبداللطيف أحمد مصطفى

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصَّلاة والسلام على رسولُ الله صلَّى الله عليه و آله وسلم.

پێغەمبەری خوا صلَّى الله عليه و آله وسلم فەرمویەتی: ((منْ يُردِ اللهُ بِهِ خيراً يُفَقِهـهُ في الدّين)) واتە: ((هەرکەسێك کەخوای گەورە خێری بۆ ویستبێ ئەوە لەدین شارەزای دەکات))، وە دینیش بریتیە لەقورئان و سوننەت کە سەرچاوەی گشت حوکمە شەرعیەکانن، جاهەر موسڵمانێك لەم دوو سەرچاوەیە بگات ئەوە إن شاءالله خوا خێری بۆ ویستووە، وەهەر کەسێك لەم دوو سەرچاوەیە بگات و کاریان پێ بکات ئەوە هیدایەت دراوە و لەگومڕایی پارێزراوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی کەزۆربەی موسڵمانانی کورد بەتەواوی لەزمانی عەرەبی شارەزا نین ئەوە پێویستە کەکەسانی شارەزا بەزمانی عەرەبی و بەشەریعەت هەڵسن بەوەرگێڕانی فەرمودەکانی پێغەمبەر صلَّى الله عليه وآله وسلم بۆ زمانی کوردی، وەبرای بەڕێزیشمان کاك زانا هەڵساوە بەوەرگێڕانی کتێبی ﴿عمدة الأحكام﴾ بۆسەر زمانی کوردی بەهاوکاری مامۆستا ئاکۆ خوا پاداشتیان بداتەوە و بەرەکەت بخاتە کارەکەیانەوە، وەهەرچەندە کەمن پێیدا نەچوومەتەوە بەڵام گومانی باشم هەیە بەکارەکەیان، خوا پاداشتیان بداتەوە و موسڵمانانیش سوودی لێ ببینن.

والحمد لله والصَّلاة والسلام على رسولُ الله صلَّى الله عليه و آله وسلم.

د. عبداللطيف أحمد مصطفى

## پێشەكی : د.ئەحمەدی شافیعی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رَّب العالمين، والصَّلاة والسلام على أشرف المرسلين، وعلى آله وأصحابه، ومن اتبعهم باحسان إلى يوم الدين.

لەم قۆناغە ناسك و هەستیارەی ئێستادا هەنگاوێكی گرنگ و پڕ بایەخ ئەبێت گەر بتوانین خشتێكی تری تازە بخەینە سەر دیواری خانوی خزمەت بەقورئانی پیرۆزو فەرموودە شیرینەكانی پێغەمبەر ﷺ

چونكە لەم سەردەمی جەنجاڵی و نەمانی ماناو واتای ڕاستەقینە بۆ ووشەو دەقەكان و پەیدابونی چەندین بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیای جیاجیا و فەرامۆش كردنی تێڕامان لەقورئانو دوربون لەسایەی فەرمودەكانەوە ئادەمیزادەكان توشی پەشۆكاویو شڵەژان و دەستە دەستەیی و جیاخوازی واهاتوون نەڕۆحیان ئاسودەو نەجەستەی ماندو شەكەتیان ئیسراحەت.

بۆیە گەر بمانەوێت جارێكی تر ڕۆح و لاشەمان ئاسودە بێت و بەختەوەر بین و ئامانجەكانمان بێنە دی و سەركەوتوبین ئەبێت بگەڕێینەوە بۆهەمان ڕێبازو میتۆد كەهاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری ﷺ لەسەر پەروەردە بون.. ((لن يصلح أخر هذه الأمة إلاَّ بما صلح به أولها)).

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی ((تَركْتُ فيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُما كِتابَ الله وسُنَّتي وَلَنْ يَتَفَرَّقا حَتَّى يَرِدا عَلَى الحَوْضَ)).

ئەم كتێبەی بەردەستی ئێوەی خوێنەری بەڕێز بەناوی (عمدة الأحكام) لە نووسینی زانای گەورەو پێشەوا (عبدالغني المقدسي) یە كەلە ساڵی (٦٠٠ ی كۆچی)

وەفاتی کردووە، وەلەلایەن برای زۆر بەڕێزو خۆشەویست کاکە (زانا فاروق حمه رشید) وەرگێردراوەتە سەر زمانی ڕەسەنی کوردی.

کتێبێکی زۆر باش و بەسودە، جێگەی بایەخ و گرنگی پێدانە، بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە وەرگێڕاوە، بەویستی خوای گەورە کەلێنێکی باش لەکتێبخانەی کوردی پڕ ئەکاتەوە، موسڵمانانی کوردستانیش لێی بەهرەمەند ئەبن، نوسەر توانیویەتی لەدوو توێی ئەم کتێبەدا گشت بابەتە فیقهی یەکان کۆبکاتەوە و ڕێکیان بخات بەشێوەیەکی جوان و گونجاو لەڕوانگەی فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەری ﷺ ئازیزمان.

بۆیە جارێکی تر دوعای سەرکەوتن و بەردەوامی بۆ مامۆستا زانا فاروق لەخوای گەورە داوا ئەکەم و هیوادارم هەمیشە خامەی وا ڕەنگین و جوان و بەهێزو بەپێزبێت بۆخزمەت بە ئایین و نەتەوە و گەلەکەی.

هەرشادو سەرکەوتووبن

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

دوعا گۆتان : أحمد شافعي

٦ – شوال – ١٤٣٣ هـ

# پێشەكی وەرگێڕ

إن الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَ نَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذ باللهِ مِن شُرُوْرِ أنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَات أعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ... وَأشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلاّالله وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ... وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[1]

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾[2]

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾[3]

أمَّا بَعْدُ: فَإنَّ أصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ الله وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ.

وبعد: پێویستە هەمولایەکمان سوپاسی خودای بالاّ دەست بکەین وە پاشان شانازی بکەین بەو مامۆستا بەڕێزانەوەی کە کۆشش دەکەن بۆ وەرگێڕانی پەرتووکە شەرعێکان بۆ سەر زمانی کوردی و بلاّوکردنەوەی لەنێو خەڵکی کوردستاندا بۆیە منیش پێم خۆش بوو لەو کاروانەدا بەژداری بکەم سوپاس بۆ خوا خوای بالاّ دەست یارمەتی دام هەستام بە وەرگێڕانی پەرتووکی ((عمدة الأحكام)) جا خوێنەری بەڕێز

---

١ آل عمران: ١٠٢

٢ النساء: ١

٣ الأحزاب: ٧٠ – ٧١

هەموو فەرموودەكانی ئەم پەرتووكە دانەری شێخ "عبدالغني المقدسي" (رحمه الله تعالى) وە هەموو فەرموودەكان پێك هاتووە لەو فەرموودانەی كە هەردوو پێشەوا ((البخاری و مسلم)) (رحمة الله تعالى عليهما) گێڕاویانەتەوە منیش بەیارمەتی خوداو پاشان بەیارمەتی چەند مامۆستایەكی بەڕێز لەوانە مامۆستا " ئاكۆ گۆخڵانی " خوای گەورە پاداشتی باتەوە، وە هەردوو مامۆستای خۆشەویستم ﴿ دكتۆر عبداللطيف أحمد مصطفی و دكتۆر ئەحمەدی شافیعی ﴾ سوپاسیان دەكەم كەهەستان بە پێشەكی بۆنووسینی ئەم پەرتووكە بەسوودە خوای گەورە تەمەنیان درێژ بكات بۆخزمەتكردنی ئیسلام و موسڵمانان، وەمنیش هەستام بە وەرگێڕانی ئەم كتێبە سوپاسی خوای گەورە دەكەم كە یارمەتی دام بۆ تەواو كردنی جا بەهیوای ڕەزامەندی خوداو مایەی سوودی بۆ خوێنەرانی بەڕێز وە لە كۆتایدا داواكارم لە خوای گەورە لە هەڵەو كەموو كورتیەكانم ببورێت و بیكاتە توێشویەك بۆ دواڕۆژم.

براتان

زانا فاروق حمه ڕەشید

سلێمانی - كوردستان

# پێشەكی دانەر

بسم الله الرحمن الرحيم

قال الشيخ الحافظ، تقي الدين، أبو محمد عبد الغني بن عبد الواحد بن علي بن سرور المقدسي – رحمه الله تعالى –:

الحمد لله الملك الجبار، الواحد القهار. وأشهد أن لاإله إلاالله وحده لاشريك له، رب السموات والأرض ومابينهما العزيز الغفار، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله المصطفى المختار. صلى الله عليه وعلى آله وصحبه الأطهاروالأخيار.

هەندێك لەبرایانم داوای كورتكردنەوەی بەشێك لە فەرموودەكانی ئەحكامیان لێكردم، لەوانەی كەیەك دەنگن لەسەری هەردووپێشەوا (أبوعبدالله محمد بن إسماعيل بن إبراهيم البخاری لەگەڵ مسلم بن الحجاج بن مسلم القشيری النيسابوری) منیش وەڵامم دانەوە بەهیوای سوودلێببینین. جاداواكارم لەخودا بیكاتەمایەی سوودبۆمان‌و ئەو كەسەشی كە دەینوسێتەوە وە ئەوەی كەگوێی لێدەگرێ وە ئەوەی كە دەیخوێنێتەوەو ئەوەی كە لەبەری دەكات وە ئەوەی كەسەیری دەكات وەتەنیا لەبەرخاتری خودابێت بۆبەدەست هێنانی سەركەوتن لەلای خودا لە بەهەشتی پڕ لە خۆشی وە هەر خودابەسە بۆ ئێمە وە باشترین پەنایە.

# كتابُ الطَّهارَةِ - پەرتووکی پاکوخاوێنی

١ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ صلّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((إِنَّمَا الأعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْه)) [1].

واته:عومەری کوری خەطاب (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: هەمووکاروکردەوەیەك بەپێی نیازونییەتەکانە وەبۆهەمووکەسێك هەیە پاداشت بەگوێرەی نیازوخواستەکەی ((جا ئەگەرنیازی باش بێت ئەوەپاداشتی باشە ئەگەرنیازی خراپ بێت ئەوابەپێچەوانەوە – وەرگێڕ)) جاهەرکەسێك کۆچبکات لەشاری بێ باوەڕی وخراپەوە لەبەر ڕەزامەندی خواو بۆ لای پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەواکۆچەکەی بۆخوایەو خواپاداشتی دەداتەوە بەڵام هەرکەسێك کۆچەکەی بۆبەدەست هێنانی دونیابێت یان لەبەرخاتری ئافرەتێك بێت کە مارەی بکات ئەوا کۆچەکەی بۆ ئەوەیە لەپێناویدا کۆچی بۆکردووە.

٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ صلّى الله عليه وسلم: ((لا يَقْبَلُ اللّهُ صَلاةَ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ)) [2]

واته:أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی خوای گەورە نوێژی هیچ کەسێك لە ئێوەقبوڵ ناکات کاتێك بێدەست نوێژبوو تادەست نوێژ دەگرێتەوە.

---

[1] البخاری (١) ومسلم (١٩٠٧).

[2] البخاری (١٣٥) (٦٩٥٤).

٣ – عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ وَأَبِي هُرَيْرَةَ وَعَائِشَةَ رضي الله عنهم قَالُوا: قَالَ رَسُولُ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((وَيْلٌ لِلأعْقَابِ مِنَ النَّارِ)) [1]

واته:عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص وە ئەبو هورەیرەو دایکمان عائیشە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموون پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (( ئاگری دۆزەخ بۆئەوپاژنانەی کەتەڕنابن)).

تێبینی وەرگێڕ: پێویستە کەسی نوێژخوێن کاتێك دەست نوێژدەگرێت هەموو ئەندامەکانی بەباشی بشۆرێت لەبەرئەوهەڕەشەتوندەی لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە چونکە هۆکاری ئەم فەرموودەیە ئەوەبووهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لە یەکێك لە سەفەرەکاندا خەریك بوو نوێژی عەسریان بچێ بۆیە بە پەلە دەست نوێژیان گرت پاژنەیان تەڕنەکرد بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ئەمەی دی ئاگاداری کردنەوە لە سزاکەی.

٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ مَاءً، ثُمَّ لِيَسْتَنْثِرْ، وَمَنْ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهُمَا فِي الإِنَاءِ ثَلاثاً، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ)) [2]

وفي لفظ لمسلم ((فَلْيَسْتَنْشِقْ بِمَنْخِرَيْهِ مِنَ الماءِ)) [3]

وفي لفظ ((من توضأ فليستنشق)) [4]

---

١ البخارى (٦٠) و(٩٦) و( ١٦٣) ومسلم (٢٤١)

٢ البخارى (٢١٦٢)

٣ مسلم ( ٢٢ / ٢٣٧) .

٤ البخاري ( ١٦٢) ومسلم ( ٢٧٨) .

واتـه: ئـهبو هـورهيره (رِهزاى خـواى ليْبـىٚ) دهلّـىٚ پيْغهمبـهر(ﷺ)فـهرمووى كاتيْـك يـهكيْك لهئيْوهدهسـت نويْـژى گـرت بائاولـهلوتى وهرداپاشـان فـن بكـات (دهريبكـات)، وههەركەسيْك لهئيْوهتاراتى بهبهرد گرت باتاك بيْت، وههەركەسيْك لهئيْوه لهخهوهەستا باهەردوودهستى سىٚ جار بشوا پيْش ئهوهى بيانكاته ناوجامى ئاوهكهوه چونكه يهكيْك لهئيْوه نازانيْت شهودهستى چۆن داناوهو بهرچيش كهوتووه.

وهلهدهربرِينيْكى موسليمدا ((با ئاو لههەردوو كونه لوتى وهربدات)).

وهلهدهربرِينيْكى تردا ((ههركهسيْك دهستنويْژى شۆرد با ئاو لهلوتى وهربدات)).

٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه -: أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الّذِي لا يَجْرِي، ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ))[١] وَلِمُسْلِمٍ: ((لا يَغْتَسِلْ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ وَهُوَ جُنُبٌ))[٢].

واتـه: ئـهبوهورهيره (رِهزاى خـواى لـيْبىٚ) دهلّـىٚ: كـه پيْغهمبـهر(ﷺ) فـهرمووى ((بايـهكيْك لـه ئيْـوه ميزنـهكات لـه ئـاويْكى راوهسـتاودا كـه رِيْناكـا پاشـان خـۆى لـىٚ بـشوا)):وهلـهدهربرِينيْكى موسـليمدا((بايـهكيْك لـه ئيْـوه خـۆى نهشـوا لـه ئـاويْكى رِاوهستاودا كه لهش گران بيْت)).

٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه -، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِذَا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعاً))[٣].

وَلِمُسْلِمٍ: ((أُولاهُنَّ بِالتُّرَابِ)).

وَلَهُ فِي حَدِيثِ عَبْدِ اللّهِ بْنِ مُغَفّلٍ: أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الإِنَاءِ فَاغْسِلُوهُ سَبْعاً وَعَفِّرُوهُ الثَّامِنَةَ بِالتُّرَابِ))[٤].

---

١ البخاري ( ٢٣٩) مسلم ( ٢٨٢).

٢ مسلم ( ٢٨٣).

٣ البخاري (١٧٢) مسلم (٩٠/٢٧٩)

٤ مسلم (٢٨٠)

واتــه: ئــهبوهورهيره (ڕهزاى خــواى لــێبێ) دهڵــێ: كــه پێغهمبــهر(ﷺ) فــهرمووى ((ئهگهر سهگێك ئاوى خواردهوه له جامى يهكێك له ئێوه بـا حـهوتجار بيـشوا)). وهلـه دهربڕينێكى موسليمدا:((يهكهم جار به خۆڵ)).

وههەر له دهربڕينێكى موسليمدا له فهرموودهى عهبدوڵلاّ ى كوڕى موغهفهلـهوه كـه پێغهمبهر(ﷺ) فهرمووى ((ئهگهر سهگێك جامى يهكێك له ئێوهى لێسايهوه ئهوا حهوت جار بيشۆن وه ههشتهم جار به خۆڵ)).

تێبينى وهرگێڕ:پێويسته كاتێك سهگ دهمى خسته ناوجامێـك يـان شـتێكى ئێمـهوه كه تايبهتى خۆمان بێت و بهكارى بێنين بۆخواردن و خواردنـهوه حـهوت جـار بيـشۆين وه ئهبێ يهكێك لهو حـهوت جـاره بـه خـۆڵ بێـت وه وتـهى بـههێز لاى زانايـان ئهوهيـه بهخۆڵ شۆردنهكه جارى يهكهم بێت چونكه دهركهوتوه خۆڵ نـهبێت هـيچ ماددهيـهكى تر ئهو ميكرۆبهى بۆ لانابرێ.

٧ – عَـنْ حُمْـرَانَ مَـوْلَى عُثْمَـانَ بْـنِ عَفّـانَ رضـي اللهُ عنهمـا: ((أَنَّـهُ رَأَى عُثْمَـانَ دَعَـا بِوَضُوءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ مِنْ إِنَائِهِ، فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَـهُ فِـي الْوَضُـوءِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثـاً، وَيَدَيْـهِ إِلَـى الْمِـرْفَقَيْنِ ثَلَاثـا، ثُـمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ كِلْتَا رِجْلَيْـهِ ثَلَاثـا، ثُـمَّ قَـالَ: رَأَيْـتُ النَّبِـيَّ صـلَّى الله عليـه وسـلم تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، وَقَـالَ: ((مَـنْ تَوَضَّـأَ نَحْـوَ وُضُـوئِي هَـذَا، ثُـمَّ صَـلَّى رَكْعَتَـيْنِ، لا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غَفَرَ لَلّهُ له مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).[١]

واته: له حومرانهوه (ڕهزاى خواى لـێبێ)كـه خزمـهتكارى عوسمـانى كـوڕى عهفانـه (ڕهزاى خــواى لــێبێ) ((كــه عوسمــانى (ڕهزاى خــواى لــێبێ) بينــوه داواى ئــاوى دهستنوێژى كرد، وه كردى بهسهرههردوو دهستيدا له جامهكهى هـهردوو دهسـتى سـێ

---

١ البخاري (١٦٤) مسلم (٢٢٦)

جار شۆرد پاشان دەستی ڕاستی کردە ناو ئاوەکە پاشان ئاوی لە دەم ولوتی وەردا وە دەریکرد پاشان دەموو چاوی سێ جار شۆرد وە هەردوو دەستی هەتا ئەنیشکی سێ جار پاشان مەسحی سەریشی کرد پاشان هەردوو قاچی سێ جار شۆرد پاشان فەرمووی: پێغەمبەرم دی (ﷺ) دەستنوێژی گرت وێنەی ئائەم دەستنوێژەی من وە فەرمووی ((هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێت وەك ئەم دەستنوێژەی من پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات وە قسە لەگەڵ نەفسی خۆیدا نەکات تێیدا خوای گەورە لە تاوانی ڕابردووی خۆش دەبێت)).

تێبینی وەرگێڕ: قسە لە گەڵ نەفسی خۆیدا نەکا واتە داڵغەی بۆئەملاولا نەڕوات وە دەبێتە هۆکاری سڕینەوەی تاوانە بچووکەکان نەك تاوانە گەورەکان.

٨ – عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ((شَهِدْتُ عَمْرَو بْنَ أَبِي الحَسَنِ سَأَلَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم؟ فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ، فَتَوَضَّأَ لَهُمْ وُضُوءَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَأَكْفَأَ عَلَى يَدَيْهِ مِنْ التَّوْرِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلاثاً، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي التَّوْرِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاثاً بِثَلاثِ غَرْفَاتٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي التَّوْرِ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثاً، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَيهِ، فَغَسَلَهُمَا مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ، فَمَسَحَ بهما رَأْسَهُ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ مَرَّةً وَاحِدَةً، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ))[1].

واتە: لە عەمری کوڕی یەحیای مازنیەوە ئەویش لە باوکیەوە کە دەڵێ: ((عەمری کوڕی باوکی حەسەنم دی پرسیاری کرد لە عەبدوڵلای کوڕی زەید دەربارەی دەستنوێژی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش داوای جامێکی ئاوی کرد وێنەی تەشت دەستنوێژی بۆ گرتن وەك دەستنوێژی پێغەمبەر (ﷺ) کردی بەسەر هەردوو دەستیا لە ئاوی جامەکە هەردوو دەستی سێ جار شۆرد پاشان دەستی کردەوە ناو جامەکە ئاوی لە دەم ولوتی وەردا وە دەریکرد سێ جار بە سێ مشت پاشان دەستی کردەوە

١ البخاري (١٨٥) مسلم (٢٣٥)

ناو جامەكە دەمووچاوى سىٚ جار شۆرد پاشان دەستەكانى تێكرد وە هەردووكى دووجار شۆرد هەتا ئەنیشكى پاشان دەستى تێكرد مەسحى سەریشى پێكردن لە پێشەوە بردنى بۆ دواوە یەك جار پاشان هەردوو قاچى شۆرد)).

وَفِي رِوَايَةٍ: ((بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ)). وَفِي رِوَايَةٍ ((أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم فَأَخْرَجْنَا لَهُ مَاءً فِي تَوْرٍ مِنْ صُفْرٍ)). التَّوْرُ: شِبْهُ الطِّسْتِ.

وە لە دەربڕینێكى تردا((دەستى پێكرد بە پێشى سەرى هەتا پشتى سەرى پاشان دەستەكانى گێڕایەوە هەتا ئەو جێگایەى كەلێیەوە دەستى پێكردبوو)).

وە لە دەربڕینێكى تردا((دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لامان ئێمەش لە جامێكدا ئاومان بۆ هێنا كە لە مس درووست كرابوو)).

التَّوْرُ: شبه الطَّسْتِ: واتە تەور جامێكە وێنەى تەشتە.

ئەم دوو ڕیوایەتەى دوایى هەردوو پێشەوا بوخارى و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

٩ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ، وَتَرَجُّلِهِ، وَطُهُورِهِ، وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ)) [١].

واتە: دایكمان عائیشە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ((پێى خۆش بوو لاى ڕاست بەكاربهێنێ لە نەعل لە پێكردنیدا وە لە قژ شانە كردنیدا وە لە خۆ پاككردنەوەیدا وە لە هەموو كارەكانیدا)).

١٠ – عَنْ نُعَيْمٍ الْمُجْمِرِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم أَنَّهُ قَالَ: ((إنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ)). فَمَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ. [٢]

---

١ البخاري (١٦٨) (٥٨٥٤) مسلم (٢٦٨/٦٧)

٢ البخاري (١٣٦) مسلم (٢٤٦) و (٢٥٠)

واتـه: لـه نوعـهیمی مـوجمیرەوه ئـهویش لـه ئـهبوهورەیرەوه (ڕەزای خـوای لـێبیٚ) ئـهویش لـه پێغهمبـهرەوه (ﷺ) کـه فهرموویـهتی ((بێگومـان ئومهتهکـهی مـن بـانگ دەکـرێن لـه ڕۆژی دواییـدا بـه ناوچـهوانی درەوشـاوه و دەسـتوپیٚ سـپی یـهوه لـه شـوێنهواری دەسـتنوێژدا)). جاهەرکەسـێك لـهئێوه ئـهتوانیٚ بـا درەوشـاوەیەتێکەی ((سپیەتیەکەی)) زیاد بکات.

وَفِـي لَفْـظٍ آخـر : ((رَأَيْـتُ أَبَـا هُرَيْـرَةَ يَتَوَضَّـأُ، فَغَسَلَ وَجْهَـهُ وَيَدَيْـهِ حَتَّـى كَـادَ يَبْلُـغُ الْمَنْكِبَيْنِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ حَتَّى رَفَعَ إِلَى السَّاقَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَـهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ غُـرًّا مُحَجَّلِينَ مِـنْ آثَـارِ الْوُضُـوءِ)) فَمَـنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ وَتَحْجِيلَهُ فَلْيَفْعَلْ[1] .

واته: له دەربڕینێکی تردا هـهر لـه نوعـهیمی مـوجمیرەوه (ڕەزای خـوای لـێبیٚ) کـه دەڵێ: ئـهبو هـورەیرەم دی (ڕەزای خـوای لـێبیٚ) دەسـتنوێژی دەگـرت، دەمووچـاوی شۆرد لەگەڵ هەردوو دەستی هەتا نزیك بوو ئـاو بگاتـه هـهردوو شـانی پاشـان هـهردوو قاچی شۆرد لەگەڵ هەردوو قوله پێیکانیدا پاشان وتی گوێم له پێغهمبەری خـوا بـووه (ﷺ)دەیفـهرموو ((بێگومـان ئومهتهکـهی مـن بـانگ دەکـرێن لـه ڕۆژی دواییـدا بـه ناوچـهوانی درەوشـاوه و دەسـتوپیٚ سـپی یـهوه لـه شـوێنهواری دەسـتنوێژدا)). جاهەرکەسێك لەئێوه ئەتوانیٚ با درەوشاوەیەتێکەیو سپێتێکەی دەستوپێی زیاد بکات ئەوا با بیکات.

وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ: سَمِعْتُ خَلِيلِـي صلَّى الله عليـه وسـلم يَقُـولُ: ((تَبْلُـغُ الْحِلْيَـةُ مِـنْ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوُضُوءُ)) [2] .

---

١ مسلم (٣٥/ ٢٤٦)

٢ مسلم (٢٥٠)

واته: وه له دەربڕینێکی تردا ئەبوهورەیره (ڕەزای خوی لێبێ) دەڵێ: گوێم له خۆشەویستم بوو(ﷺ) دەیفەرموو: ((خشڵوجوانیەتی له ئیماندارا ئەگاته ئەو شوێنەی که دەستنوێژی دەگاتێ)).

تێبینی وەرگێڕ: ئەم جوانییه له بەهەشتدایه خوا بیکات به نسیبمان بەڵام هەر له دونیادا مرۆڤی نوێژخوێن و دەست به دەستنوێژ له هەموو کەس جوانتره.

## بابُ دخولِ الخلاءِ والاستطابة- بەشى چوونە سەرئاوو خۆخاوێن كردنەوە

١١ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه –: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلم كَانَ إذَا دَخَلَ الْخَلاءَ قَالَ: ((اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ)) [1].

واتە:لە ئەنەسى كوڕى مالیكەوە (ڕزاى خواى لێبێ) كە پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە سیفەتى وابوو كاتێ بیویستایە بچێتە سەرئاو دەیفەرموو ((خوایە پەنائەگرم بە تۆ لە هەموو شەیتانێكى نێرومێ)).

الخبث: بضم الخاء و الباء ـ جمع (خبيث) ـ (والخبائث) جمع خبيثة.

إستعاذ من ذكران الشياطين و إناثهم.

١٢ – عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلّى الله عليه وسلم : ((إذَا أَتَيْتُمْ الْغَائِطَ، فَلا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ وَلا بَوْلٍ، وَلا تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا)). قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: " فَقَدِمْنَا الشَّامَ، فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ نَحْوَ الْكَعْبَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْهَا، وَنَسْتَغْفِرُ اللَّه عَزَّ وَجَلَّ " [2].

واتە:لە ئەبوئەیوبى ئەنصارییەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى ((ئەگەر چوونە سەرئاو بۆ میزوو پیساوى ڕوو مەكەنە ڕووگەو پشتیشى تێمەكەن بەڵكو ڕوویكەنە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا ئەبوئەیوب (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: چووین بۆ شام سەیر دەكەین سەرئاوەكان ڕووەو ڕووگە دروست كراون ڕوومان وەردەگێڕاو داواى لێخۆشبوونمان لە خواى گەورە دەكرد)).

---

١ البخاري (١٤٢) و (٦٣٢٢) مسلم (٣٧٥)

٢ البخاري (٣٩٤) مسلم (٢٦٤)

١٣ – عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطّابِ رضي الله عنهما قَالَ: ((رَقِيْتُ يَوْماً عَلَى بَيْتِ حَفْصَةَ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم يَقْضِي حَاجَتَهُ مُسْتَقْبِلَ الشَّام، مُسْتَدْبِرَ الْكَعْبَةَ)) [1].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطابەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((ڕۆژێکیان سەرکەوتمه سەر ماڵی حەفصه بینیم پێغەمبەر(ﷺ) تاراتی دەگرت ڕووی له شام بوو پشتی له قیبله بوو)).

تێبینی وەرگێڕ: تاراتگرتن ڕووەو قیبله یان پشت له قیبله له شوێنێکدا که چوار دەوری گیرابێ درووسته بەڵام له شوێنێکی چۆڵدا دروست نییه ئەبێ ڕوو له خۆرهەڵات بکات یان خۆرئاوا.

١٤ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – أَنَّهُ قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم يَدْخُلُ الْخَلاءَ، فَأَحْمِلُ أَنَا وَغُلامٌ نَحْوِي إدَاوَةً مِنْ مَاءٍ وَعَنَزَةً، فَيَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ)) [2].

العَنَزَةُ: الحَرْبَةُ الصغيرَةُ.

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوه (ڕەزای خوای لێبێ) که دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) که دەچووه سەرئاو من و گەنجێکی وەك من جامێك ئاوو نەقیزەیەکمان بۆ هەڵدەگرت، تاراتی بەئاو دە گرت.

العَنَزَةَ: بریتیه له کێردێکی یان ڕمێکی بچکۆله.

تێبینی وەرگێڕ:ئەو نەقیزەیەی بۆ ئەوه بوو شتێك یان عەباکەی خۆی ئەیا بەسەریا بۆ ئەوەی خەڵك نەیبینێ.

---

١ البخاري (١٤٨) مسلم (٦٢/ ٢٦٦)

٢ البخاري (١٥٢) مسلم (٢٧١)

١٥ – عَنْ أَبِي قتا دة الْحَارِثِ بْنِ ربعي الأنْصَارِيِّ – رضي الله عنه –: أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا يُمْسِكَنَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وَهُوَ يَبُولُ وَلا يَتَمَسَّحْ مِنْ الْخَلاءِ بِيَمِينِهِ وَلا يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ)) [1].

واته : له ئەبو قەتادەی حارسەوە كە كوڕی ربعی ئەنصارییە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((باكەس لە ئێوە زەكەری بە دەستی ڕاستی نەگرێ لە كاتێكدا كە میز دەكا وە لەسەرئاویش تارات بە دەستی ڕاستی نەگرێ وە هەروەها فوو نەكات لە دەفرو جامی خواردن و خواردنەوە)).

١٦ – عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم بِقَبْرَيْنِ، فَقَالَ: ((إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ أَمَّا أَحَدُهُمَا: فَكَانَ لا يَسْتَتِرُ مِنْ الْبَوْلِ، وَأَمَّا الآخَرُ: فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ فَأَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً، فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ، فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: لَعَلَّهُ يُخَفِّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا)) [2].

واته: له عەبدوڵلای كوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) تێپەڕی بەلای دوو گۆڕداو فەرمووی ((ئەم دووانە سزا دەدرێن وە لەسەر تاوانی گەورە سزا نادرێن بەڵكو یەكێكیان خۆی نەدەپاراست لە میز وە ئەوی تریان خەریكی دووزمانی كردن بوو لقێك دارخورمای تەڕی هەڵگرت وە كردی بە دوو لەتەوە وە لەسەر هەر یەكێك لەو دوو گۆڕە دانەیەكیانی چەقاند ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی واتكرد؟ فەرمووی بەڵكو سزاو ئەشكەنجەیان لە سەر ئاسان بكرێت هەتا وشك دەبن)).

---

١ البخاري (١٥٤) مسلم (٢٦٧)

٢ البخاري (٢١٨) مسلم (٢٩٢)

## بابُ السواكِ- بەشى سيواككردن

١٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ)) [١].

واتــه: لــه ئــەبوهورەيرەوە (ڕەزای خــوای لــێبێ) ئــەويش لــه پێغەمبــەرەوە (ﷺ)فەرموويەتى ((ئەگەر گران و ناڕەحەت نەبوايە لـە سـەر ئەمەتەكـەم ئـەوا فـەرمانم پێئه كردن به سيواككردن له گەڵ هەموو نوێژێكدا)).

١٨ – عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ رضي الله عنهما قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ الله صلَّى الله عليه وسلم إذَا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ)) [٢].

واته: له حوزەيفەی كوڕی يەمانەوە (ڕەزای خوايان لێبێ) دەڵێ::((پێغەمبەری خـوا (ﷺ) هەميشه سيفەتی وابـوو كاتێك هەڵدەسا بۆ شـەو نوێـژ دەمـی بـه سـيواك پـاك دەكردەوە)).

١٩ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((دَخَلَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ – رضي الله عنهما – عَلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم وَأَنَا مُسْنِدَتُهُ إلَى صَدْرِي، وَمَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ سِوَاكٌ رَطْبٌ يَسْتَنُّ بِهِ فَأَبَدَّهُ رَسُولُ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم بَصَرَهُ. فَأَخَذْتُ السِّوَاكَ فَقَضِمْتُهُ، و طَيَّبْتُهُ، ثُمَّ دَفَعْتُهُ إلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَاسْتَنَّ بِهِ فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم اسْتَنَّ اسْتِنَانًا أَحْسَنَ مِنْهُ، فَمَا عَدَا أَنْ فَرَغَ رَسُولُ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم : رَفَعَ يَدَهُ – أَوْ إصْبَعَهُ – ثُمَّ قَالَ: فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى – ثَلاثاً – ثُمَّ قَضَى. وَكَانَتْ تَقُولُ: مَاتَ بَيْنَ حَاقِنَتِي وَذَاقِنَتِي)) [٣].

هَذَا لَفْظُ الْبُخَارِيِّ وَلِمُسْلِمٍ نَحْوُهُ.

---

١ البخاري (٨٨٧) مسلم (٢٥٢)

٢ البخارى (٨٩٩)(١١٣٦) مسلم(٢٥٥)

٣ البخاري (٨٩٠)(٤٤٣٨)

واته: عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری صدیق (ڕەزای خوایان لێبێ) هاتە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاڵی دابوەوە بە سنگی منەوەو عەبدولڕەحمان (ڕەزای خوای لێبێ) سیواکێکی تەڕی پێبوو سیواکی پێئەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی تێبڕیبوو سەیری سیواکەکەی کرد، سیواکەکەم لێ وەرگرت بۆم نەرم کردەوەو بۆم پاککردەوە پاشان دام بە پێغەمبەر (ﷺ) سیواکی پێکرد نەمدیبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیواك بکات سیواکێك لەوە جوانتر، هەر کە سیواکەکەی تەواو کرد دەستی بەرزکردەوە یاخود پەنجەی پاشان سێ جار فەرمووی خوایە بمگەینە بە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ لەگەڵ پیاو چاکان پاشان وەفاتی کرد. وە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەیوت وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ)لە نێوان سنگو قوڕگی مندا.

وَفِي لَفْظٍ ((فَرَأَيْتُهُ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَعَرَفْتُ: أَنَّهُ يُحِبُّ السِّوَاكَ فَقُلْتُ: آخُذُهُ لَكَ؟ فَأَشَارَ بِرَأْسِهِ: أَنْ نَعَمْ)) [١].

واتە: لە دەربڕینێکی تردا عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((دیم سەیری سیواکەکەی دەکرد، وە زانیم: کە حەزی لە سیواکە پێموت بۆت وەرگرم؟ ئیشارەتی کرد بەسەری: بەڵێ)).

٢٠- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ - رضي الله عنه - قَالَ: ((أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم وَهُوَ يَسْتَاكُ بِسِوَاكٍ رَطْبٍ، قَالَ: وَطَرَفُ السِّوَاكِ عَلَى لِسَانِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: أُعْ، أُعْ، وَالسِّوَاكُ فِي فِيهِ، كَأَنَّهُ يَتَهَوَّعُ)) [٢].

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((هاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وە ئەو سیواکی دەکرد بە سیواکێکی تەڕ، دەڵێ: لایەکی سیواکەکە لەسەر زمانی بوو، وە دەیفەرموو: ئوع، ئوع، وە سیواکەکە لە دەمیدا بوو، هەر ئەووت دەڕشێتەوە)).

١ البخاري (٤٤٤٩)

٢ البخاري (٢٤٤) مسلم (٢٥٤).

## بابُ المسحِ على الخفينِ- بەشی مەسح كردن لەسەر خوفەكان

واتای خوف: بریتییە لە لە پێكردنی جوتێك خوف ((گۆرەوی)) كە هەتا قاپە ڕەقەی پێ داپۆشێ جا دروست كرابێت لە پێست یان لە خوری یان لە لۆكە یان لە تووك، وە مەرجە خوفەكە خودی خۆیشی پاك بێت و لەسەر پاكی لەپێ بكرێت واتە دەستنوێژی هەبێت وە ماوەكەی بۆ مسافر سێ شەو سێ ڕۆژە وە بۆ كەسی نیشتەجێ یەك شەو یەك ڕۆژە وە كاتەكەی دەست پێدەكات لەو كاتەوەی كەبێ دەستنوێژی بەسەرداهاتووەو دەستنوێژێكی تازە دەگرێتەوە و خوفەكانیشی هەر لە پێداماوە – وەرگێڕ.

٢١ – عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فِي سَفَرٍ، فَأَهْوَيْتُ لأنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ، فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا)) [1].

واتە: لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((من لەگەڵ پێغەمبەرا بووم (ﷺ)لە سەفەرێكدا، دەستنوێژی گرت منیش دانەویمەوە خوفەكانی داكەنم : فەرمووی، وازیان لێبێنە چونكە من بە پاكی لەپێم كردوون وە مەسحی كرد بە سەریاندا)).

٢٢ – عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ رضيَ اللهُ عنهما قَالَ: ((كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فِي سَفَرٍ فَبَالَ، وَتَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ)) [2].

واتە: لە حوزەیفەی كوڕی یەمانەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((من لەگەڵ پێغەمبەرا بووم (ﷺ)لە سەفەرێكدا، میزی كرد وە دەستنوێژی گرت وە مەسحی كرد بەسەر خوفەكانیدا)).

---

١ البخاري (٢٠٦) مسلم (٧٩/ ٢٧٤)

٢ البخاري (٢٠٣) مسلم (٢٧٣)

## بابٌ في المذيِ وغيرِهِ- بەشی مەزیو ئەوشتانەی دەستنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

ئەو माددانەی کە لە پێشی مرۆڤەوە دەردەچێت چوار جۆرن:

یەکەم: ((میز)) کەپیسە بە کۆی دەنگی زانایان.

دووەم: ((الوَدي – پاش میز)) ئاوێکە دەردەچێت لە پاش میز بەزۆری لە زستاندا ڕەنگی سپییە هەروەك ((ئاوی مروڤە – مەنی)) وە دەرچوونەکەی وەك دەرچوونی میز وایە وە حوکمەکەی وەك حوکمی میزە.

سێیەم: ((المَني)) ئاوی مرۆڤە دەرئەچێ بە لەزەتەوە وە ڕەنگی سپییەکی توندو تێرە وە بەسەر پۆشاکەوە وشك دەبێتەوە و پاکە، مروڤیش لەوە دروست دەبێت.

چوارەم: ((المَذي)) کە قسەی ئەم بەشە لە سەر ئەم جۆرەیانە، دەردەچێت لە پێشی مروڤەوە زۆر کات هەستی پێناکرێت وە هۆکارەکەی گەرمایە یان زۆری زەوق و شەهوەتی مرۆڤە وە بەشلی دێتە خوارەوە و حوکمەکەی وەکو میز وایە واتە پیسە.

٢٣- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم لِمَكَانِ ابْنَتِهِ مِنِّي، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: يَغْسِلُ ذَكَرَهُ، وَيَتَوَضَّأُ)) [1].

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((من پیاوێك بووم مەزیم زۆر بوو، شەرمم ئەکرد کە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بپرسم لەبەر ئەوەی کچەکەی خێزانم بوو فەرمانم بە میقدادی کوڕی ئەسوەد کرد (ڕەزای خوای لێبێ) ئەویش پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد، فەرمووی: زەکەری بشوات و دەستنوێژ بگرێت)).

---

١ البخاري (٢٦٩) مسلم (٣٠٣)

وَلِلْبُخَارِيِّ ((اغْسِلْ ذَكَرَكَ وَتَوَضَّأْ)). وَلِمُسْلِمٍ ((تَوَضَّأْ وَانْضَحْ فَرْجَكَ))[1].

واتــه: وه لــه دهربرِينێكـدا لـهلای پێـشهوا بوخـاری هـاتووه كـه پێغهمبـهر (ﷺ) فهرموويهتی ((زهكهرت بشۆ وه دهستنوێژ بگره)). وه لـه دهربرِينێكدا لـهلای پێـشهوا موسليم هاتووه كه پێغهمبهر (ﷺ) فهرموويهتی ((دهستنوێژ بگره وه ئـاو بپرژێنـه بـه زهكهرتا)).

٢٤– عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الْمَازِنِيِّ – رضي الله عنـه – قَالَ: ((شُكِيَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلم الرَّجُلُ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاةِ، فَقَالَ: لا يَنْصَرِفُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً، أَوْ يَجِدَ رِيحاً))[2].

واته: له عهبادی كوڕی تهميمهوه (ڕهزای خوای لێبێ) ئهويش لـه عهبـدوڵلای كـوڕی زهيدی كوڕی عاصمی مازنييهوه (ڕهزای خوايـان لـێبێ) دهڵـێ: ((شـهكواو نـاڕهزايی برايه لای پێغهمبهری خوا (ﷺ) دهربارهی پياوێك كـه گومـانی ههيـه كـه شـتێكی بـۆ دروست دهبێ لـه نوێـژدا پێغهمبـهر(ﷺ) فـهرمووی: سـهلام ناداتـهوه هـهتا گـوێی لـه دهنگێك ئهبێ يان ههست به بۆنێك دهكات)).

٢٥– عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ الأَسَدِيَّةِ ((أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ، لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صلّى الله عليه وسلم فَأَجْلَسَهُ فِي حِجْرِهِ، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ))[3].

واتــه: لـه دايكـی قهيسهوه (ڕهزای خـوای لـێبێ) كـه كـچی ميحـصهنی ئهسـهدييه ((منـداڵێكی هێنـا بـۆ خزمـهتی پێغهمبـهری خـوا (ﷺ) كـه خـواردنی نـهدهخوارد وه

---

١ مسلم (٣٠٣)

٢ البخاري (١٣٧) (٢٠٥٦) مسلم (٣٦١)

٣ البخاري (٢٢٣) مسلم (٢٨٧/١٠٤)

پێغەمبەر(ﷺ) داینیشاند لە کۆشی خۆیدا، میزی کرد بە جلەکانی پێغەمبەردا (ﷺ)وە پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئاوی کردو پرژاندی بەسەر جلەکەیدا، وە نەیشۆرد)).

تێبینی وەرگێڕ: ئەو منداڵەی کە دایکی قەیس (ڕەزای خوای لێبێ) هێنای بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)کوڕ بوو میزی کوڕ شۆردنی ناوێت بەڵام میزی کچ شۆردنی ئەوێ حیکمەتی ئەمەش زانایان جیاوازییان هەیە وە بەهێزترین ووتە ئەوەیە کە کوڕ حەرارەتی لە کچ زیاترە بەبۆنەی ئەوەوە ئەندازەی پیسبوونی کەمترە بەڵام کوڕیش هەتا شیرە خۆرە بێت شوێنی میزی ئاو پرژێن دەکرێت کاتێك کەوتە خواردنی خواردن واجبە شوێنەکەی بشۆرێ.

وفي حَديثِ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله عنها ((أنَّ النَّبيَّ –صلى الله عليه وسلم– أُتِـيَ بِـصَبِيٍ، فَبَـالَ عَلَـى ثَوْبِـهِ، فَـدَعَا بِمَـاءٍ، فَأَتْبَعَـهُ إِيَّـاهُ)) ولِمُـسْلِمٍ:((فَأَتْبَعَـهُ بَوْلَـهُ، وَلَـمْ يَغْسِلْهُ))[1].

واتە: لە فەرموودەی دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) ((پێغەمبەر (ﷺ) منداڵێکیان بۆ هێنا، میزی کرد بەسەر جلەکەیدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ)، داوای ئاوی کرد، کردی بەشوێن میزەکەدا)). وە لە دەربڕینێکدا لەلای پێشەوا موسلیم ((ئاوەکەی بەشوێن میزەکەدا کرد، وە نەیشورد)).

٢٦– عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ – رضـي الله عنـه – قَـالَ: ((جَـاءَ أعْرَابِـيٌّ، فَبَـالَ فِـي طَائِفَـةِ الْمَسْجِدِ، فَزَجَرَهُ النَّاسُ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فَلَمَّا قَضَى بَوْلَهُ أَمَـرَ النَّبِـيُّ صلَّى الله عليه وسلم بِذَنُوبٍ مِنْ مَاءٍ، فَأُهْرِيقَ عَلَيْهِ))[2].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ـ دەڵێ: ((دەشتەکییەك هات، میزی کرد لە لایەکی مزگەوت، خەڵکی ڕوشکێنیان کردوو و بەتوندی ڕەفتاریان

---

١ البخاري (٢٢٢) (٥٤٦٨) (٦٠٠٢) مسلم (٢٨٦)

٢ البخاري (٢٢١) مسلم (٢٨٥)

لەگەڵدا کرد، پێغەمبەر(ﷺ)ڕێگری لێکردن و قەدەغەی کردن کاتێك کە میزەکەی تەواو کرد پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد جامێك ((دۆڵچەیەك)) ئاو بێنن، ڕژێنرا بەسەریا)).

٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه - قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالاسْتِحْدَادُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الإِبِطِ)) [1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((سروشتی پاك پێنج شتن، خەتەنە کردن، بەرتاشین، سمێڵ کورتکردنەوە نینۆك کردن، توکی بن باڵ هەڵکەندن)).

١ البخاري (٥٨٩١) مسلم (٢٥٧)

## بابُ الجنابةِ- بەشی خۆشۆردن لە لەشگرانی

٢٨- عنْ أبي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – ((أنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم لَقِيَهُ في بعْضِ طُرُقِ المدينَةِ وهو جُنُبٌ، قال: فَانْخَنَسْتُ منْهُ، فَذَهَبْتُ فَاغْتَسَلْتُ ثُمَّ جِئْتُ، فقَالَ: أيْنَ كُنْتَ ياأبا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: كُنْتُ جُنُباً فَكَرِهْتُ أنْ أُجالِسَكَ على غَيْرِ طَهارَةٍ، فَقَالَ: سُبْحانَ اللهِ، إنَّ المُؤْمِنَ لايَنْجُسُ))[1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ـ دەڵێ: (( پێغەمبەرم (ﷺ) پێگەیی لە هەندێك لە ڕێگاكانی مەدینە لەشگران بووم، دەڵێ: خۆم لێشاردەوە، ڕۆشتم خۆم شۆرد پاشان هاتمەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەكوێ بووی ئەی ئەبوهورەیرە؟: وتم من لەشگران بووم پێم ناخۆش بوو لەخزمەتتا دانیشم بە لەشگرانی، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: پاكی بۆ خوا ئیماندار پیس نابێت)).

٢٩ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم إذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ للصَّلاة، ثُمَّ اغْتَسَلَ، ثُمَّ يُخَلِّلُ بِيَدَيْهِ شَعْرَهُ، حَتَّى إذَا ظَنَّ أنَّهُ قَدْ أرْوَى بَشرَتَهُ، أفَاضَ عَلَيْهِ الْمَاءَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ))[2].

واتە: لە دایكمان عائیشە وە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیفەتی وابوو كاتێك خۆی بشۆردایە لە لەشگرانی هەردوو دەستی دەشۆرد، پاشان دەستنوێژی دەگرت هەروەك دەستنوێژی بۆ نوێژ دەگرت، پاشان دەستەكانی دەكرد بەناو قژیدا هەتا كە ئەیزانی پێستەكەی تەڕ بووە وە ئاوی دەكرد بەسەریدا سێ جار پاشان باقی گیانی دەشۆرد)).

---

١ البخاري (٢٨٣) مسلم (٣٧١)

٢ البخاري (٢٧٢) مسلم (٣١٦)

وكَانَتْ تَقُولُ: كُنْتُ أغْتَسِلُ أنَا ورَسُولُ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم مِنْ إنَاءٍ وَاحِدٍ، نَغْتَرِفُ مِنْهُ جَمِيعاً)) [١].

واته:وه دایکمان عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ) دەیوت: ((من و پێغەمبەری خوا (ﷺ) ـ خۆمان دەشۆرد له یەك تەشتدا بەیەکەوە ئاومان لێ دەردەهێنا)).

٣٠ – عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ رضي الله عنها زَوْجِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم – أَنَّهَا قَالَتْ: ((وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم وَضُوءَ الْجَنَابَةِ، فَأَكْفَأَ بِيَمِينِهِ عَلَى يَسَارِهِ مَرَّتَيْنِ – أَوْ ثَلاثاً – ثُمَّ غَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ ضَرَبَ يَدَهُ بِالأرْضِ، أَوْ الْحَائِطِ، مَرَّتَيْنِ – أَوْ ثَلاثاً – ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ الْمَاءَ، ثُمَّ غَسَلَ جَسَدَهُ، ثُمَّ تَنَحَّى، فغَسَلَ رِجْلَيْهِ، فَأَتَيْتُهُ بِخِرْقَةٍ فَلَمْ يُرِدْهَا، فَجَعَلَ يَنْفُضُ الْمَاءَ بِيَدِيهِ)) [٢].

واته: له دایکمان مەیمونەی کچی حارثەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ) دەڵێ: ((ئاوم دانا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)بۆ خۆشۆردن لە لەشگرانی، ئاوی بەدەستی ڕاستی کرد بەسەر دەستی چەپیدا دوو جار یان سێ جار، پاشان زەکەری شۆرد، پاشان دەستی دا بە زەویدا، یان بە دیوارەکەدا دوو جار یان سێ جار، پاشان ئاوی لە دەم و لوتی وەردا، وە دەموچاوو هەردوو دەستی شۆرد، پاشان ئاوی کرد بەسەر سەریدا، پاشان لەشی شۆرد، ئینجا دوورکەوتەوە وە هەردوو قاچی شۆرد، وە پارچە پەڕۆیەکم بۆ هێنا نەیویست، ئاوەکەی بە دەستەکانی لەخۆی دەکردەوە)).

---

١ البخاري (٢٧٣) مسلم (٣٢١/٤٥،٤٣)

٢ البخاري (٢٧٤) مسلم (٣١٧)

تێبینی وەرگێڕ: پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوازەش خۆی لە لەشگرانی شۆردووە کە لە دواییدا قاچەکانی شۆردووە ئەو دوورکەوتنەوەیەش بۆ ئەوە بووە لەو سەردەمەدا وەك ئێستا نەبووە حەمام کاشیو چیمەنتۆ بێت بەڵام ئەگەر کەسێك بەم جۆرە خۆی بشوا لە دەشتێکدا ئەوا واباشترە بۆ شۆردنی قاچەکانی تۆزێك دوورکەوێتەوە.

٣١- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ - رضي الله عنه - قَالَ: ((يَا رَسُولَ اللّهِ، أَيَرْقُدُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، إذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرْقُدْ)) [١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) کە عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: ((ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئایە یەکێك لە ئێمە بۆی هەیە بخەوێت لەکاتێکدا ئەو لەشگران بێت؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: بەڵێ، کاتێك یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی گرت بابخەوێ)).

٣٢ - عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها - زَوْجِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَتْ: ((جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ امْرَأَةُ أَبِي طَلْحَةَ إلَى رَسُولِ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّهِ، إنَّ اللّهَ لا يَسْتَحْيِي مِنْ الْحَقِّ، هَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إذَا هِيَ احْتَلَمَتْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم : نَعَمْ، إذَا رَأَت الْمَاءَ)) [٢].

واتە: لە دایکمان دایکی سەلەمە (ڕەزای خوای لێبێ) کە خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ) دەڵێ: ((دایکی سولەیم (ڕەزای خوای لێبێ) کە خێزانی ئەبو طەڵحە بوو (ڕەزای خوای لێبێ) هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بێگومان خوا شەرم لە هەقو ڕاستی ناکات ئایە لەسەر ئافرەت هەیە خۆشۆردن کاتێك کە ئەو لەشگران ببێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵێ: کاتێك ئاوی دی -واتە: لەشگران بوو-)).

---

١ البخاري (٢٨٧) مسلم (٣٠٦)

٢ البخاري (١٣٠) (٢٨٢) مسلم (٣١٣)

٣٣ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كُنْتُ أَغْسِلُ الْجَنَابَةَ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم فَيَخْرُجُ إلَى الصَّلاةِ، وَإِنَّ بُقَعَ الْمَاءِ فِي ثَوْبِهِ))[١].

واته: له دايكمان عائيشهوه (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((مـن ئاوى لەشـگرانيم لـه جلى پێغەمبەرى خوا (ﷺ)ئەشۆرد جائـەويش ئەچوو بۆ نوێـژ وه شـوێنەوارى ئـاوى شۆردنەكه به جلەكەيەوه بوو)).

وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ ((لَقَدْ كُنْتُ أَفْرُكُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم فَرْكاً، فَيُصَلِّي فِيهِ))[٢].

وه له دەربڕينێكدا لەلاى پێشەوا موسليم دايكمان عائيشه (ڕەزاى خـواى لـێبێ) دەڵێ: ((بێگومان من ئەمكرِان ئاوى لەشگرانى له جلى پێغەمبەرى خوا (ﷺ)وه نوێژى پێوه دەكرد)).

٣٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ، ثُمَّ جَهَدَهَا، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ))[٣].

واتـه: لـه ئـەبوهورەيرەوه (ڕەزاى خـواى لـێبێ) ـ دەڵـێ: (( پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووى: ((كاتێك له نێوان هەرچوار پەليدا دانيشت پاشان سەرجێى لەگەڵدا كرد ئـەوا خۆشۆردن پێوست دەبێ)).

وَفِي لَفْظٍ لمسلم ((وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ)).

وه لـه دەربڕينێكـدا لـەلاى پێـشەوا موسـليم پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووى ((ئەگـەر ئاويشى نەهاتەوه)).

---

١ البخاري (٢٢٩)

٢ مسلم (٢٨٨)

٣ البخاري (٢٩١) مسلم (٣٤٨)

٣٥ – عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ بْنِ الْحُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي اللهُ عنهم ((أَنَّهُ كَانَ هُوَ وَأَبُوهُ عِنْدَ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، وَعِنْدَهُ قَوْمٌ، فَسَأَلُوهُ عَنْ الْغُسْلِ؟ فَقَالَ: يَكْفِيكَ صَاعٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا يَكْفِينِي، فَقَالَ جَابِرٌ: كَانَ يَكْفِي مَنْ هُوَ أَوْفَرُ مِنْك شَعَرًا، وَخَيْرٌ مِنْكَ – يُرِيدُ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم – ثُمَّ أَمَّنَا فِي ثَوْبٍ)) [١].

واته: له باوكى جەعفەرەوه كه موحەمەدى كوڕى عەلى كوڕى حوسەينى كوڕى عەلى كوڕى ئەبو طالبە (ڕەزاى خوايان لێبێ) ((كه موحەمەدى كوڕى عەلى خۆى و باوكى (ڕەزاى خوايان لێبێ) لاى جابرى كوڕى عەبدوللا بوون (ڕەزاى خوايان لێبێ) وه خەڵكى كەشى لابوو، پرسياريان لێكرد سەبارەت به خۆشۆردن فەرمووى: چوار مشتت بەسە، پياوێك وتى بەشم ناكات، جا جابر وتى (ڕەزاى خواى لێبێ) هەميشه بەشى كەسێكى دەكرد كەمووى لە تۆ زياتر بوو وه لە تۆش چاكتر بوو - مەبەستى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) - پاشان جابر (ڕەزاى خواى لێبێ) پێشنوێژى بۆ كردين بە يەك پۆشاكەوه)).

وَفِي لَفْظٍ ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يُفْرِغُ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاثاً)) [٢].

وه له دەربڕينێكى تردا ((پێغەمبەرى خوا (ﷺ)ئاوى دەكرد بەسەريدا سێ جار)).

دانەرى كتێب دەڵێ: (ڕەحمەتى خواى لێبێ) ئەو پياوەى وتى چوار مشت بەشم ناكات حەسەنى كوڕى موحەمەدى كوڕى عەلى كوڕى ئەبوطالب بوو (ڕەزاى خوايان لێبێ) باوكى ناوى موحەمەدى كوڕى حەنەفييە.

---

١ البخاري (٢٥٢)

٢ البخاري (٢٥٥)

## بابُ التَّيَمُّمِ - بەشى تەيەموم

تەيـەموم: بريتييـە لـە بـەكار هێنـانى خـۆڵ لـەبرى ئـاو لـەكاتى نـەبونى ئـاودا يـان نەتوانينى بەكارهێنانى، وە لەتايبەندمەندى ئەم ئوممەتەيە لە بەر ئەوەى بەهەميشەيى پاكوخاوێنييان لێنەبڕێت، وە بەكارهێنانى بۆ بێدەستنوێژى و لەشگرانى بەيەك شێوازە – وەرگێڕ.

٣٦ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُـصَيْنٍ – رضـي الله عنـه –: ((أَنَّ رَسُـولَ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسلم رَأَى رَجُلاً مُعْتَزِلاً، لَمْ يُصَلِّ فِي الْقَوْمِ؟ فَقَـالَ: يَـا فُـلانُ، مَـا مَنَعَـكَ أَنْ تُـصَلِّيَ فِـي الْقَوْمِ؟ فَقَـالَ: يَـا رَسُـولَ اللّـهِ أَصَـابَتْنِي جَنَابَـةٌ، وَلا مَـاءَ، فَقَـالَ: عَلَيْـك بِالـصَّعِيدِ، فَإِنَّـهُ يَكْفِيكَ))[1].

واتە: لە عيمرانى كوڕى حوصـەينـەوە (ڕەزاى خـواى لـێبێ) ((كـە پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) پيـاوێكى دى دوورى گرتبـوو نوێـژى نـەكرد لەگـەڵ خەڵكەكـەدا پێغەمبـەر (ﷺ)فەرمووى ئەى فلان چـى ڕێـى لێگرتيـت كـە نوێـژ بكـەيت لەگـەڵ ئـەو خەڵكـەدا؟ ئەوجا وتى ئەى پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ)لەشـگرانيم توشـبووەو ئـاويش نييـە پێغەمبـەر (ﷺ)فەرمووى: خۆڵ بەكاربهێنە چونكە بەستە)).

٣٧ – عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((بَعَثَنِي النَّبِيُّ صـلَّى الله عليـه وسـلم فِي حَاجَةٍ، فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي الـصَّعِيدِ، كَمَـا تَمَـرَّغُ الدَّابَّـةُ، ثُـمَّ أَتَيْـتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: إِنَّمَا يَكْفِيكَ أَنْ تَقُـولَ بِيَـدَيْكَ هَكَـذَا – ثُـمَّ ضَـرَبَ بِيَدَيْـهِ الأَرْضَ ضَـرْبَةً وَاحِـدَةً، ثُـمَّ مَـسَحَ الـشِّمَالَ عَلَـى الْـيَمِينِ، وَظَـاهِرَ كَفَّيْـهِ وَوَجْهَهُ))[2].

---

١ البخاري (٣٤٨)

٢ البخاري (٣٤٩) مسلم (٣٦٨)

واتــه: لــه عــهمماری كــوڕی یاســرهوه (ڕەزای خوایــان لــێبیٚ) دهڵــیٚ: ((پێغهمبــهر (ﷺ)ناردمی بۆ پێویستییهك، لهشگران بــووم، ئــاوم دهسـتنهكهوت، خـۆم گهوزانـد لـه خۆڵدا ههروهك ئاژهڵ خۆی دهگهوزێنیٚ، پاشان هاتم بـۆلای پێغهمبـهر (ﷺ)ئـهوهم بـۆ بـاس كـرد پێغهمبـهر (ﷺ)فـهرمووی: تـهنها ئهوهنـدهت بهسـبوو كـه بـه دهسـتهكانت وابكهیت ـ پاشان ههردوو دهستی دابه زهویدا یـهك جـار، پاشـان مهسـحی چـهپی كـرد بهسهر ڕاستیدا، وه ڕووی ههردوو دهستی و دهموچاوی)).

٣٨ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ رضي الله عنهما: أنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليـه وسـلم قَـالَ: ((أُعْطِيتُ خَمْساً، لَمْ يُعْطَهُنَّ أحَدٌ مِنْ الأنْبِيَاءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَـتْ لِي الأرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأيُّمَا رَجُـلٍ مِـنْ أُمَّتِـي أدْرَكَتْـهُ الـصَّلاةُ فَلْيُـصَلِّ، وَأُحِلَّـتْ لِـي الْمَغَانِمُ، وَلَمْ تَحِلَّ لأحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَـانَ النَّبِـيُّ يُبْعَـثُ إلَـى قَوْمِـهِ خَاصَّـةً، وَبُعِثْتُ إلَى النَّاسِ كَافَّةً))[1].

واتــه:لــه جــابری كــوڕی عهبــدوڵلاوه (ڕەزای خوایــان لــێبیٚ) كــه پێغهمبــهر (ﷺ) فهرموویـهتی ((پێـنج شـتم پێبهخـشراوه بـه هـیچ یـهكێك لـه پێغهمبـهرانی پـێش مـن نهبهخشراوه (علیهم السلام) سهرخراووم بهسهر دهژمنانمدا بـهوهی لـهدووری یـهك مانگـه ڕێ لـێم دهترسـن، وه هــهموو سـهر زهویـم بـۆ كـراوه بـه مزگـوت و پاككـهرهوه، جـا هەركهسـێك لــه ئوممهتهكــهم لههــهر جێیهكـدا نوێـژی پێگــهی بــا نوێــژ بكــات، وه دهسكهوتهكانی جهنگم بۆ حهڵاڵكراوه بۆ هـیچ كهسـێك پـێش مـن حـهڵاڵ نـهكراوه، وه شـهفاعهتم پێبهخـشراوه، وه هـهموو پێغهمبـهرێك(ﷺ) نێـردراوه بـۆلای گهلهكـهی بـه تایبهتی وه من نێردراوم بۆلای ههموو خهڵكی)).

---

[1] البخاري (٣٣٥) (٤٣٨) مسلم (٥٢١)

## بابُ الحيضِ - بەشی حەیز

حەیز خوێنێکی ئاساییە خوای گەورە دروستی کردووە لەبەر چەند حیکمەتێك لەوانە دەبێتە خواردن بۆ منداڵ لە کاتی سکپڕیدا وە لەکاتی بوونی منداڵدا دەبێت بەشیر وە نیشانەی لەش ساغی ئافرەتە هەر ئافرەتێك حەیزی نەبێ سك ناکات وە مایەی کەم نرخی ئافرەت نییە هەر وەك لە سەردەمی نەفامیدا باوەڕیان وابوو ئاینی ئیسلام ئەوەی لا ناپەسەندە – وەرگێڕ.

٣٩– عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ((أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ: سَأَلَتِ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَتْ: إنِّي أُسْتَحَاضُ فَلا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاةَ؟ قَالَ: لا، إنَّ ذَلكَ عِرْقٌ، وَلَكِنْ دَعِي الصَّلاةَ قَدْرَ الأَيَّامِ الَتِي كُنْتِ تَحِيضِينَ فِيهَا، ثُمَّ اغْتَسِلِي وَصَلِّي))[١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((کە فاطمەی کچی ئەبو حوبەیش (ڕەزای خوای لێبێ) پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) وتی من خوێنی نەخۆشیم هەیە پاك نابمەوە ئایە واز لەنوێژ بێنم؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: نەخێر، ئەوە دەمارێکە بەڵکو واز لە نوێژ بهێنە بەئەندازەی ئەو ڕۆژانەی کەتۆ تیایدا دەکەویتە حەیزەوە پاشان خۆت بشۆو نوێژ بکە)).

وَفِي رِوَايَةٍ ((وَلَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ: فَاتْرُكِي الصَّلاةَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي))[٢].

وە لە دەربڕینێکی تردا ((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((ئەوە حەیز نییە، ئەگەرکاتی حەیز هات واز لە نوێژ بهێنە وەکاتێك ماوەکەی تەواو بوو ئەوا خۆت لەخوێنەکە خاوێن بکەرەوە و نوێژ بکە)).

---

١ البخاري (٣٢٥) مسلم (٣٣٣)

٢ البخاري (٣٠٦)

٤٠ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ((أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ اُسْتُحِيضَتْ سَبْعَ سِنِينَ، فَسَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاةٍ))[١].

واته: له دايكمان عائيشەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((دايكى حەبيبە (ڕەزاى خواى لێبێ) خوێنى نەخۆشى هەبوو حەوت ساڵ، پرسيارى كرد؟ لە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) سەبارەت بەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانى پێكرد خۆى بشوا، بەبەردەوامى دايكى حەبيبە (ڕەزاى خواى لێبێ) بۆ هەموو نوێژێك خۆى دەشۆرد)).

تێبينى وەرگێڕ: ئەو خۆشۆردنەى دايكى حەبيبە (ڕەزاى خواى لێبێ) بۆ هەموو نوێژێك واجب نەبوو لەسەرى بەڵكو عادەتى خۆى بوو وە جمهورى زانايان دەنگيان لە سەر ئەوەيە كە خۆشۆردن بۆ هەموو نوێژێك لەو حاڵەتەيا سونەتە هەتا ((پێشەوا شافعى (ڕەحمەتى خواى لێبێ) دەفەرمووێ: گومانوم نييە كە فەرمانەكەى پێغەمبەر (ﷺ)بۆئەو كە خۆى بشوا بۆ هەموو نوێژێك سونەتە))[٢].

٤١ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، كِلانا جُنُبٌ))[٣].

واته: له دايكمان عائيشەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((مـن و پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ـ خۆمان دەشۆرد لەيەك تەشتدا، وە هەردووكمان لەشگران بووين)).

وكَانَ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ، فَيُبَاشِرُنِي وَأَنَا حَائِضٌ.[٤]

---

١ البخاري (٣٢٧) واللفظ له مسلم (٦٤/٣٣٤)

٢ الأم (١/٧٩،٨٠) بتصرف

٣ البخاري (٢٩٩) مسلم (٣٢١)

٤ البخاري (٣٠٠) مسلم (٢٩٣)

واته: هەر له دايكمان عائيشەوه (ڕەزاى خواى لێبێ) كه دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانى پێدەكردم نێوان ناوك بۆ ئەژنۆم دابپۆشم پاشان گەمەو كارى خۆى لەگەڵ دەكردم وه من له حەيزدا بووم.

تێبينى وەرگێڕ: لەزەت وەرگرتن له ئافرەت له حەيزدا بێت دروستە بەڵام جيماع كردن لەگەڵيدا حەرامە.

وَكَانَ يُخْرِجُ رَأْسَهُ إِلَيَّ، وَهُوَ مُعْتَكِفٌ، فَأَغْسِلُهُ وَأَنَا حَائِضٌ.[1]

واته: هەر له دايكمان عائيشەوه (ڕەزاى خواى لێبێ) كه دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) له ئيعتيكافدابوو سەرى دەردەكرد بۆلاى من، سەريم بۆ دەشۆرد لەكاتێكدا من له حەيزدا بووم.

ئيعتيكاف: بريتييه له مانەوه له مزگەوتدا بۆ عيبادەت ماوەيەكى ديارى كراو.

٤٢– عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ – صلَّى الله عليه وسلم – يَتَّكِئُ فِي حِجْرِي، وَأَنَا حَائِضٌ فَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ)) [2].

واته: له دايكمان عائيشەوه (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەرى خوا (ﷺ)سەرى دەكردە سەر كۆشى من قورئانى دەخوێند لەكاتێكدا من له حەيزدا بووم)).

٤٣– عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ: ((سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ، وَلا تَقْضِي الصَّلاةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ فَقُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلَكِنِّي أَسْأَلُ. فَقَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ، فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلا نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاةِ)) [3].

---

١ البخاري (٣٠١) مسلم (٢٩٧)

٢ البخاري (٢٩٧) (٧٥٤٩) مسلم (٣٠١)

٣ البخاري (٣٢١) مسلم (٣٣٥)

واتـه: لـه موعـازەوه دەڵـێ: ((پرسـيارمكرد لـه عائيـشه (ڕەزای خـوای لـێبێ) پێموت:ئەوە چییە حەیزدار ڕۆژو دەگێڕێتەوە، بەڵام نوێژ ناگێڕێتەوە؟ عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ) وتی تۆ حەروریت؟ وتم: نەخێر من حـەروری نـیم، بـەڵام پرسـیار دەکـەم عائیـشه (ڕەزای خـوای لـێبێ) وتـی: حـەیزمان تـوش ئـەبوو فـەرمانمان پێـدەکرا بەگێڕانەوەی ڕۆژو، وه فەرمانمان پێنەدەکرا بەگێڕانەوەی نوێژ)).

حـەروری: کۆمـەڵێ تـاقمێکن لـه خـەواریج شـتیان زۆر قورسـو گـران دەکـرد وه سەرهەڵدانیان له ناوچەی حەرورائەوه بوو که نزیکی کوفەیە.

## كتابُ الصلاةِ: پەرتوکی نوێژ

## بابُ المواقيتِ: بەشی کاتەکانی نوێژ

نوێژ چەند وتەیك و چەند كردارێكی تایبەتـە دەسـت پێـدەكات بـە ((الله أكبر)) وە كۆتایی دێت بە سەلام دانەوە، وە گـەورەترین كردەوەیـە لـە دوای شـایەتمان، وە هـەر كەسێك ئینكاری بكات ئەوا كافر دەبێت بە كۆ دەنگـی زانایـان، بـەلاّم جیـاوازی هەیـە لەنێو زانایاندا لە سەركافربوونی ئەوكەسەی كـەنایكات پێـشەوا ئەحمـەد، وە جمهـوری زانایـــان دەفـــەرموون كـــافر دەبێـــت وە ئـــەو وتەیـــە كـــۆی دەنگـــی هـــاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)ڕەزای خوایان لێبێ وە عەبدوڵلاّی كوڕی شەقیق (ڕەزای خوای لـێبێ) دەڵـێ: ((كـانوا لایـرون شـیئا تركـە كفـر إلا الـصلاة))[1]. واتـە ((هـاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ)هیچ شتێكیان نەدیوە وازلێهێنانی كوفر بێت جگە لە نوێژ نەبێت)) — وەرگێڕ.

٤٤– عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ وَاسْمُهُ سَعْدُ بْنُ إِيَاسٍ – قَالَ: حَدَّثَنِي صَاحِبُ هَذِهِ الـدَّارِ – وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى دَارِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((سَـأَلْتُ رَسَـولَ الله صلَّى الله عليه وسلم : أَيُّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللَـهِ عَـزَّ وَجَـلَّ؟ قَـالَ: الـصَّلاةُ عَلَـى وَقْتِهَـا. قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: بِرُّ الْوَالِدَيْنِ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَـهِ، قَـالَ: حَـدَّثَنِي بِهِنَّ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم وَلَوْ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي))[2].

واتە: لە ئەبو عەمری شەیبانییەوە کە نـاوی سـەعدی کـوڕی ئیاسـە (ڕەزای خـوای لـێبێ) دەڵـێ: قـسەی بـۆ كـردم خـاوەنی ئـەوماڵـە وە ئامـاژەی كـرد بـۆلای مـاڵی عەبدوڵلاّی كوڕی مەسعود (ڕەزای خوایان لـێبێ) وتـی ((پرسـیارم كـرد لـە پێغەمبـەری

---

١ أخرجه الترمذي بلفظ غير الصلاة (١٤/٥) وصححه النووي في رياض الصالحين (٣٤٦) وكذا في مجموع (١٦/٣) والالباني في صحيح الترغيب والترهيب (٥٦٤) .

٢ البخاري (٥٢٧) (٢٧٨٢) (٥٩٧٠) (٧٥٣٤) مسلم (٨٥/١٣٩)

خوا (ﷺ)چی کردەوەیەك خۆشەویستە لەلای خوای بالآدەست؟ فەرمووی نوێژ لە کاتی خۆیدا، وتم پاشان چی؟ فەرمووی چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا، وتم پاشان چی؟ فەرمووی، تێکۆشان لە پێناوی خوادا، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمانەی پێوتم وە ئەگەر داوای زیاترم لێ بکردایە پێی دەوتم)).

٤٥- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي الْفَجْرَ، فَتَشْهَدُ مَعَهُ نِسَاءٌ مِنْ الْمُؤْمِنَاتِ، مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ ثُمَّ يَرْجِعْنَ إلَى بُيُوتِهِنَّ مَا يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ، مِنْ الْغَلَسِ))[1].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی بەیانی دەکرد، وە ئافرەتانی ئیمانداران لەگەڵیدا ئامادە دەبوون، جەستەو سەریان داپۆشیبوو پاشان دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان کەس نەیدەناسینەوە لەبەر تاریکی)).

٤٦ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: ((كَانَ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ نَقِيَّةٌ وَالْمَغْرِبَ إذَا وَجَبَتْ، وَالْعِشَاءَ أَحْيَاناً وَأَحْيَاناً إذَا رَآهُمْ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ. وَإِذَا رَآهُمْ أَبْطَئُوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحُ كَانَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ))[2].

واتە:لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ((هەمیشە سیفەتی وابوو نوێژی نیوەڕۆی دەکرد بە گەرمای نیوەڕۆ، وەنوێژی عەسری دەکرد خۆر پاکو سپی بوو، وە شێوانی دەکرد کاتێك خۆر ئاوا ببوایە، وە خەوتنانی زوو دەکرد کاتێك ببینیایە کۆبوونەتەوە، وە ببینیایە دوا کەوتوون دوای دەخست، وە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانی دەکرد بە تاریکی)).

١ البخاري (٥٧٨) (٨٦٧) مسلم (٦٤٥)

٢ البخاري (٥٦٠) (٥٦٥) مسلم (٦٤٦)

٤٧ – عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ سَيَّارِ بْنِ سَلامَةَ قَالَ: ((دَخَلْتُ أَنَا وَأَبِي عَلَى أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ؟ فَقَالَ: كَانَ يُصَلِّي الْهَاجِرَةَ – الَّتِي تَدْعُونَهَا الأُولَى – حِينَ تَدْحَضُ الشَّمْسُ، وَيُصَلِّي الْعَصْرَ، ثُمَّ يَرْجِعُ أَحَدُنَا إِلَى رَحْلِهِ فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ. وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي الْمَغْرِبِ. وَكَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ مِنْ الْعِشَاءِ الَّتِي تَدْعُونَهَا الْعَتَمَةَ. وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا، وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا. وَكَانَ يَنْفَتِلُ مِنْ صَلاةِ الْغَدَاةِ حِينَ يَعْرِفُ الرَّجُلَ جَلِيسَهُ. وَكَانَ يَقْرَأُ بِالسِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ)) [١].

واته: له ئەبو مینهالەوە کەناوی سەییاری کوڕی سەلامەیە دەڵێ: ((من و باوکم چوین بۆلای ئەبو بەرزەی ئەسلەمی(ڕەزای خوای لێبێ) باوکم پێی وت پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن نوێژە فەرزەکانی دەکرد؟ ئەویش : وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ((هەمیشە نوێژی نیوەڕۆی دەکرد کە ئێوە پێی دەڵێ:ن یەکەم، کاتێ خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا، وە نوێژی عەسری دەکرد، پاشان یەکێك لە ئێمە دەگەڕایەوە بۆلای کاروانییەکەی لەوسەری مەدینە هێشتا خۆر ڕوون بوو، وە بیرم چۆتەوە چی وت دەربارەی ئێوارە، وە پێغەمبەر (ﷺ) پێی خۆش بوو نوێژی خەوتنان دوای بخات کە ئێوە پێی دەڵێن: عەتەمە ((واتە تاریکایی شەو)) وە پێی ناخۆش بوو خەو پێش نوێژی خەوتنان وە قسەکردنیش لە دوایەوە وە پێغەمبەر (ﷺ) سەلامی دەدایەوە لە نوێژی بەیانی کاتێك پیاو جێگەکەی خۆی دەناسی وە شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند)).

١ البخاري (٥٤٧) (٥٩٩) مسلم (٦٤٧)

٤٨ – عَنْ عَلِيٍ – رضي الله عنه –: أنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ: ((مَلأَ اللَّهُ قُبُورَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ نَاراً، كَمَا شَغَلُونَا عَنْ الصَّلاةِ الْوُسْطَى حَتَّى غَابَتْ الشَّمْسُ))[1].

واته: لو عەلیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەر (ﷺ)ڕۆژی جەنگی خەندەق فەرمووی ((خوای گەورە گۆڕو ماڵەکانیان پڕکات لە ئاگر، هەروەك سەرقاڵیان کردین لە نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوا بوو)).

وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ ((شَغَلُونَا عَنْ الصَّلاةِ الْوُسْطَى – صَلاةِ الْعَصْرِ – ثُمَّ صَلاهَا بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ))[2].

وە لە دەربڕینێکدا لەلای پێشەوا موسلیم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سەرقاڵیان کردین لە نوێژی عەسر پاشان نوێژی کرد لە نێوان نوێژی ئێوارە و خەوتنان دا)).

وَلَهُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: ((حَبَسَ الْمُشْرِكُونَ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم عَنِ الْعَصْرِ، حَتَّى احْمَرَّتِ الشَّمْسُ أَوْ اصْفَرَّتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم : شَغَلُونَا عَنْ الصَّلاةِ الْوُسْطَى – صَلاةِ الْعَصْرِ – مَلأَ اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَاراً، أَوْ حَشَا اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَاراً))[3].

وە هەر لە دەربڕینێکدا لەلای پێشەوا موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) وتی ((بێباوەڕەکان ڕێگریان ((بەندیان)) کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژی عەسر هەتا خۆر سور بوو یان زەرد بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: سەرقاڵیان کردین لە نوێژی عەسر خوای گەورە سکیان و گۆڕەکانیان پڕکات لە ئاگر)).

وشەی ((مَلأَ و حَشَا)) یەك واتا دەبەخشێت.

١ البخاري (٢٩٣١) (٤١١١) (٤٥٣٣) (٦٣٩٦) مسلم (٦٢٧)

٢ مسلم (٦٢٧)

٣ مسلم (٦٢٨)

٤٩ – عَنْ عَبْدِ اللَهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((أَعْتَمَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فَخَرَجَ عُمَرُ، فَقَالَ: الصَّلاةَ، يَا رَسُولَ اللّه. رَقَدَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ. فَخَرَجَ ورَأْسُهُ يَقْطُرُ يَقُولُ: لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي – أَوْ عَلَى النَّاسِ – لأَمَرْتُهُمْ بِهَذِهِ الصَّلاةِ هَذِهِ السَّاعَةِ)) [١].

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی خەوتنی دواخست جا ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) چوو بۆلای وتی نوێژ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! ئافرەتان و منداڵان خەوتن پێغەمبەر(ﷺ)دەرچوو وە ئاو لەسەری دەتکا دەیفەرموو، ئەگەر گران و ناڕەحەت نەبوایە لەسەر ئومەتم یان لەسەر خەڵك فەرمانم پێدەکردن بەم نوێژە لە کاتە)).

---

١ البخاري (٧٢٣٩) مسلم (٦٤٢)

## بەشی هەندێك لە ناپەسەندیەكانی نوێژ

٥٠ – عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: عَنِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إذَا أُقِيمَتِ الصَّلاةُ، وَحَضَرَ الْعَشَاءُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ)) [١].

واتـە: لـە دایكمـان عائیـشەوە (ڕەزای خـوای لـێبێ) دەڵـێ: ((پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی:

كاتێك قامەت كرا بۆ نوێژ وە خواردن ئامادە بوو ئەوا دەست بكەن بەخواردنەكە)).

وعن ابن عمر، نحوه.

وە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) هاتووە هاوشێوەی ئەوە.

٥١ – وَلِمُسْلِمٍ عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((لا صَلاةَ بِحَضْرَةِ طَعَامٍ، وَلا وَهُوَ يُدَافِعُهُ الأَخْبَثَانِ)) [٢].

واتە: وە لە دەربڕینێكدا لەلای پێشەوا موسلیم لە دایكمان عائیشەوە (ڕەزای خـوای لێبێ) دەڵێ: گوێم ((لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ)دەیفەرموو: ((نوێـژ نییـە لەكاتێكدا خواردن ئامادە بێت، وە لە كاتێكیشدا میزو پیسایی پاڵی پێوە بنێن)).

شیكردنەوەی وەرگێڕ: واتە هـەركاتێك كەسـێك خـواردنی بـۆ ئامـادە بێـت وە كـاتی نوێژ بێت ئەوا باخواردن بخوات پێش كردنی نوێژەكـە یـان میـزو پیـسای تەنگـە بـەری بكات ئەوا باخۆی بەتاڵبكاتەوە پێش كردنی نوێژەكە چونكە نوێژەكەی ناتەواوە.

١البخاري (٥٤٦٥) مسلم (٥٥٧)

٢ مسلم (٥٦٠)

## بەشی کاتە قەدەغە کراوەکان

٥٢ – عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ – وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ – أَنَّ رَسُولَ الله صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ الصَّلاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((شایەتییان دا لای من کۆمەڵە پیاوێك کە جێی ڕەزامەندین وە لە هەموویان زیاتر جێی ڕەزامەندی بێ لای من عومەرە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)نەهی و قەدەغەی کرد لە نوێژ کردن دوای نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵدێ وە دوای نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوا دەبێت)).

٥٣– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – عَنْ رَسُولِ اللّهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا صَلاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَلا صَلاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ)) [2].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی: ((نوێژ نییە دوای نوێژی بەیانی هەتا خۆر بەرز دەبێتەوە وە نوێژ نییە دوای عەسر هەتا خۆر ئاوا دەبێت)).

ڕوونکردنەوە: لەم دوو فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە نوێژ کردن لەو دوو کاتەدا قەدەغەیە لەبەر ئەوەی هاوشێوەیی بێباوەڕەکانە ئەوانەی خۆر دەپەرستن لەو دوو کاتەدا لە کاتی هەڵهاتن و ئاوا بوونیدا وە هەر کەسێك خۆی هاوشێوەی گەلێك لێبکات ئەوە لەوانە.

---

١ البخاري (٥٨١) مسلم (٨٢٦)

٢ البخاري (٥٨٦) مسلم (٨٢٧)

قال المصنف : وفي البابِ عنْ عليٍّ بنِ أبي طالبٍ، وعبدِ اللهِ بنِ عمرِو بنِ العاصِ، وأبي هريرةَ، وسَمُرَةَ بنِ جُندُبٍ، وسَلَمَةَ بنِ الأَكوَعِ، وزيدِ بنِ ثابتٍ ومعاذِ بنِ جبلٍ، وكعبِ بنِ مُرَّةَ، وأبي أُمامةَ الباهليِّ، وعمرِو بنِ عبسةَ السُّلَميِّ، وعائشةَ رضي الله عنهم، والصُّنابحيِّ، ولم يسمعْ منَ النبيِّ – صلى الله عليه وسلم – فحديثه مرسلٌ .

## بەشی گێڕانەوەی نوێژە فەوتاوەکان وە ڕیزبەندییان

٥٤ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ رضي الله عنهما ((أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطّاب رضي الله عنه جَاءَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّه، مَا كِدْتُ أُصَلِّي الْعَصْرَ حَتَّى كَادَت الشَّمْسُ تَغْرُبُ. فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : وَاللّهِ مَا صَلَّيْتُهَا. قَالَ: فَقُمْنَا إِلَى بَطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ للصَّلاة، وَتَوَضَّأْنَا لَهَا، فَصَلَّى الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ. ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ)) [١].

واته:له جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((کە عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێ) ڕۆژی جەنگی خەندەق هات دوای ئەوەی کە خۆرئاوا بوو بوو وە جنێوی بە بێباوەڕەکانی قورەیش دەدا ئینجا وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)نوێژی عەسرم نەکرد هەتا نزیك بوو خۆر ئاوا دەبوو، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: سوێند بەخوا منیش نوێژم نەکردووە دەڵێ: چوین بۆ شیوی بطحان، پێغەمبەر (ﷺ) دەستنوێژی گرت بۆ نوێژ ئێمەش دەستنوێژمان گرت بۆ نوێژ، وە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی عەسری کرد دوای ئەوەی کە خۆر ئاوا بوو بوو پاشان دوای ئەوە نوێژی ئێوارەشی کرد)).

---

١ البخاري (٥٩٦) (٩٤٥) (٤١١٢) مسلم (٦٣١)

## بابُ فضلِ الجماعةِ ووجوبِها- بەشی گەورەیی نوێژی جەماعەت و وە واجب بوونی

٥٥- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صلّى الله عليه وسلم قَالَ: ((صَلاةُ الْجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاةِ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً))[١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە(ڕەزای خوایان لێبێ) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((نوێژی بەکۆمەڵ بیست و حەوت پلە خێری زیاترە لە نوێژی تەنیا)).

٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ صلّى الله عليه وسلم: ((صَلاةُ الرَّجُلِ فِي الجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسةً وَعِشْرِينَ ضِعْفاً وَذَلِكَ: أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ. ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لا يُخْرِجُهُ إلا الصَّلاةُ لَمْ يَخْطُ خُطْوَةً إلا رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، وَحُطَّ عَنْهُ بها خَطِيئَةٌ. فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلِ الْمَلائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ، مَا دَامَ فِي مُصَلاهُ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، وَلا يَزَالُ فِي صَلاةٍ مَا انْتَظَرَ الصَّلاةَ))[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((نوێژی پیاو بە کۆمەڵ بیست و پێنج پلە خێرەکەی بۆ زیاد دەکرێت بەسەر نوێژەکەیدا لە ماڵەکەیدا یان لەبازاڕەکەیدا ئەوەش کاتێک دەستنوێژ بگرێ، دەستنوێژێکی جوان، پاشان بچێت بۆ مزگەوت هیچ شتێك دەری نەکات جگە نوێژ نەبێت هیچ هەنگاوێك هەڵناهێنێت بێگومان پلەیەك پێی بەرز دەبێتەوە، وە تاوانێکی لێ دەسڕێتەوە، کاتێك نوێژی کرد فریشتە بەردەوام دروودی لەسەر لێدەدەن، مادەم تائەوکاتەی لە شوێنی نوێژ کردنەکەی بێت: دەڵێن، خوایە دروودی خۆتی بەسەردا

---

١ البخاري (٦٤٥) مسلم (٦٥٠)

٢ متفق عليه واللفظ للبخاري ـ البخاري (٦٤٧) مسلم (٦٤٩)

برێژه، خوایه لێی خۆشببه، خوایه ڕەحمی پێبکه، وه هەر لەنوێژدا دەبێت مادەم چاوەڕوانی نوێژه)).

٥٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((أَثْقَلُ الصَّلاةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ: صَلاةُ الْعِشَاءِ، وَصَلاةُ الْفَجْرِ. وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا. وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلاةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لا يَشْهَدُونَ الصَّلاةَ، فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ)) [1].

واته: له ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((قورسترین نوێژ لەسەر دوو ڕووەکان: نوێژی خەوتنان و، نوێژی بەیانیە، ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێکیان تێدایە، بەگاگۆڵکێش بوایه بۆی دەهاتن. نیازم بوو فەرمان بکەم که قامەت بکرێ بۆ نوێژ پاشان فەرمان بکەم بە پیاوێك نوێژ بکات بۆ خەڵك، پاشان خۆم لەگەڵ چەند پاوێکدا دەرچم چەند باوەشە دارێکیان پێبێت بۆ سەر ئەوانەی که ئامادەی نوێژ نابن، ماڵه کانیان بەسەردا بسوتێنم بەئاگر)).

---

١ البخاري (٦٥٧) مسلم (٢٥٢/٦٥١)

## بەشی ئامادە بوونی ئافرەتان لە مزگەوت

٥٨ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إذَا اسْتَأْذَنَتْ أَحَدَكُمْ امْرَأَتُهُ إلَى الْمَسْجِدِ فَلا يَمْنَعْهَا. قَالَ: فَقَالَ بِلالُ بْنُ عَبْدِ اللَّه: وَاَللَّهُ لَنَمْنَعَهُنَّ. قَالَ: فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ عَبْدُ الله، فَسَبَّهُ سَبّاً سَيِّئاً، مَا سَمِعْتُهُ سَبَّهُ مِثْلَهُ قَطُّ، وَقَالَ: أُخْبِرُكَ عَنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلم وَتَقُولُ: وَاَللهِ لَنَمْنَعَهُنَّ؟!))[1].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە(ڕەزای خوایان لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێك خێزانی هەر یەکێك لە ئێوە مۆڵەتی وەرگرت بۆ مزگەوت با ڕێگری لێ نەکات: بیلالی کوڕی عەبدوڵلا وتی سوێند بە خوا ڕێگریان لێدەکەین، عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێ) ڕووی تێکرد، جنێوی پێدا جنێوێکی خراپ، هەرگیز گوێم لێینەبوو بوو جنێوی بەو شێوەیە بدات، ئینجا وتی هەواڵت پێدەدەم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)وە دەڵێ:ی سوێند بە خوا ڕێگریان لێدەکەین)).

وَفِي لَفْظٍ لمسلم ((لا تَمْنَعُوا إمَاءَ الله مَسَاجِدَ الله))[2].

وە لە دەربڕینێکدا لەلای پێشەوا مسلیم پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ڕێگری بەندەکانی خوا مەکەن لە مزگەوتەکانی خوا)).(واتە ئافرەتان)

---

١ البخاري (٨٣٧) (٥٢٣٨) مسلم (١٣٤،١٣٥،١٤٠/٤٤٢)

٢ مسلم (١٣٦/٤٤٢)

## بەشی سوننەتی ڕەواتب وە گەورەی دوو ڕکاتی بەیانی

٥٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْجُمُعَةِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ)) [١].

واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە(ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ)دوو ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، وە دوو ڕکات دوای نوێژی نیوەڕۆ، وە دوو ڕکات دوای جومعە، وە دوو ڕکات دوای ئێوارە، وە دوو ڕکات دوای خەوتنان)).

وَفِي لَفْظِ: ((فَأَمَّا الْمَغْرِبُ وَالْعِشَاءُ والفَجْرُ وَالْجُمُعَةُ: فَفِي بَيْتِهِ)) [٢].

وە لە دەربڕینێکی تردا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((بەڵام ئێوارەو خەوتنان و بەیانی و جومعە: لە ماڵەکەی خۆیدا)).

وَفِي لَفْظٍ للبخاري: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ: أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم: ((كَانَ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَعْدَمَا يَطْلُعُ الْفَجْرُ. وَكَانَتْ سَاعَةً لا أَدْخُلُ عَلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فِيهَا)) [٣].

وە لە دەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: حەفصە (ڕەزای خوای لێبێ) پێی وتم پێغەمبەر (ﷺ)سیفەتی وابوو دوو ڕکات نوێژی سووك و ئاسانی دەکرد دوای بانگی بەیانی وە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: لەو سەعاتەدا من نەئەچوومە لای پێغەمبەر (ﷺ).

---

١ البخاري (٩٣٧) (١١٦٥) مسلم (٧٢٩) (٨٨٢)

٢ البخاري (١١٧٢) مسلم (٧٢٩)

٣ البخاري (١١٧٣)

٦٠- عنْ عائِشَةَ رضِيَ اللهُ عنْها قالَتْ: ((لَمْ يَكُنِ النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليـه وسـلم علـى شيءٍ منَ النَّوافِلِ أشَدُّ تَعاهُداً منْهُ على ركْعَتَي الفَجْرِ))[١] .

واتـه: لـه لـه دايكمـان عائيـشهوه (ڕەزای خـوای لـێبێ) دەڵـێ: ((پێغەمبـەر (ﷺ) لەسەر هیچ شتێك لە سونەتەكان بەئەندازەی دوو ڕكاتی بەیانی بەردەوام نەبووە)).

وفي لفْظٍ لِمُسْلِمٍ: ((ركْعَتا الفَجْرِ خيرٌ منَ الدُّنيا وما فيها))[٢] .

وە لە دەربڕینێكـی تـردا لـەلای پێـشەوا مـسلیم ((پێغەمبـەر (ﷺ)دەفـەرموێ: دوو ڕكاتی سونەتی بەیانی خێرترە لە دنیاو ئەوەشی تێیدایە)).

---

١ البخاري (١١٦٩) مسلم (٩٤/٧٢٤)

٢ مسلم (٧٢٥)

## بابُ الأذانِ والإقامةِ - بەشی بانگ و قامەت

٦١ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: ((أُمِرَ بِلالٌ أَنْ يَشْفَعَ الأذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ))[١].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((فەرمان کرا بە بیلال (ڕەزای خوای لێبێ) کە بانگ بە جووت بڵێت، وە قامەتیش بە تاك)).

٦٢ – عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ وَهْبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ السُّوَائِيِّ قَالَ: ((أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم وَهُوَ فِي قُبَّةٍ لَهُ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ – قَالَ: فَخَرَجَ بِلالٌ بِوَضُوءٍ، فَمِنْ نَاضِحٍ وَنَائِلٍ: فَخَرَجَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ سَاقَيْهِ، قَالَ: فَتَوَضَّأَ وَأَذَّنَ بِلالٌ، قَالَ: فَجَعَلْتُ أَتَتَبَّعُ فَاهُ هَهُنَا وَهَهُنَا، يَقُولُ يَمِيناً وَشِمَالاً: حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ، ثُمَّ رُكِزَتْ لَهُ عَنَزَةٌ، فَتَقَدَّمَ وَصَلَّى الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ لم يَزَلْ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَدِينَةِ))[٢].

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە ناوی وەهبی کوڕی عەبدوڵڵای سوائیە دەڵێ: ((هاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)ئەو لە خێمەیەکی سووردابوو کە لە پێستەی خۆشکراو دروستکرابوو، دەڵێ: دەرچوو بیلال (ڕەزای خوای لێبێ) بە زیادەی ئاوی دەستنوێژەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، هەبوو ئاوەکەی دەپرژاند بەخۆیدا هەبوو دەیدا لەگیانی ئینجا پێغەمبەر (ﷺ)دەرچوو وە جلێکی سووری لە بەردابوو من سەیری سپیای لاقەکانی دەکرد: دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)دەستنوێژی گرت وە بیلال (ڕەزای خوای لێبێ) بانگی دا دەڵێ: من شوێنی دەمی بیلال (ڕەزای خوای لێبێ) دەکەوتم کە

١ البخاري (٦٠٥) مسلم (٣٧٨)

٢ البخاري (١٠٨٧) مسلم (٥٠٣)

ئاوڕی بەلای ڕاستو چەپدا دەدایەوە کە دەیوت، حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ، پاشان ڕمێك یان (نەقیزەیەکیان) بۆ چەقاند ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) پێش کەوت نوێژی نیوەڕۆی کرد بە دوو ڕکات، پاشان بەبەردەوامی نوێژی بە دوو ڕکات دەکرد هەتا گەڕایەوە بۆ مەدینە)).

تێبینی وەرگێڕ: پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە دوو ڕکات نوێژی دەکرد چونکە لە سەفەردا بوو وە تەبەڕوك بەس تایبەتە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ)بۆ هیچ کەسێکی تر درووست نییە بەڵکو حەرامە وە ئەو پۆشاکەی پێغەمبەر(ﷺ)لەبەریدا بوو سووری سادە نەبوو بەڵکوو هەروەك (ابن القیم) دەفەرمووێ سوور وڕەش تێکەڵ بوو چونکە پێغەمبەر(ﷺ)خۆی قەدەغەی کردووە لەبەر کردنی جلی سووری سادە بۆ پیاوان.

٦٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم أنَّهُ قَالَ: ((إنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ)) [1].

واتە:لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((بیلال بەشەو بانگ دەدات، بخۆن هەتا کوڕەکەی ئوم مەکتوم واتە (عەبدوڵڵا) بانگ دەدا)).

٦٤ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((إذَا سَمِعْتُمْ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ)) [2].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێك گوێتان لە بانگ بێژ بوو بڵێن بە وێنەی ئەوەی کە ئەو دەیڵێ)).

---

١ البخاري (٦١٧) مسلم (١٠٩٢)

٢ البخاري (٦١١) مسلم (٣٨٣)

## بـابُ استقبال القبلة بەشی ڕووکردنە ڕووگە

٦٥- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم كَانَ يُسَبِّحُ عَلَى ظَهْرِ رَاحِلَتِهِ، حَيْثُ كَانَ وَجْهُهُ، يُومِئُ بِرَأْسِهِ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ)) [1].

واتە:لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) : ((کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی سونەتی دەکرد لەسەر پشتی سوارەکەی، ڕووی لەهەر کوێ بوایە، ئیشارەتی بەسەری دەکرد، وە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) وای دەکرد)).

وَفِي رِوَايَةٍ: ((كَانَ يُوتِرُ عَلَى بَعِيرِهِ)).

وە لەدەربڕینێکی تردا ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی وەتری لەسەر وشترەکەی دەکرد)).

وَلِمُسْلِمٍ: ((غَيْرَ أَنَّهُ لا يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ)) [2].

وە لە دەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا مسلیم ((جگە لەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)نوێژە فەرزەکانی لەسەر سوارەکەی نەدەکرد)).

وَلِلْبُخَارِيِّ: ((إلاَّ الْفَرَائِضَ)) [3].

وە لە دەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا بوخاری ((پێغەمبەری خوا (ﷺ)نوێژی لەسەر سوارەکەی کردووە جگە لە نوێژە فەرزەکان)).

---

١ البخاري (١١٠٥) واللفظ له ـ مسلم (٣٧/٧٠٠)

٢ مسلم (٣٩/٧٠٠)

٣ البخاري (١٠٩٧)

٦٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((بَيْنَمَا النَّاسُ بِقُبَاءَ فِي صَلاةِ الصُّبْحِ إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ، فَقَالَ: إنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ، فَاسْتَقْبِلُوهَا. وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ، فَاسْتَدَارُوا إِلَى الْكَعْبَةِ)) [1].

واتە:لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((لە کاتێکدا خەڵك لە مزگەوتی قوباء لە نوێژی بەیانیدا بوون کە یەکێك هات بۆلایان وتی بێگومان پێغەمبەر (ﷺ)ئەمشەو قورئان دابەزیوەتە سەری وە فەرمانی پێکراوە ڕوو بکاتە ڕووگە ئێوەش ڕووی تێکەن. وە لەوکاتەدا ڕوویان لەشام بوو یەکسەر ڕوویان کردە کەعبە)).

٦٧ – عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: ((اسْتَقْبَلْنَا أَنَساً حِينَ قَدِمَ مِنْ الشَّامِ، فَلَقِينَاهُ بِعَيْنِ التَّمْرِ فَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي عَلَى حِمَارٍ، وَوَجْهُهُ مِنْ ذَا الْجَانِبِ – يَعْنِي عَنْ يَسَارِ الْقِبْلَةِ – فَقُلْتُ: رَأَيْتُكَ تُصَلِّي لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ؟ فَقَالَ: لَوْلا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَفْعَلُهُ مَا فَعَلْتُهُ)). [2]

واتە: لە ئەنەسی کوڕی سیرینەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێشوازیمان کرد لە ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێ) کاتێك کە گەڕایەوە لە شام، پێی گەیشتین لە عَيْنِ التَّمْرِ (شارێکە لە سنوری عێراق خورمای زۆرە)، دیم نوێژی دەکرد لەسەر گوێدرێژێك، ڕووی لەلایەکی تر بوو - واتە ڕووی لای چەپی ڕووگە بوو، پێم ووت تۆم دی نوێژت کرد جگە لە ڕووگە؟ وتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەدیایە کە وای کردووە وام نەدەکرد)).

---

[1] البخاري (٤٤٩١) مسلم (٥٢٦)

[2] البخاري (١١٠٠) مسلم (٧٠٢)

## بابُ الصُّفوفِ - بەشی ڕیزەکان

٦٨ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضـي الله عنـه – قَـالَ: قَـالَ رَسُولُ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسلم: ((سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمَامِ الصَّلاةِ)) [1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ڕیزەکانتان ڕێکبخەنەوە، چونکە ڕێکی ڕیزەکان لە تەواوی نوێژە)).

٦٩ – عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنهما، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسلم يَقُولُ: ((لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ)) [2].

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: : گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((ڕیزەکانتان ڕێك دەکەنەوە یان خوای گەورە جیاوازی دەخاتە نێوان ڕووەکانتانەوە)).

وَلِمُسْلِمٍ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يُسَوِّي صُفُوفَنَا، حَتَّى كَأَنَّمَا يُسَوِّي بِهَا الْقِدَاحَ، حَتَّى إذَا رَأَى أَنْ قَدْ عَقَلْنَا عَنْهُ، ثُمَّ خَرَجَ يَوْمًا فَقَامَ، حَتَّـى إذَا كَـادَ أَنْ يُكَبِّـرَ، فَـرَأَى رَجُـلاً بَادِيـاً صَـدْرُهُ، فَقَـالَ: عِبَـادَ اللهِ، لَتُـسَوُّنَّ صُـفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَـالِفَنَّ اللهُ بَـيْنَ وُجُوهِكُمْ)) [3].

وە لە دەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا موسـلیم ((پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕیزەکـانی ڕێك دەکردینەوە هەروەکو بڵێیت ڕمی پێ ڕێك دەکرد هەتا کاتێك زانی ئێمە لێوەی فێـر بووین، پاشان ڕۆژێکیان دەرچوو وەستا، هـەتا نزیـك بـوو نوێـژ دابەسـتێ، دی پیاوێـك

---

١ البخاري (٧٣٣) مسلم (٤٣٣)

٢ متفق عليه ـ البخاري (٧١٧) مسلم ( ٤٣٦)

٣ مسلم (٤٣٦/١٢٨)

سنگی دەرچوو بوو، پێغەمبەری (ﷺ)فەرمووی، ئەی بەندەکانی خوا ڕیزەکانتـان ڕێـك دەکەنەوە یان خوای گەورە جیاوازی دەخاتە نێوان ڕووەکانتانەوە)).

٧٠ – عَنْ أنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ – رضـي الله عنـه –: ((أنَّ جَدَّتَـهُ مُلَيْكَـةَ دَعَـتْ رَسُـولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ له، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَـالَ: قُومُـوا فَلأُصَـلِّيَ لَكُـمْ: قَـالَ أَنَسٌ: فَقُمْتُ إلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدْ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ، فَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَصَفَفْتُ أَنَـا وَالْيَتِـيمُ وَرَاءَهُ، وَالْعَجُـوزُ مِـنْ وَرَائِنَـا. فَـصَلَّى لَنَـا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ))[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێ) کە مولەیکـەی نـەنکی بانگێـشتی پێغەمبەری (ﷺ)کرد بـۆ خواردنێـك کـە بـۆی درووسـت کردبـوو پێغەمبـەر (ﷺ) لێـی خوارد پاشان فەرمووی: هەستن بانوێژتان بۆ بکەم ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵـێ: هەستام بۆلای حەسیرێکی ئێمـە لەبـەر کـۆنی ڕەش دا گـەڕابوو ئاوڕشـێنم کـرد بـە ئـاو پێغەمبـەر (ﷺ) چـووە سـەری مـن و منـداڵێکی بێبـاوك لـە دوایـەوە ڕیزبـووین، پیرێژنەکـەش لەدوامانـەوە بـوو پێغەمبـەر (ﷺ)دوو ڕکـات نوێـژی بـۆ کـردین پاشـان ڕۆشت)).

وَلِمُسْلِمٍ ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم صَلَّى بِـهِ وَبِأُمِّـهِ فَأَقَـامَنِي عَـنْ يَمِينِـهِ، وَأَقَامَ الْمَرْأَةَ خَلْفَنَا))[2].

وە لە دەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا موسلیم ((کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بۆ خۆی ((ئەنەسی کوڕی مالیك)) و دایکی کرد دەڵێ: منی لای ڕاسـتی خۆیـەوە وەسـتاند وە ئافرەتەکەش لەدوامانەوە)).

---

١ البخاري (٣٨٠) مسلم (٦٥٨)

٢ مسلم (٦٦٠/٢٦٩)

اليتيمُ: ضُميرة جدُّ حسين بن عبد اللهِ بن ضميرة.

منداڵه بێباوكەكه ناوى ضُميرة بوو كه باپيرى حسين بن عبد اللهِ بن ضميرة.

٧١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: قَالَ: ((بِتُّ عِنْـدَ خَـالَتِي مَيْمُونَـةَ. فَقَـامَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ. فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ. فَأَخَذَ بِرَأْسِـي فَأَقَـامَنِي عَنْ يَمِينِهِ))[1].

واته: له عەبدوڵلاى كوڕى عەباسەوه (ڕەزاى خوايـان لـێبێ) دەڵـێ: ((شـەو مامـەوه لاى پـوره مەيمونـەم (ڕەزاى خـواى لـێبێ) (كـه خێزانـى پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) بـوو) پێغەمبەر (ﷺ) شەو هەستا شەو نوێژى كرد منيش هەستام لـەلاى چـەپيەوه وەسـتام سەرى گرتمو لەلاى ڕاستيەوه وەستاندمى)).

١ البخاري (٦٣١٦) مسلم (٧٦٣)

## بابُ الإمامةِ - بەشی پێشنوێژی

٧٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((أَمَا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، أَوْ يَجْعَلَ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ؟)) [1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئـەویش لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئایە ناترسێ ئەو کەسەی سەر بەرز دەکاتـەوە پـێش ئیمـام کـە خـوای گەورە سەری بگۆڕێ بۆ سەری گوێ درێژ، یـاخود شـێوەی بخاتـە سـەر شـێوەی گـوێ درێژێك؟)).

٧٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ. فَلا تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ. فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا. وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا. وَإِذَا صَلَّى جَالِساً فَصَلُّوا جُلُوساً أَجْمَعُونَ)) [2].

واتە: لە ئەبەهورەیرەوە (ڕەزای خوای لـێبێ) ئـەویش لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی ((بۆیە ئیمام دانراوە بۆ ئەوەی شوێنی بکـەون، جیـوازی لەسـەر دروسـت مەکەن (واتە نە پێشیبکەون نـە دوا) کاتێـك وتـی اللـە أکـبر ئێـوە بڵـێن اللـە أکـبر، وە کاتێك چەمایەوە بچەمێنەوە، وە کاتێـك وتـی سَـمِعَ اللَّـهُ لِمَنْ حَمِـدَهُ، بڵـێن، رَبَّنَـا وَلَـكَ الْحَمْدُ. وەکاتێك کڕنووشی برد کڕنووش بەرن، وە کاتێك نوێـژی بـە دانیـشتنانەوە کـرد ئەوا هەمووتان نوێژ بە دانیشتنانەوە بکەن)).

---

١ البخاري (٦٩١) مسلم (٤٢٧)

٢ البخاري (٧٢٢) (٧٣٤) مسلم (٤١٤)

٧٤ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي بَيْتِهِ وَهُوَ شَاكٍ، فصَلَّى جَالِساً، وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَاماً، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ: أَنْ اجْلِسُوا لَمَّا انْصَرَفَ قَالَ إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا صَلَّى جَالِساً فَصَلُّوا جُلُوساً أَجْمَعُونَ))[1].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ)نەخۆش بوو نوێژی لە ماڵەکەی خۆیدا بە دانیشتنانەوە کرد، وە خەڵکیش نوێژیان کرد لە دوایەوە بەپێوە ئامارەی بۆ کردن کە دانیشن، کاتێك کە سەلامی دایەوە فەرمووی، بۆیە ئیمام دانراوە بۆ ئەوەی شوێنی بکەون، کاتێك چەمایەوە بچەمێنەوە، هەروەها کاتێك بەرزبووەوە بەرزببنەوە، وە کاتێك وتی سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، بلێن، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. وەکاتێك کڕنووشی برد کڕنووش بەرن، وە کاتێك نوێژی بە دانیشتنانەوە کرد ئەوا هەمووتان نوێژ بە دانیشتنانەوە بکەن)).

٧٥ـ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ الخَطْمِيِّ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: حَدَّثَنِي البَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ ـ وَهُوَ غَيْرُ كَذُوبٍ ـ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ: لَمْ يَحْنِ أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ حَتَّى يَقَعَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم سَاجِدًا، ثُمَّ نَقَعُ سُجُودًا بَعْدَهُ))[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی خەطمی ئەنصاریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: قسەی بۆ کردم بەرائی کوڕی عازب (ڕەزای خوای لێبێ) وە ئەو درۆزن نییە ـ وتی ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك دەیوت: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ: کەس لە ئێمە پشتی

---

١ البخاري (١١١٣) مسلم (٤١٢)

٢ البخاري (٨١١) مسلم (٤٧٤)

نەدەچەمانەوە هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) كڕنووشی دەبرد، پاشان دوای ئەو كڕنوشمان دەبرد)).

٧٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلائِكَةِ: غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ))[1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((كاتێك ئیمام ئامینی كرد ئێوەش بیكەن، چونكە هەر كەسێك ئامینەكەی لەگەڵ ئامینی فریشتەكاندا یەك بگرێت ئەوا خوا لە تاوانەكانی ڕابردووی خۆش دەبێت)).

٧٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَذَا الْحَاجَةِ، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ))[2].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((كاتێك یەكێك لە ئێوە نوێژی بۆ خەڵك كرد ئەوا بانوێژەكەی كورت بێت، چونكە لاوازو نەخۆشو خاوەن كاریان تێدایە، وە كاتێك یەكێك لە ئێوە نوێژی بۆ خۆی كرد با درێژی بكاتەوە بە ئارەزووی خۆی)).

٧٨ – عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: إِنِّي لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاةِ الصُّبْحِ مِنْ أَجْلِ فُلانٍ، مِمَّا يُطِيلُ بِنَا، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم غَضِبَ فِي مَوْعِظَةٍ قَطُّ أَشَدَّ مِمَّا غَضِبَ

---

١ البخاري (٧٨٠) (٦٤٠٢) مسلم (٤٠٩) (٤١٠)

٢ البخاري (٧٠٣) مسلم (٤٦٧)

يَوْمَئِذٍ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ أَمَّ النَّاسَ فَلْيُوجِزْ، فَإِنَّ مِنْ وَرَائِهِ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ))[1].

واته: له ئه‌بو مه‌سعودی ئه‌نصاریه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ: ((پیاوێك هاته خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) وتی من دوا ده‌كه‌وم له نوێژی به‌یانی له‌به‌ر فلأنه كه‌س چونكه درێژی ده‌كاته‌وه، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) تووڕه بوو له‌وڕۆژه‌دا كه هه‌رگیز به وێنه‌ی ئه‌و ڕۆژه نه‌م بینی بوو تووڕه ببێت له ئامۆژگاریكردنیدا، ئینجا فه‌رمووی: ئه‌ی خه‌ڵكینه بێگومان كه‌سانێكتان خه‌ڵك ڕاوده‌نێن، هه‌ركه‌سێك له ئێوه ئیمامه‌ت بۆ خه‌ڵك ده‌كات با كورت بێت چونكه پیرو لاوازو خاوه‌ن كار له پشتێوه‌یه‌تی)).

---

١ البخاري (٧١٥٩) مسلم (٤٦٦)

**بابُ صفةِ صلاةِ النبيِّ صلَّى الله عليه وسلم- بەشی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر (ﷺ)**

٧٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلاةِ سَكَتَ هُنَيْهَةً قَبْلَ أَنْ يَقْرَأَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، أَرَأَيْتُ سُكُوتَكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ: مَا تَقُولُ؟ قَالَ: أَقُولُ: اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ. اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنْ الدَّنَسِ. اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ)) [١].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك بیوتایە الله أكبر لە نوێژدا کەمێك بێدەنگ دەبوو پێش ئەوەی قورئان بخوێنێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بە دایکو باوکمەوە بەقوربانتبم هەواڵم بەرێ سەبارەت بەبێدەنگ بوونت لە نێوان الله أكبر و قورئان خوێندندا چی دەڵێ:یت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەڵێ:م ((پەروەردگارا نێوان من و تاوانەکانم دوور بخەرەوە هەروەك نێوان خۆر هەڵات خۆر ئاوات دوور خستۆتەوە، پەروەردگارا خاوێنم بکەرەوە لە تاوانەکانم هەروەك پۆشاکی سپی پاك دەکرێتەوە لە پیسی، پەروەردگارا بمشۆرەوە لە تاوانەکانم بە ئاوو بەفرو تەرزە)).

٨٠ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَسْتَفْتِحُ الصَّلاةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالْقِرَاءَةَ بِـ " الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ " وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِماً، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ السَّجْدَةِ لَمْ يَسْجُدْ، حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِداً، وَكَانَ يَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ التَّحِيَّةَ، وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ

---

١ البخاري (٧٤٤) مسلم (٥٩٨)

الـشَّيْطَانِ، وَيَنْهَـى أَنْ يَفْتَـرِشَ الرَّجُـلُ ذِرَاعَيْـهِ افْتِـرَاشَ الـسَّبُعِ، وَكَـانَ يَخْـتِمُ الـصَّلاةَ بِالتَّسْلِيمِ))[١] .

واتـه: لـه دايكمـان عائيـشەوە (ڕەزاى خـواى لـێبێ) دەڵـێ: ((پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ)نوێژى دەست پێدەكرد بەوتنى الله أكبر، وە بەخوێندنى "الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ" وە كاتێك بچوايەتە ڕكوع سـەرى بـەرز نـەدەكردەوە وە داشـى نەدەنەواند بـەڵكو لـە نێوانياندا بوو واتـە (ڕێكـى پـشتى بـوو) وە كاتێـك سـەرى بـەرز دەكـردەوە لـە ڕكـوع كڕنوشى نەدەبرد هەتا ڕێك نەوەستايە، وە كاتێك سـەرى بـەرز دەكـردەوە لـە كڕنـوش كڕنوشـى نـەدەبرد، هـەتا ڕێـك دادەنيـشت، وە لـە هـەموو دوو ڕكاتێكـدا تـەحياتى دەخوێند، وە قاچى چەپى دادەخست ئينجا قاچى ڕاستى دەچەقاند، وە ڕێگرى دەكرد لە دانيشتنى شەيطان (عُقْبَةِ الشَّيْطَانِ) بريتييە لەوەى هەردوو قاچى داخـات وە لەسـەر سمتى دابنيشێت) وە ڕێگرى دەكرد كە نوێژخوێن هەردوو دەستى داخـات وەك ئـاژەڵى دڕندە، وە نوێژى تەواو دەكرد بەسەلام دانەوە)).

٨١ – عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ إذَا افْتَتَحَ الصَّلاةَ، وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ، وَإِذَا رَفَـعَ رَأْسَـهُ مِـنْ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ، وَقَالَ: سَمِعَ اللَّـهُ لِمَـنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَـا وَلَـكَ الْحَمْـدُ. وَكَـانَ لا يَفْعَلُ ذَلِـكَ فِـي السُّجُودِ))[٢] .

واتە: لە عەبدوڵلاى كـوڕى عومـەرەوە (ڕەزاى خوايـان لـێبێ) دەڵـێ: (( پێغەمبـەر (ﷺ)كاتێك كە نوێژى دەكرد دەستەكانى بەرز دەكردەوە هـەتا ئاسـتى شـانەكانى، وە كاتێكيش كە الله أكبر بۆ ڕكوع دەكرد، وە كاتێكيش سەرى بـەرز دەكـردەوە لـە ڕكـوع بەهەمان شێوە بەرزى دەكردنەوە، وە لەچوونە كڕنوش واى نەدەكرد)).

---

١ مسلم (٤٩٨) ولم يوجد عند البخاري هذا اللفظ

٢ البخاري (٧٣٥) (٧٣٨) مسلم (٣٩٠)

٨٢ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: عَلَى الْجَبْهَةِ – وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى أَنْفِهِ – وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ)) [١] .

واته: له عهبدوڵلای كوڕی عهباسهوه (ڕهزای خوایان لێبێ) دهڵێ: پێغهمبهری خوا (ﷺ) فهرمووی: ((فهرمانم پێكراوه كه كڕنوش بهرم لهسهر حهوت ئێسك لهسهر ناوچهوان وه بهدهستی ئاماژهی كرد بۆ لوتی وه ههردوو دهست وه ههردوو ئهژنۆ وه لای قاچهكان)). (واته سهری پهنجهكان)

٨٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنْ الرُّكُوعِ، ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي صَلَاتِهِ كُلِّهَا، حَتَّى يَقْضِيَهَا، وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الثِّنْتَيْنِ بَعْدَ الْجُلُوسِ)) [٢] .

واته له ئهبوهورهیرهوه (ڕهزای خوای لێبێ) دهڵێ: پێغهمبهری خوا (ﷺ)كاتێك ههڵدهسا بۆ نوێژ ڕادهوهستا الله أكبرى دهكرد، پاشان الله أكبرى دهكرد كاتێك ڕكوعی دهبرد، پاشان دهیفهرموو: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، كاتێك پشتی بهرز دهكردهوه له ڕكوع دهیفهرموو: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، پاشان دادهبهزی بۆ كڕنوش الله أكبرى دهكرد، پاشان الله أكبرى دهكرد كاتێك سهری بهرز دهكردهوه له كڕنوش، پاشان الله أكبرى دهكرد كاتێك كاتێك كه كڕنوشی دووهمی دهبرد، پاشان الله أكبرى دهكرد كاتێك سهری بهرز دهكردهوه، ئینجا وای دهكرد لهههموو نوێژهكهیدا ههتا تهواوی دهكرد، وه الله أكبرى دهكرد كاتێك ههڵدهسایهوه له ڕكاتی دووهم دوای تهحیات)).

---

١ البخاري (٨٠٩) (٨١٢) مسلم (٢٣٠/٤٩٠)

٢ البخاري (٧٨٩) مسلم (٢٨/٣٩٢)

٨٤ – عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: ((صَلَّيْتُ أَنَا وَعِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ خَلْفَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ. فَكَانَ إِذَا سَجَدَ كَبَّرَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ كَبَّرَ، وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاةَ أَخَذَ بِيَدِي عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ، فَقَالَ: قَدْ ذَكَّرَنِي هَذَا صَلاةَ مُحَمَّدٍ صلَّى الله عليه وسلم – أَوْ قَالَ: صَلَّى بِنَا صَلاةَ مُحَمَّدٍ – صلَّى الله عليه وسلم))[1].

واته: له موطەریفی کوڕی عەبدوللای کوڕی شخیرەوه دەڵێ: ((نوێژم کرد لەپشت عەلی کوڕی ئەبو طالبەوه (ڕەزای خوای لێبێ) من و عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێبێ) کاتێك کە کڕنوشی دەبرد الله أکبری دەکرد، وه کاتێك سەری بەرز دەکردەوه الله أکبری دەکرد، وه کاتێك هەڵدەسایەوه لە ڕکاتی دووەم الله أکبری دەکرد، کاتێك کەنوێژەکەی تەواو کرد عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێبێ) دەستی گرتم وتی، بێگومان ئەوه نوێژی موحەمەدی (ﷺ) بیر خستمەوه یان وتی نوێژی بۆ کردین وەك نوێژەکە موحەمەد (ﷺ))).

٨٥ – عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((رَمَقْتُ الصَّلاةَ مَعَ مُحَمَّدٍ صلَّى الله عليه وسلم فَوَجَدْتُ قِيَامَهُ، فَرَكْعَتَهُ فَاعْتِدَالَهُ بَعْدَ رُكُوعِهِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، فَسَجْدَتَهُ فَجَلْسَتَهُ مَا بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالانْصِرَافِ: قَرِيباً مِنْ السَّوَاءِ))[2].

واته: له بەڕائی کوڕی عازبەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ووردبوومەوه لە نوێژ لەگەڵ موحەمەددا (ﷺ) سەیرم کرد وەستانەکەی‌و ڕکوعەکەی‌و هەستانەوەی لەدوای ڕکوعەکەی‌و کڕنوشەکەی‌و دانیشتنەکەی لەنێوان هەردوو کڕنوشەکەیداو کڕنوشەکەی‌و دانیشتنەکەی لە نێوان سەلام دانەوەو ڕووکردنە خەڵك: نزیك بوو لەیەکەوه)).

وَفِي رِوَايَةِ الْبُخَارِيِّ ((مَا خَلا الْقِيَامَ وَالْقُعُودَ قَرِيباً مِنْ السَّوَاءِ)).

وەلە دەربڕینێکدا لەلای پێشەوا بوخاری ((جگە لە قورئان خوێندنەکەیو تەحیاتەکەی نزیك بوون لەیەکەوه)).

---

١ البخاري (٧٦٨) مسلم (٣٩٣)

٢ البخاري (٧٩٢) (٨٠١) (٨٢٠) مسلم (٤٧١) واللفظ له

٨٦ – عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((إِنِّي لا آلُو أَنْ أُصَلِّيَ بِكُمْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي بِنَا قَالَ ثَابِتٌ فَكَانَ أَنَسٌ يَصْنَعُ شَيْئاً لا أَرَاكُمْ تَصْنَعُونَهُ. كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ: انْتَصَبَ قَائِماً، حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: قَدْ نَسِيَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ السَّجْدَةِ: مَكَثَ، حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: قَدْ نَسِيَ)) [١].

واتـە: لـە ثـابـتی بونیانیـەوە (ڕەحمـەتی خـوای لـێبێ) ئـەویش لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە (ڕەزای خـوای لـێبێ) دەڵـێ: ((بەکـەمی نـازانمو کـەم تەرخـەمی ناکـەم کـە نوێژێکتان بۆ بکەم هەروەك

پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی بۆ ئێمە کردووە ثابت دەڵـێ: ئـەنس شـتێکی دەکرد نـابینم ئێـوە بیکـەن کاتێـك سـەری بـەرز دەکـردەوە لـە ڕکـوع ڕێـك ڕادەوەسـتا هـەتا بێژەرێك دەیوت بیری چۆتەوە بچێتە کڕنـوش وە کاتێـك سـەری بـەرز دەکـردەوە لـە کڕنوش، دەمایەوە، هەتا بێژەرێك دەیوت بیری چۆتەوە بچێتەوە کڕنوش)).

٨٧ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((مَا صَلَّيْتُ وَرَاءَ إِمَامٍ قَطُّ أَخَفَّ صَلاةً. وَلا أَتَمَّ صَلاةً مِنَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم)) [٢].

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە (ڕەزای خـوای لێبێ) دەڵـێ: ((هـەرگیز نوێـژم نـەکردووە لـەدوای هـیچ ئیمامێکـەوە کـەمترین و تـەواو تـرین نوێـژ بێـت لـە نوێـژی پێغەمبەری خوا(ﷺ))).

٨٨ – عَنْ أَبِي قِلابَةَ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ الْجَرْمِيِّ الْبَصْرِيِّ – قَالَ: ((جَاءَنَا مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ فِي مَسْجِدِنَا هَذَا، فَقَالَ: إِنِّي لأُصَلِّي بِكُمْ، وَمَا أُرِيدُ الصَّلاةَ، أُصَلِّي كَيْفَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي، فَقُلْتُ لأَبِي قِلابَةَ: كَيْفَ كَانَ يُصَلِّي؟ فَقَالَ: مِثْلَ صَلاةِ شَيْخِنَا هَذَا، وَكَانَ يَجْلِسُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ السُّجُودِ قَبْلَ أَنْ يَنْهَضَ)) [٣].

---

١ البخاري (٨٠٠) (٨٢١) مسلم (٤٧٢)

٢ البخاري (٧٠٨) مسلم (١٩٠/٤٦٩) واللفظ له

٣ البخاري (٦٧٧) (٨٢٤) مسلم (٣٩١)

واته: له ئه‌بو قیلابه‌وه (ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێ) كـه نـاوی عه‌بـدوڵڵای كـوڕی زه‌یـدی جه‌رمی به‌صرییه ـ ده‌ڵێ: ((مـالیكی كـوڕی حـوه‌یریـث (ڕه‌زای خـوای لـێبێ) هـات بـۆ لامان بۆ ئه‌م مزگه‌وته‌مان، وتی من نوێژتان بۆ ده‌كـه‌م، وه مه‌به‌سـتم نوێـژ كـردن نیـیـه (به‌ڵكو مه‌به‌ستی فێركردن بوو)، نوێـژ ده‌كـه‌م هـه‌روه‌ك چـۆن پێغه‌مبـه‌ری خـوام(ﷺ) دیـوه نوێـژی ده‌كـرد ئـه‌بو ئـه‌یوبی سـه‌ختیانی ده‌ڵـێ: (ڕه‌حمـه‌تی خـوای لـێبێ) كـه گێـڕه‌ڕه‌وه‌ی فه‌رمووده‌كه‌یـه وتم بـه ئـه‌بو قیلابـه (ڕه‌حمـه‌تی خـوای لـێبێ) چـۆن پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) نوێژی ده‌كرد؟ وتی وێنه‌ی نوێژی ئه‌و شێخه‌مان، (مه‌به‌ستی به‌و شێخه ئه‌بو یه‌زید بوو كه ناوی عه‌مری كوڕی سه‌له‌مه‌ی جه‌رمییه) كه داده‌نیشت كاتێك سه‌ری به‌رز ده‌كرده‌وه له كڕنوش پێش ئه‌وه‌ی كه هه‌ستێته‌وه)).

٨٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَالِكٍ بْنِ بُحَيْنَةَ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ إذَا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ، حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إبْطَيْهِ)) [١].

واته: له عه‌بدوڵڵای كـوڕی مـالیكی كـوڕی بوحه‌ینـه‌وه (ڕه‌زای خـوای لـێبێ) ده‌ڵـێ: ((كـه پێغه‌مبـه‌ر(ﷺ)كاتێـك نوێـژی ده‌كـرد نێـوان هـه‌ردوو ده‌سـتی ده‌كـرده‌وه، هـه‌تا سپیاوی بن باڵی ده‌رده‌كه‌وت)).

تێبـینی وه‌رگێـڕ: ئـه‌و ده‌سـت بلاوكردنـه‌وه‌ی پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ)لـه كڕنوشـدا بـوو، پێویسته نوێژ خوێن ئاگای له برا نوێژ خوێنه‌كه‌ی ته‌نیشتی بێت ئه‌گه‌ر ده‌ستی كرده‌وه ئه‌وه‌نده بیكاته‌وه كه‌كه‌س بێتاقه‌ت نه‌كات.

٩٠ – عَنْ أَبِي مَسْلَمَةَ سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: ((سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: أَكَانَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ)) [٢].

---

١ البخاري (٣٩٠) مسلم (٤٩٥)

٢ البخاري (٣٨٦) مسلم (٥٥٥)

واته: له ئـهبو سـهلهمهوه (ڕهزای خـوای لـێبێ) کـه نـاوی سـهعیدی کـوڕی یهزیـده دهڵێ: ((پرسیارم کرد لـه ئهنهسـی کـوڕی مالیـك (ڕهزای خـوای لـێبێ) ئایـا پێغهمبـهر (ﷺ) بهنهعلهکانیوه نوێژی دهکرد؟ وتی بهڵێ)).

٩١ – عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَلأَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا)) [1].

واتـه: لـه ئهبوقـهتادهوه (ڕهزای خـوای لـێبێ) دهڵـێ: ((کـه پێغهمبـهری خـوا (ﷺ)نوێژی دهکرد وه ئومامهی کچی زهینـهبی هـهڵگرتبوو کـه کـچی زهینـهبی کـچی پێغهمبهری خوا(ﷺ)بوو (ڕهزای خوای لێبێ) کهلـه ـ أَبِـي الْعَـاصِ بْـنِ الرَّبِيـعِ بْـنِ عَبْـدِ شَمْسٍ بوو، (واته أَبِي الْعَاصِ بْـنِ الرَّبِيـعِ بْـنِ عَبْـدِ شَـمْسٍ مێـردی زهینـهب بـوو) کاتێـك کڕنوشی دهبرد دایدهنا وه کاتێك ههستایهتهوه ههڵی دهگرت)).

٩٢ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِـيِّ صلَّى الله عليـه وسـلم قَـالَ: ((اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ وَلا يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ)) [2].

واتـه: لـه ئهنهسـی کـوڕی مالیکـهوه (ڕهزای خـوای لـێبێ) ئـهویش لـه پێغهمبـهری خواوه(ﷺ)فهرموویهتی: ((له کڕنوشدا ڕێك و ڕاست بن، بـا کـهس لـه ئێـوه قۆڵـهکانی ڕانهخات وهك چۆن سهگ ڕایدهخات)).

١ البخاري (٥١٦) (٥٩٩٦) مسلم (٥٤٣)

٢ البخاري (٨٢٢) مسلم (٤٩٣)

## بابُ وجوب الطمأنينة في الركوع والسجود- بەشى واجبى ئارامى لە ڕكوع وكڕنوشدا

٩٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّك لَمْ تُصَلِّ. فَرَجَعَ فَصَلَّى كَمَا صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّك لَمْ تُصَلِّ – ثَلاثاً – فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ، فَعَلِّمْنِي، فَقَالَ: إذَا قُمْتَ إلَى الصَّلاةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعاً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِماً، ثُمَّ اُسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِساً. وَافْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاتِكَ كُلِّهَا))[1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مزگەوتەوە، وە پیاوێکیش هات نوێژی کرد، پاشان هات سەلامی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ)پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: بڕۆ نوێژ بکە چونکە تۆ نوێژت نەکرد گەڕایەوە نوێژی کرد پاشان هات سەلامی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ نوێژ بکە چونکە تۆ نوێژت نەکرد، سێ جار، وتی سوێند بەو کەسەی کەتۆی ناردووە بە ڕاست، لەوە باشتر نازانم فێرم بکە ـ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کاتێك هەستای بۆ نوێژ کردن الله أكبر بکە پاشان بخوێنە ئەوەی دەیزانی لە قورئان، پاشان ڕکوع بەرە هەتا ئارام دەبیت لە ڕکوعدا، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە هەتا ڕێك ڕادەوەستیت، پاشان کڕنوش بەرە هەتا ئارام دەبیت لە کڕنوشدا، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە هەتا بەئارامی دادەنیشیت، بەو شێوەیە بکە لە هەموو نوێژەکەدتدا)).

تێبینی وەرگێڕ: پێغەمبەر (ﷺ)کە فەرمووی: کاتێك هەستای بۆ نوێژ کردن الله أكبر بکە پاشان بخوێنە ئەوەی دەیزانی لە قورئان، زانایان دەفەرموون دوای خوێندنی

---

١ البخاري (٧٩٣) مسلم (٣٩٧) وقد جمع المؤلف بين لفظي البخاري و مسلم معا

سورەتی فاتیحە چونکە فاتیحە یەکێکە لە پایەکانی نوێژ پێویستە بخوێنرێت بەڵام ئەو کەسەی کە نایزانێت دەبێت لە باتی ئەو بڵێت ((سبحان الله، والحمد لله، ولا إلـه إلا الله، والله أكبر، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم)) هەتا فێر دەبێت کە فێر بوو واجبە لەسەری بیخوێنێت.

## بابُ القراءةِ في الصَّلاةِ - بەشی قورئان خوێندن له نوێژدا

٩٤ – عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ – رضي الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)) [١].

واته: له عوبادەی کوڕی صامتەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((نوێژ نییه بۆ ئەو کەسەی که سورەتی فاتیحه نەخوێنێت)).

٩٥ – عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ مِنْ صَلاةِ الظُّهْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ، وَيُسْمِعُنَا الآيَةَ أَحْيَاناً، وكَانَ يَقْرَأُ فِي الْعَصْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ وَفِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَابِ. وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مِنْ صَلاةِ الصُّبْحِ، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ)) [٢].

واته: له ئەبو قەتادەی ئەنصاریەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیفەتی وابوو له دوو ڕکاتی ئەوەڵدا له نوێژی نیوەڕۆدا سورەتی فاتیحەو دوو سورەتی تری دەخوێند، لە یەکەمدا درێژی دەکردەوه، وه لە دووەمدا کورتی دەکردەوه، وه جار جار ئایەتێکی دەدا بە گوێماندا، لە نوێژی عەسردا سورەتی فاتیحەو دوو سورەتی تری دەخوێند، له یەکەمدا درێژی دەکردەوه، وه لە دووەمدا کورتی دەکردەوه، وه له دوو ڕکاتی ئەخیردا سورەتی فاتیحەی دەخوێند، وه نوێژی بەیانی ڕکاتی یەکەمی درێژ دەکردەوه، وه دووەمی کورت دەکردەوه)).

---

١ البخاري (٧٥٦) مسلم (٣٩٤)

٢ البخاري (٧٥٩) (٧٦٢) (٧٧٦) (٧٧٨) (٧٧٩) مسلم (٤٥١)

٩٦ – عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ)) [١].

واته: له جوبەیری کوڕی مومطعیمەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: : ((گوێم له پێغەمبەر بوو(ﷺ) له نوێژی ئێوارەدا سورەتی الطُّورِ دەخوێند)).

٩٧– عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ فِي سَفَرٍ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ الآخِرَةَ، فَقَرَأَ فِي إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ فَمَا سَمِعْتُ أَحَداً أَحْسَنَ صَوْتاً أَوْ قِرَاءَةً مِنْهُ)) [٢].

واته: له بەڕائی کوڕی عازبەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەر (ﷺ)له سەفەرێکدا، نوێژی خەوتنانی کرد، لەیەکێك له دوو ڕکاتەکەدا سورەتی (التِّينِ وَالزَّيْتُونِ) خوێند گوێم له هیچ کەسێك نەبووە دەنگی لەو خۆشتر بێت یان خوێندنەکەی لەو جوانتر بێت)).

٩٨ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ فَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاتِهِمْ، فَيَخْتِمُ بـ " قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ " فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: سَلُوهُ لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ؟ فَسَأَلُوهُ. فَقَالَ: لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : أَخْبِرُوهُ: أَنَّ اللهَ تَعَالَى يُحِبُّهُ)) [٣].

واته: له دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی کرد بە فەرماندەی هێزێك ئەو پیاوە له پێش نوێژی هاوەڵەکانیدا که قورئانی

---

١ البخاري (٧٦٥) (٣٠٥٠) (٤٠٢٣) (٤٨٥٤) مسلم (٤٦٣)

٢ البخاري (٧٦٩) (٧٥٤٦) مسلم (٤٦٤/١٧٧)

٣ البخاري (٧٣٧٥) مسلم (٨١٣)

دهخوێند به " قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ " كۆتـايی پێـدهـهێنا كاتێـك كـه گهڕانـهوه ئـهوهيان لـه خزمهت پێغهمبهری خوادا (ﷺ) باس كرد پێغهمبهر (ﷺ)فهرمووی: پرسیاری لێبكـهن لهبـهر چـی وادهكـات؟ ئـهوانیش پرسـیاریان لێكـرد وتــی چـونكه سـيفهتی خـودای بهخشندهی بالآدهسته، منيش پـێم خۆشـه بيخـوێنم پێغهمبـهری خـوا (ﷺ)فـهرمووی هەواڵی بدەنێ، كه خودای بالآ دهستيش ئهوی خۆش دهوێت)).

٩٩- عَنْ جَابِرِ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله صلَّى الله عليه وسلم قَالَ لِمُعَاذٍ: ((فَلَوْلا صَلَّيْتَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأعْلَى، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى فَإِنَّـهُ يُـصَلِّي وَرَاءَكَ الْكَبِيرُ وَالضَّعِيفُ وَذُو الْحَاجَةِ)) [١].

واته: لـه جـابرهوه (ڕهزای خـوای لـێبێ) دهڵـێ: ((پێغهمبـهری خـوا (ﷺ) وتــی بـه موعاذ (ڕهزای خوای لێبێ) خۆزگايـه نوێـژت دهخوێنـد بـه - سَـبِّحِ اسْـمَ رَبِّـكَ الأعْلَـى، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى - چونكه پيرو لاوازو خاوهن كار لـه دواتـهوه نوێـژ دهكهن))

تێبینی: ئهمه لهبهر ئهوه بوو موعاذ (ڕهزای خوای لێبێ) نوێژی زۆر درێژ دهكردهوه بۆيه

پێغهمبهری خوا (ﷺ) وای پێ فهرموو.

١٠٠ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ - رضي الله عنه -: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسـلم وَأَبَـا بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما: كَانُوا يَسْتَفْتِحُونَ الصَّلاةَ بِ " الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ")) [٢].

واته: له ئهنهسی كوڕی ماليكهوه (ڕهزای خوای لێبێ) دهڵـێ: ((پێغهمبـهرو (ﷺ) ئهبو بهكرو عومهر (ڕهزای خوايان لێبێ) نوێژيان دهست پێـدهكرد بـه " الْحَمْدُ لِلـهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ")).

---

١ البخاري (٧٠٥)

٢ البخاري (٧٣٤)

وَفِي رِوَايَةٍ: ((صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)) [١].

وه له دهربڕینێكی تردا ئهنهسی كوڕی مالیكهوه (ڕهزای خوای لێبێ) دهڵێ: ((نوێژم كرد ووه لهگهڵ ئهبو بهكرو عومهرو عوسمان، (ڕهزای خوایان لێبێ) گوێم لهكهسیان نه بوو(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بخوێنن)).

وَلِمُسْلِمٍ: ((صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ فَكَانُوا يَسْتَفْتِحُونَ بِ " الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ "، لا يَذْكُرُونَ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ فِي أَوَّلِ قِرَاءَةٍ وَلا فِي آخِرِهَا)) [٢].

وه له دهربڕینێكی تردا لهلای پێشهوا موسلیم ئهنهسی كوڕی مالیك (ڕهزای خوای لێبێ) دهڵێ: ((نوێژم كرد ووه لهدوای پێغهمبهرو(ﷺ) ئهبو بهكرو عومهرو عوسمان، (ڕهزای خوایان لێبێ) نوێژیان دهست پێدهكرد به " الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ "، وه (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) یان نهدهكرد نه لهسهرهتای قورئان خوێندنهوه وهنه له كۆتاییهوه)).

تێبینی وهرگێڕ: ههرسێ پێشهوا ئهبو حهنیفهو شافعی و ئهحمهد (ڕهحمهتی خوایان لێبێ) (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) به سونهتی دهزانن كه بخوێندرێت پێشهوا مالیك (ڕهحمهتی خوای لێبێ) دهفهرموێ خوێندنی دروست نییه وه زانایان جیاوازیان ههیه له دهنگ بهرزكردنهوه به (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) له نوێژدا پێشهوا شافعی (ڕهحمهتی خوای لێبێ) دهفهرموێ سونهته وه ههردوو پێشهوا ئهبو حهنیفهو ئهحمهد (ڕهحمهتی خوایان لێبێ) فهرموویانه دهبێت بهدهنگی نزم بخوێندرێت وه وتهی ڕاست دروست ئهوهیه كه بخوێندرێت به دهنگی نزم چونكه ئهو فهرموودانهی كهلهسهری هاتووه كه بهدهنگی بهرز بخوێندرێت ههموویان بێهێزن.

---

١ مسلم (٣٩٩)

٢ مسلم (٣٩٩/٥٢)

## بـابُ سجودِ السَّهو - بەشی سوجدەی سەهو

١٠١- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه - قَالَ: ((صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم إحْدَى صَلاتَيْ الْعَشِيِّ - قَالَ ابْنُ سِيرِينَ: وَسَمَّاهَا أَبُو هُرَيْرَةَ. وَلَكِنْ نَسِيتُ أَنَا - قَالَ: فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ. فَقَامَ إِلَى خَشَبَةٍ مَعْرُوضَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَاتَّكَأَ عَلَيْهَا كَأَنَّهُ غَضْبَانُ ووَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. وَخَرَجَتِ السَّرَعَانُ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ فَقَالُوا: قَصُرَتِ الصَّلاةُ؟ وَفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ - فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ. وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ فِي يَدَيْهِ طُولٌ، يُقَالُ لَهُ: ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَسِيتَ، أَمْ قَصُرَتِ الصَّلاةُ؟ قَالَ: لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تُقْصَرْ فَقَالَ: أَكَمَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟ قَالُوا: نَعَمْ. فَتَقَدَّمَ فَصَلَّى مَا تَرَكَ. ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ. ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَكَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ. ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ. فَرُبَّمَا سَأَلُوهُ: ثُمَّ سَلَّمَ؟ قَالَ: فَنُبِّئْتُ أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ))[١].

واتە:لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەویش لە ئەبوهوریرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژێکی دوای نیوەڕۆی بۆ کردین ((نیوەڕۆ یاخود عەسر)) موحەمەدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ئەبوهوریرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ناوی هێنا بەڵام من بیرم چوو، وتی نوێژی بۆ کردین دوو ڕکات، پاشان سەلامی دایەوە، هەستایە لای دارێکی دانراو لە مزگەوتدا شانی لەسەر دادا، هەروەك توڕە وابوو، ئینجا دەستی ڕاستی لەسەر چەپی دانا، وە پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا، ئینجا ئەوانەی پەلەیان بوو بۆ ڕۆیشتن دەرچوون لە دەرگاکانی مزگەوتەوە، وتیان ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە؟ وە ئەبو بەکرو عومەریش (ڕەزای خوایان لێبێ) لەناو خەڵکەکەدا بوون پێیان شەرم بوو قسە بکەن وە لەناو

١ البخاري (٤٨٢) مسلم (٥٧٣)

خەڵكەكەدا پياوێك هەبوو دەستەكانى درێژ بوو پێى دەوترا (ذو الْيَدَيْنِ) وتى ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ئايا نوێژ كورت بۆتەوە يان لەبيرت چوو؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووى: نە بيرم چووە نە كورتيش بۆتەوە، وە فەرمووى: ئايا وايە هەروەك ذُو الْيَدَيْنِ دەڵێ: وتيان بەڵێ، ئينجا چووە پێشەوە نوێژەكەى تەواو كرد، پاشان سەلامى دايەوە، پاشان الله أكبرى كرد، وە سوجدەى برد وێنەى سوجدەكەى، يان درێژ تر، پاشان سەرى بەرز كردەوەو وە الله أكبرى كرد پاشان الله أكبرى كردو، سوجدەى برد وێنەى سوجدەكەى، يان درێژ تر، پاشان سەرى بەرز كردەوەو الله أكبرى كرد، پرسياريان كرد لە ئەبوهورەيرە (ڕەزاى خواى لێبێ) پاشان سەلامى دايەوە؟ وتى هەواڵم پێدراوە كە عيمرانى كوڕى حوصەين (ڕەزاى خواى لێبێ) وتويەتى: پاشان سەلامى داوەتەوە)).

العَشِيُّ: الوقتُ مابينَ زوالِ الشمسِ وغروبِها.

العَشِيُّ: بريتييە لەنێوان لادانى خۆر لە ناوەڕاستى ئاسمان تا ئاوا بوون.

١٠٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُحَيْنَةَ - وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم صَلَّى بِهِمُ الظُّهْرَ فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، وَلَمْ يَجْلِسْ فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، حَتَّى إِذَا قَضَى الصَّلاةَ، وَانْتَظَرَ النَّاسُ تَسْلِيمَهُ: كَبَّرَ وَهُوَ جَالِسٌ. فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ ثُمَّ سَلَّمَ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵڵاى كوڕى بوحەينەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) كە لە هاوەڵانى پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) نوێژى نيوەڕۆى بۆ كردن هەستا لە ڕكاتى دووەمدا، دانەنيشت خەڵكەكەش لەگەڵيدا هەستان، هەتا نوێژى تەواو كرد، خەڵك چاوەڕوانى سەلام دانەوەيان دەكرد: الله أكبرى كرد ئەو دانيشتبوو، دوو سوجدەى برد پێش ئەوەى سەلام باتەوە پاشان سەلامى دايەوە)).

---

١ البخاري (١٢٢٤) مسلم (٥٧٣)

## بابُ المرورِ بينَ يديِ المصلي - بەشی ڕۆشتن بەبەردەم نوێژ خوێندا

١٠٣ – عَنْ أَبِي جُهَيْمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيْ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ مِنْ الإِثْمِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ)) [1] .

واته: له ئەبو جوهەیمی کوڕی حارثی صیمەی ئەنصاریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی: ((ئەگەر ئەوکەسەی بەبەردەم نوێژ خوێندا تێدەپەڕێ بیزانیایە چەند تاوانی لەسەرە ئەوا چل بوەستایە باشتربوو بۆی لەوەی بەبەردەمیدا تێپەڕێت)).

قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لا أَدْرِي: قَالَ أَرْبَعِينَ يَوْماً أَوْ شَهْراً أَوْ سَنَةً.

ئەبو نەضر دەڵێ: نازانم چل ڕۆژ یا چل مانگ یا چل ساڵی وت.

١٠٤ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((إذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنْ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ. فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ. فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ)) [2] .

واته: له ئەبو سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: ((کاتێك یەکێك لە ئێوەو نوێژی کرد ڕووەو بەر بەستێك بۆئەوەی بیپارێزێ لە خەڵك، وە یەکێك ویستی بەبەردەمیدا تێپەڕێ ئەوا باپاڵی پێوە بنێ ئەگەر ئینکاری کرد ئەوا با بجەنگێ لەگەڵیدا چونکە ئەوە شەیطانە)).

---

١ البخاري (٥١٠) مسلم (٥٠٧)

٢ البخاري (٥٠٩) (٣٢٧٤) مسلم (٥٠٥)

١٠٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((أَقْبَلْتُ رَاكِباً عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الاحْتِلامَ، وَرَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يُصَلِّي بِالنَّاسِ بِمِنًى إلَى غَيْرِ جِدَارٍ. مَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ فَنَزَلْتُ، فَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ. وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ)) [١].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ڕۆشتم بە سواری گوێدرێژێکی مێینە لەو ڕۆژەدا من نزیکی باڵغ بوون بوو بوومەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ)نوێژی بۆخەڵك دەکرد لە مینا بە بێ بەربەست، ڕۆشتم بە نێوان هەندێك لە ڕیزەکاندا دابەزیمو گوێدرێژەکەم نارد بۆ ئەوەی بلەوەڕێ ئینجا چوومە ڕیزەوە بەبێ ئەوەی کەکەس ئینکاریم لەسەر بکات)).

١٠٦ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَرِجْلايَ فِي قِبْلَتِهِ – فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي، فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ. فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا. وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ)) [٢].

واته: له دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((من دەخەوتم لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وە هەردوو قاچم لە شوێن سوجدەکەی ئەوەدابوو ـ کاتێك بیویستایە سوجدە بەرێ بە پەنجە تێوەی دەژەندم، هەردوو قاچم کۆ دەکردەوە، وە کاتێك هەستایەتەوە درێژم دەکردنەوە، ماڵەکان لەو ڕۆژەدا ڕۆشن کەرەوەی تێدانە بوو)).

---

١ البخاري (٧٦) (٤٩٣) (٨٦١) مسلم (٥٠٤)

٢ البخاري (٣٨٢) مسلم (٥١٢/٢٧٢)

## بابُ تحيَّة المسجد - بەشی سڵاوکردن لە مزگەوت

١٠٧ – عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الحَارِثِ بْنِ رِبْعِيٍّ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ صلَّى الله عليه وسلم: ((إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ))[1].

واتە: لە ئەبو قەتادەوە کە ناوی حارثی کوڕی ڕبعی ئەنصاریە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێک یەکێك لەئێوە هاتە مزگەوتەوە ئەوا با دانەنیشێت هەتا دوو ڕکات نوێژ دەکات)).

## بابُ النهي عن الكلام في الصلاة - بەشی قەدەغە کردنی قسە لە نوێژدا

١٠٨ – عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: ((كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاةِ، يُكَلِّمُ الرَّجُلُ مِنَّا صَاحِبَهُ، وَهُوَ إِلَى جَنْبِهِ فِي الصَّلاةِ، حَتَّى نَزَلَتْ " وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ " فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ وَنُهِينَا عَنْ الْكَلامِ))[2].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئێمە لە نوێژدا قسەمان دەکرد پیاوێك لە ئێمە قسەی لەگەڵ هاوڕێکەی دەکرد کە لە تەنیشتیەوە بوو لە نوێژدا هەتا ئەم ئایەتە دابەزی " وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ " واتە (نوێژەکانتان بکەن بە ملکەچی بۆ خودا) فەرمانمان پێکرا بەبێدەنگی و ڕێگریمان لێکرا لە قسە کردن)).

---

١ البخاري (١١٦٣) مسلم (٦٩،٧٠/٧١٤)

٢ البخاري (٤٥٣٤) مسلم (٥٣٩)

## بـابُ الإبراد في الظهر من شدة الحر - بەشى بەفێنكى نوێژ كردن لە گەرماى نيوەڕۆدا

١٠٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ وَأَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنهم عَنْ رَسُولِ اللَّهِ – صلَّى الله عليه وسلم – أَنَّهُ قَالَ: ((إذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاةِ ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ))[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرو ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوايان لێبێ) ئەوانيش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)كە فەرموويەتی: ((كاتێك گەرما بەتين و زۆر بوو ئەوا نوێژەكانتان بخەنە كاتی فێنكی، چونكە توندی گەرما لە هەڵاوی دۆزەخە)).

١١٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: ((كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي شِدَّةِ الحَرِّ، فَإِذَا لَم يَسْتَطِعْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ جَبْهَتَهُ مِنَ الأَرْضِ بَسَطَ ثَوْبَهُ فَسَجَدَ عَلَيهِ))[2].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئێمە نوێژمان دەكرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە قرچەی گەرمادا، كاتێك يەكێك لە ئێمە نەيتوانيايە ناوچەوانی لەسەر زەوی دابنێت پۆشاكەكەی ڕادەخستوو كڕنوشی لەسەر دەبرد)).

---

١ البخاري (٥٣٣) (٥٣٤) (٥٣٦) مسلم (٦١٥)

٢ البخاري (١٢٠٨) مسلم (٦٢٠)

## بابُ قضاء الصلاة الفائتة وتعجليها- بەشى گێڕانەوەى نوێژى فەوتاوو پەلەلێكردنى

١١١ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((مَنْ نَسِيَ صَلاةً فَلْيُصَلِّهَا إذَا ذَكَرَهَا، وَلا كَفَّارَةَ لَهَا إلاَّ ذَلِكَ " وَتَلاَ قَوْلَهُ تَعَالَى ﴿وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي﴾)) [١].

واتە: لە ئەنەسى كوڕى مالیكەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوادا (ﷺ) فەرمووى: ((ئەگەر یەكێك نوێژێكى لەبیر كرد ئەوا بابیكات كاتێك بیرى كەوتەوە، كەفارەتى بۆ نیە جگە لە كردنەوەى، ئینجا ئەم ئایەتەى خوێندەوە ﴿ وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي ﴾ واتە (هەستە بۆ نوێژ بۆ یادى من))).

وَلِمُسْلِمٍ ((مَنْ نَسِيَ صَلاةً، أَوْ نَامَ عَنْهَا. فَكَفَّارَتُهَا: أَنْ يُصَلِّيَهَا إذَا ذَكَرَهَا)) [٢].

وە لەدەربڕینێكدا لەلاى پێشەوا موسلیم ئەنەسى كوڕى مالیك (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوادا (ﷺ) فەرمووى: ((ئەگەر یەكێك نوێژێكى لەبیر كرد یاخود خەوتو خەبەرى نەبۆوە، كەفارەتەكەى كردنێتى كاتێك بیرى كەوتەوە)).

---

١ البخاري (٥٩٧) مسلم (٦٨٤)

٢ مسلم (٦٨٤/٣١٥)

## بابُ جواز إمامة المتنفل بالمفترض - بەشی دروستیەتی ئیمامەتی کەسێك نوێژی سوننەت بکات بۆکەسێك نوێژی فەرز بکات

١١٢ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: ((أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ: كَانَ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ ـ الله عليه وَسَلَّمَ – العِشَاءَ الآخِرَةَ. ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى قَوْمِهِ، فَيُصَلِّي بِهِمْ تِلْكَ الصَّلاةَ))[١].

واتە:لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: موعاذی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێبێ) سیفەتی وابوو نوێژی خەوتنانی دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پاشان دەگەڕایەوە بۆلای قەومەکەی هەمان نوێژی بۆ دەکردنەوە واتە: نوێژی عیشاء)).

١ البخاري (٧٠٠) مسلم (١٨١/٤٦٥)

## بابُ حكم ستر أحد العاتقين في الصلاة
## بەشی دا پۆشینی یەکێك لە شانەکان لە نوێژدا

١١٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلَّى الله عليه وسلم: ((لا يُصَلِّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ)) [١].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((با هیچ کەسێك لە ئێوە نوێژ نەکات لەیەك پۆشاکدا، وە شانی ڕووت بێت)).

تێبینی وەرگێڕ: پێویستە کەسی نوێژ خوێن بە جوانترین شێوە پۆشاك بپۆشێت بۆ نوێژ کردن وە نابێت شانەکانی ڕووت بێت چونکە لە سەدەکانی پێشودا ئەو پۆشاکەی لەبەریان دەکرد یەك پارچە بوو زۆر کات شانیانی دانەدەپۆشی وە لە ئێستاشدا فالینەی عەلاگە هەیە زۆر لە زانایان دەفەرموون نوێژ پێوەی دروست نییە مەگەر بۆ کاتی پێویستی کە هیچ جلێکی دەست نەکەوێت لەبەری بکات وە ئەوەی شایەنی باسە هەندێك لە نوێژ خوێنانی ئێستا هەندێك جلو بەرگ لەبەر دەکەن هەمووپشتیان بەدەرەوەیە ئەوە شەرعی نییەو نادرووستە.

---

١ البخاري (٣٥٩) مسلم (٥١٦)

## بابُ ماجاء في الثوم والبصل ونحوهما
## بەشی ئەوەی هاتووە لەبارەی سیرو پیازو هاو وێنەیان

١١٤ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ أَكَلَ ثُوماً أَوْ بَصَلاً. فَلْيَعْتَزِلْنَا أَوْ لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ. وَأُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ. فَوَجَدَ لَهَا رِيحاً، فَسَأَلَ؟ فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنْ الْبُقُولِ. فَقَالَ: قَرِّبُوهَا إلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ . فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا. قَالَ: كُلْ. فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لا تُنَاجِي))[1].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)فەرموویەتی: ((هەر کەسێك سیرو پیازی خوارد ئەوا بادوور بکەوێتەوە لێمان، یاخود با دوور بکەوێتەوە لە مزگەوتەکەمان، وە لەماڵی خۆی دابنیشێت، وە مەنجەڵێکیان بۆ هێنا کە کە سەوزەواتی تێدا بوو لە پاقلەمەنیەکان، کە بینی بۆنی لێ دێت پرسیاری کرد؟ هەواڵی پێدرا کە پاقلەمەنی تێدایە، فەرمووی: نزیکی بکەنەوە لە هەندێ لە هاوەڵانی، کاتێك چاوی پێی کەوت حەزی نەکرد بیخوات، فەرمووی بخۆ، من گفتوگۆ و قسە لەگەڵ کەسێکدا دەکەم کە تۆ لەگەڵی ناکەیت)).

١١٥ – عَنْ جَابِرِ بنِ عبدِ الله رضي اللهُ عنهما أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ أَوْ الثُّومَ وَالْكُرَّاثَ فَلا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ الْمَلائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو الإِنْسَانُ))[2]. وفي روايةٍ ((بني آدمَ)).

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هەر کەسێك پیاز یاخود سیرو کەوەری خوارد با نزیکی مزگەوتەکەمان نەکەوێتەوە، چونکە فریشتە ناڕەحەت دەبێت بەوەی کە نەوەی ئینسان لێوەی پێی ناڕەحەت دەبێت)). وە لە دەربڕینێکی تردا (نەوەی ئادەم).

---

١ البخاري (٨٥٥) مسلم (٥٦٤/٧٣)

٢ مسلم (٥٦٤/٧٤)

## بابُ التَّشهدِ - بەشى تەحيات

١١٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مَسْعُودٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((عَلَّمَنِي رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم التَّشَهُّدَ كَفِّي بَيْنَ كَفَّيْهِ كَمَا يُعَلِّمُنِي السُّورَةَ مِنْ القُرآنِ: التَّحِيَّاتُ لِلهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ ورَحْمَةُ اللهِ وبَرَكَاتُهُ. السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ))[1].

وَفِي لَفْظٍ: ((إِذَا قَعَدَ أَحَدُكُمْ لِلصَّلاَةِ فَلْيَقُلْ: التَّحِيَّاتُ للهِ – وَذَكَرَهُ – وَفِيهِ: فَإِنَّكُمْ إِذَا فَعَلْتُمْ ذَلِكَ فَقَدْ سَلَّمْتُمْ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ – وَفِيهِ – فَلْيَتَخَيَّرْ مِنْ الْمَسْأَلَةِ مَا شَاءَ))[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەحیاتی فێری کردم دەستم لەنێو هەردوو دەستیا بوو هەروەك چۆن سورەتێکی لە قورئان فێر دەکردم: ((سوپاسو ستایشو گەورەییو نوێژەکانمانو هەموو خاوێنیەك لە کردەوەو وتەو گوفتارمان بۆ خودایە، سەلامو میهرەبانیو خێرو بەرەکەتی خودات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر (ﷺ)وە سەلام لەسەر ئێمەو هەموو بەندە چاکەکانی خودا بێت، وە دانی پێدا دەنێم کە هیچ خودایەك نیە بە ڕاست شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله نەبێت وە پێغەمبەر (ﷺ) بەندەو نێردراوی خودایە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێك یەکێك لە ئێوە دانیشت بۆ تەحیات خوێندن ئەوا بابڵێ: التَّحِيَّاتُ لِلهِ، هەتا کۆتایی)) وە هەر تێیدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: ((کاتێك ئێوە ئەوە بکەن ئەوا سەلامتان کردووە لەسەر هەموو بەندەیەکی چاك لە زەوی و لە ئاسمان)) وە هەر تێیدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((وە پاشان سەرپشك بێت لە پاڕانەوە)).

---

١ البخاري (٨٣١) مسلم (٤٠٢)

٢ البخاري (١٢٠٢) (٦٢٣٠) مسلم (٤٠٢)

## بابُ كيفية الصَّلاة على النبي (ﷺ)
## بەشی چۆنیەتی صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)

١١٧ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: ((لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ فَقَالَ أَلا أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً؟ إِنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم خَرَجَ عَلَيْنَا، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكَ: فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَقَالَ: قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)) [1].

واتە: لە عەبدوالڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ((کەعبی کوڕی عوجرە پێ گەیشت (ڕەزای خوای لێبێ) پێی وتم: ئایا دیاریەکت پێشکەش کەم؟ پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لامان، پێمان وت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێگومان زانیمان چۆن سەلامت لەسەر بدەین، ئەی چۆن صەڵەواتت لەسەر بدەین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڵێن: پەروەردگارا درود برژێنە بەسەر موحەمەدو شوێن کەوتوانی موحەمەد، هەروەك چۆن درودت ڕژاند بەسەر إبراهیم و شوێن کوتوانی إبراهیم، چونکە تۆ سوپاس کراویت لەسەر هەموو حاڵێکو بەرزو بڵندو شکۆ داریت، پەروەردگارا خێرو خۆشی و بەرەکەت برژێنە بەسەر موحەمەدو شوێن کەوتوانی موحەمەد، هەروەك چۆن خێرو خۆشی و بەرەکەتت ڕژاند بەسەر إبراهیم و شوێن کوتوانی إبراهیم، چونکە تۆ سوپاس کراویت لەسەر هەموو حاڵێك و بەرزو بڵند و شکۆ داریت)).

---

١ البخاري (٦٣٥٧) مسلم (٤٠٦)

## بابُ الدّعاء بعد التشهد الأخير
## بەشی پاڕانەوە لە دوای تەحیاتی كۆتایی

١١٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللَـهِ صلّى الله عليه وسلم يَدْعُو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)) [١].

وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ: ((إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ بِاَللهِ مِنْ أَرْبَعٍ، يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ)) [٢].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەپاڕایەوە: دەیفەموو: پەروەردگارا پەنا دەگرم بەتۆ لە ئەشكەنجەی گۆڕ، وە لە ئەشكەنجەی دۆزەخ، وە لە فیتنەی ژیان و مردن، وە لە فیتنەی دەجال)).

وە لەدەربڕینێكی تردا لەلای پێشەوا موسلیم پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی : ((كاتێك یەكێك لە ئێوە تەحیاتی خوێند ئەوا با پەنا بگرێت بە خودا لە چوار شت بڵێت پەروەردگارا پەنا دەگرم بەتۆ لە ئەشكەنجەی دۆزەخ: وە سەرجەم ئەوانەی لە فەرموودەكەی پێشودا ڕابوورد)).

١١٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضي الله عنهم أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ صلّى الله عليه وسلم: ((عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاتِي. قَالَ: قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً. وَلا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ. فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ. وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)) [٣].

---

١ البخاري (١٣٧٧) مسلم (٥٨٨/١٣١)

٢ مسلم (٥٨٨/١٢٨)

٣ البخاري (٨٤٣) مسلم (٢٧٠٥)

واته: له عەبدوڵلاَى كوڕى عەمرى كوڕى عاصەوە ئەويش لە ئەبوبەكرى صديقەوە (ڕەزاى خوايان لێبێ) كە بە پێغەمبەرى خواى (ﷺ) وتووە: ((فێرى پاڕانەوەيەكم بكە پێى بپاڕێمەوە لە نوێژەكەمدا: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووى: بڵێ: پەروەردگارا من ستەمى زۆرم لە نەفسم كردووە، وە هيچ كەسێك لە تاوانەكان خۆش نابێت جگە لە تۆ، لێم خۆش ببە لێخۆشبوونێك لەلايەن خۆتەوە، وە ڕەحمم پێبكە چونكە تۆ زۆر لێبوردەو ميهرەبانيت)).

١٢٠ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((مَا صَلَّى النَّبِيُّ صَلاَةً صلَّى الله عليه وسلم بَعْدَ أَنْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ " إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ " – إلاَّ يَقُولُ فِيهَا: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)) [١].

وَفِي لَفْظٍ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)) [٢].

واته: له دايكمان عائيشەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: : ((هيچ نوێژێكى نەكردووە پێغەمبەر (ﷺ) دواى ئەوەى كە ئايەتى " إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ " دابەزيە سەرى هەميشە تيايدا وتويەتى: پاكى و بێگەردى بۆ تۆ ئەى خوايە، سوپاس بۆ تۆ ئەى پەروەردگارى ئێمە، پەروەردگارا لێم خۆش ببە)).

وە لەدەربڕينێكى تردا دايكمان عائيشە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا (ﷺ)لە ڕكوع و سوجدەدا زۆر جار دەيفەرموو: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ـ واتە: پاكى و بێگەردى بۆ تۆ ئەى خوايە، سوپاس بۆ تۆ ئەى پەروەردگارى ئێمە پەروەردگارا لێم خۆش ببە)).

---

١ البخاري (٧٩٤) (٨١٧) (٤٢٩٣) (٤٩٦٧) (٤٩٦٨) مسلم (٤٨٤/٢١٩،٢١٨)

٢ مسلم (٤٨٤/٢١٧)

## بابُ الوِتْرِ - بەشی نوێژی ویتر

١٢١ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ - مَا تَرَى فِي صَلاةِ اللَّيْلِ؟ قَالَ: مَثْنَى، مَثْنَى. فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمْ الصُّبْحَ صَلَّى وَاحِدَةً. فَأَوْتَرَتْ لَهُ مَا صَلَّى. وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اجْعَلُوا آخِرَ صَلاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْراً)) [1].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەر بوو وتی هەواڵم بەرێ دەربارەی شەو نوێژ؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی : ((شەو نوێژی دوو دووە ئەگەر یەکێکتان ترسا ڕۆژ ببێتەوە، یەك ڕکات دەکات، دەبێتە تاکی ئەو نوێژانەی کە کردویەتی)) وە پێغەمبەر (ﷺ)دەیفەرموو: ((کۆتایی نوێژەکانتان بەشەو با تاك بێت)).

١٢٢ - عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ، وَأَوْسَطِهِ، وَآخِرِهِ. فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ)) [2].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((لە هەموو شەوێکدا پێغەمبەر(ﷺ)وەتری کردووە: لە سەرەتای شەوەوە، وە لە ناوەڕاستیەوە، وە لە کۆتاییەوە، وەترەکەی لە بەرە بەیاندا کۆتایی دەهات)).

شیکردنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) لە شەودا یەکجار نوێژی وەتری کردووە بەڵام یان لە سەرەتای شەوەوە، یان لە ناوەڕاستیەوە، یان لە کۆتاییەوە، بەڵام چاکترینیان ئەوەیە کەلە کۆتاییەوە بێت دوای شەو نوێژ، بۆ کەسێك کە ترسی خەبەر بوونەوەی نەبێت.

---

١ البخاري (٩٩٨) مسلم (٧٥١)

٢ البخاري (٩٩٦) مسلم (٧٤٥)

١٢٣ – عَنْ عَائِـشَةَ رضـي الله عنها قَالَـتْ: ((كَـانَ رَسُـولُ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسـلم يُصَلِّي مِنْ اللَّيْـلِ ثَـلاثَ عَـشْرَةَ رَكْعَـةً يُـوتِرُ مِـنْ ذَلِـكَ بِخَمْسٍ، لايَجْلِسُ فِـي شَـيْءٍ إلاَّ فِـي آخِرِهَا))[١].

واته: له دايكمان عائيشهوه (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: : ((پێغەمبەرى خـوا (ﷺ) سيفەتى وابوو لـه هـهموو شـەوێكدا سـيانزه ڕكـات نوێـژى دەكـرد پێنجيـانى بـەتاك دەكرد (واته يەك تەحياتى تێدا دەخوێند) لـه هيـچياندا دانەدەنيـشت جگـه لـه ڕكـاتى كۆتايدا نەبێت)).

١ مسلم (٧٣٧)

## بابُ الذكرِ عَقِبَ الصَّلاةِ - بەشی ذکر کردنی دوای نوێژ

١٢٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ، حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنْ الْمَكْتُوبَةِ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم)) [1]. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: " كُنْتُ أَعْلَمُ إِذَا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ إِذَا سَمِعْتُهُ ".

وَفِي لَفْظٍ " مَا كُنَّا نَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلاةِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم إِلاَّ بِالتَّكْبِيرِ".[2]

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)دەنگ بەرز دەکرایەوە بۆ ذیکر کاتێك خەڵك سەلامی دەدایەوە لە نوێژە فەرزەکان)).

وە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس(ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: : ((من گوێم لەو دەنگ بەرز کردنەوەیە بوو دەمزانی کە سەلامیان داوەتەوە لە نوێژ)).

وە لە دەربڕینێکی تردا عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((ئێمە نەمان دەزانی نوێژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەواو بووە جگە بە الله أکبر نەبێت)).

تێبینی وەرگێڕ: ئەو دەنگ بەرز کردنەوەیە تایبەت بوو بەسەردەمی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) چونکە سەرەتای ئیسلام بوو وە خەڵکیش تازە موسڵمان دەبوو بەڵام لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نە هاوەڵانی (ڕەزای خوایان لێبێ) نە تابعین (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) ئەم کارەیان نەکردووە بۆیە پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی

---

١ البخاري (٨٤١) مسلم (٥٨٣)

٢ مسلم (١٢١/ ٥٨٣)

خوای لێبێ) دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ذیکری دوای نوێژ بە دەنگی بەرز بدعەیە چونکە ئەم فەرموودەیە تایبەتە بە سەردەمی پێغەمبەری خواوە (ﷺ).

١٢٥ – عَنْ وَرَّادٍ مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: أَمْلَى عَلَيَّ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فِي كِتَابٍ إلَى مُعَاوِيَةَ: ((أَنَّ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ: " لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٍ. اللَّهُمَّ لا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ) [١]. ثُمَّ وَفَدْتُ بَعْدَ ذَلِكَ عَلَى مُعَاوِيَةَ فَسَمِعْتُهُ يَأْمُرُ النَّاسَ بِذَلِكَ.

وَفِي لَفْظٍ: ((كَانَ يَنْهَى عَنْ قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةِ الْمَالِ، وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ وكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقُوقِ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدِ الْبَنَاتِ، وَمَنْعٍ وَهَاتِ)) [٢].

واتە: لە وەڕادەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) کە کە خزمەت کاری موغیرەی کوڕی شوعبە بوو (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێبێ) نامەیەکی پێنوسیمو پێیدا ناردم بۆلای موعاویە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دوای هەموو نوێژێکی فەرز دەیفەرموو " لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٍ. اللَّهُمَّ لا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ) واتە: هیچ خوایەك نیە بەڕاست شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله نەبێت تاك و بێهاوەڵە: موڵك و سوپاس هەر بۆ ئەوە، وە بەسەر هەموو کارێکدا باڵا دەستە: پەروەردگارا هیچ ڕێگرێك نیە لەوەی کە بەخشیوتە وە هیچ بەخشندەیەك نیە لەوەی کە گرتوتەوە، وە هیچ خاوەن ماڵ و بە شێك هیچ سودێکی پێنا بەخشێت ئەگەر گوێڕایەڵی تۆی نەکردبێت)).

١ البخاري (٨٤٤) (٦٣٣٠) (٦٦١٥) (٧٢٩٢) مسلم (٥٩٣)

٢ البخاري (٦٤٧٣) (٧٢٩٢) مسلم (٥٩٣)

وەڕاد (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: پاش ئەوە بە نوێنەری چووم بۆلای موعاویە (ڕەزای خوای لێبێ) گوێم لێبوو فەرمانی بەخەڵك دەكرد بەو ذیكرە.

وە لەدەربڕینێكی تردا وەڕاد (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: موغیرە (ڕەزای خوای لێبێ) بۆ موعاویەی نووسی (ڕەزای خوای لێبێ) كە ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی كردووە لە وتراو وتی، وە بەفیڕۆیانی سامان و ماڵ، وە زۆر پرسیار كردن، وە عەزێت دانی دایك وە زیندە بەچاڵ كردنی كچان، وە دواكردنی مافی خۆی لە خەڵكی و خواردنی مافی خەڵك)).

١٢٦ – عَنْ سُمَيٍّ مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَى وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ. قَالَ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالُوا: يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ وَلا نَتَصَدَّقُ. وَيُعْتِقُونَ وَلا نُعْتِقُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم أَفَلا أُعَلِّمُكُمْ شَيْئًا تُدْرِكُونَ بِهِ مَنْ سَبَقَكُمْ، وَتَسْبِقُونَ مَنْ بَعْدَكُمْ. وَلا يَكُونُ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكُمْ، إلاَّ مَنْ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُمْ؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: تُسَبِّحُونَ وَتُكَبِّرُونَ وَتَحْمَدُونَ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ: ثَلاثاً وَثَلاثِينَ مَرَّةً. قَالَ أَبُو صَالِحٍ: فَرَجَعَ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ، فَقَالُوا: سَمِعَ إخْوَانُنَا أَهْلُ الأَمْوَالِ بِمَا فَعَلْنَا، فَفَعَلُوا مِثْلَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم : ذَلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ)).

قَالَ سُمَيٌّ: فَحَدَّثْتُ بَعْضَ أَهْلِي بِهَذَا الحَدِيثِ فَقَالَ: وَهِمْتَ إِنَّمَا قَالَ: تُسَبِّحُ اللهَ ثَلاَثَاً وَ ثَلاَثِينَ، و تُكَبِّرُ اللهَ ثَلاَثَاً وَ ثَلاَثِينَ، وَ تَحْمَدُ اللهَ ثَلاَثَاً وَ ثَلاَثِينَ.

فَرَجَعْتُ إِلي أَبِي صَالِحٍ فَذَكَرْتُ لَهُ ذَالِكَ فَقَالَ: قُلْ ((اللهُ أَكْبَرُ وَ سُبْحَانَ اللهِ وَ الحَمْدُ للهِ حَتَّى تبْلُغَ مِنْ جَمِيعِهِنَّ ثَلاَثَاً وَ ثَلاَثِينَ)) [1].

---

١ مسلم (٥٩٥) البخاري (٨٤٣)

واته: له سومیەوه کـه خزمـەت کـاری ئـەبو بـەکری کـوڕی عەبـدولڕەحمانی کـوڕی حـارثی کـوڕی هیـشامه ئـەویش لـه ئـەبو صـاڵەحی سـیمانەوه (ڕەحمـەتی خـوای لـه هەموویان بێت) ئەویش له ئەبو هورەیرەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((هـەژاره کۆچ بەرەکان هاتن بۆلای پێغەمبەرِی خوا (ﷺ) وتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)(ۆشـتن خاوەن مـاڵ و سـامانەکان بـه پلـەو پایەیـەکی زۆرو وه بـه بەهەشـتێکی بەردەوامـەوه پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ئەوه بەچی هۆکارێکەوه؟ وتیان نوێژ دەکەن هـەروەك ئێمـه نوێژ دەکەین، وه بەڕۆژوو دەبن هەروەك ئێمه بەڕۆژوو دەبین، وه خێـرو چاکه دەکـەن بەڵام ئێمه خێرو چاکه ناکەین وه ئەوان بەنـده ئـازاد دەکـەن بـەڵام ئێمـه بەنـده ئـازاد نایکەن)) پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: ((ئایا شتێکتان فێربکەم بگـەن بەوانـەی کـه پێشتان کەوتوون، وه پێشی ئەوانه بەنەوه که لەدواتانـەوه دێـن، وه هـیچ کەسـێك لـه ئێـوه چـاکتر نـەبێت جگـه لـەوەی کـه وەك ئـەوەی ئێـوه بکـات)) وتیـان بـەڵێ ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : سوبحانه الله و ئەالحەمـدو لله و الله أكبر بکەن دوای هەموو نوێـژێك سیوسـێ جـار: ئـەبو صـالّح دەڵـێ: هـەژاره کۆچ بەرەکان گەڕانەوه بۆ لای پێغەمبەری خواو (ﷺ) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بـرا خـاوەن مـاڵ و سـامانەکان بیـستیان ئـەوەی ئێمـه کردمـان وه ئـەوانیش کردیـان: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی : ((ئـەوه نـاز و نیعمـەت و چـاکەیەکه خـودا بیـەوێ بەهەرچی کەسێك دەیبەخشێت)) سومەی دەڵێ: ئەوەم باس کرد بۆ هەندێك له خـزم و دۆستانم وتیان هەڵەت کردووه بـەڵکو وتیـەتی سـوبحانه الله سیوسـێ جـار وه الله أكبر سیوسێ جـار وه ئەالحەمـدو لله سیوسـێ جـار دەڵـێ: گەڕامـەوه بـۆ لای ئـەبو صـالّح ئەوەم بۆ باس کرد وتی بڵێ: الله أكبر وه سوبحانه الله وه ئەالحەمدو لله ـ هەتا دەگەیته سیوسێ جار)).

تێبینی وەرگێڕ: فەرمووده بەهەردوو شـێوازەکه هـاتووه چ بەهەرسـێکیان سیوسـێ جار بێت یان یەکی سیوسێ جار بیان کەیت دروسته.

## بابُ الخشوع في الصَّلاةِ - بەشی خشوع له نوێژدا

١٢٧ – عَنْ عَائِشَةَ رضـي الله عنهـا: ((أنَّ النَّبِـيَّ صـلَّى الله عليـه وسـلم صَـلَّى فِـي خَمِيصَةٍ لَهَا أعْلامٌ. فَنَظَرَ إلَى أعْلامِهَا نَظْرَةً. فَلَمَّا انْصَرَفَ قَـالَ: اذْهَبُـوا بِخَمِيـصَتِي هَـذِهِ إلَى أبِي جَهْمٍ، وَأْتُونِي بِأنْبِجَانِيَّةِ أبِي جَهْمٍ. فَإِنَّهَا ألْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلاتِي)) [1].

واته: له دایکمان عائیشەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) نوێـژی کرد به جلێکی چوار گۆشەی خەت خـەتاوی ڕەنگاو ڕەنـگ، سـەیری خەتـەکانی کـرد، کاتێك سەلامی دایەوه، فەرمووی: ئـەم پۆشـاکه بـەرن بـۆ ئـەبو جـەهم وه پۆشـاکێکی سـادەی ئەسـتورم لای ئـەبو جـەهم بـۆ بێـنن، چـونکه ئێـستا خـەیاڵی بـردم لــه نوێژەکەمدا)).

---

١ البخاري (٣٧٣) (٧٥٢) (٥٨١٧) مسلم (٥٥٦)

## بابُ الجمعِ بينَ الصلاتينِ في السفرِ
## بەشی کۆکردنەوە لەنێوان دوو نوێژدا لە سەفەردا

کۆکردنەوەی نوێژ مۆڵەتێکە کە خودا بەم ئومەتەی بەخشیوە دەتوانن نوێژ کۆ بکەنەوە لە چەند کاتو ساتێکی تایبەتدا وەك سەفەر کردن و بارینی بارانی زۆرو بوونی قوڕ چڵپاو وە بایەکی تیژی سارد لە شەوی تاریکدا وە بۆ کەسێك لە بێدەستنوێژی بەردەوامدا بێت وە بە دوو شێواز ئەنجام دەدرێت پێش دوا واتە نیوەڕۆ بەری بۆلای عەسر بە پێچەوانەشەوە وە ئێوارەو خەوتنانیش بەهەمان شێوە بەڵام بەیانی هەر وەك خۆیەتی وە ئەو سەفەرەی کە نوێژ کورت کردنەوە تێیدا دروستە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر ماوەکەی بەڵام شیخ الأسلام ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ: ئەوەی ناوی سەفەر بێت کورت بێت یان درێژ جەمع تێیدا دروستە چونکە بەڵگە شەرعیەکان هیچیان جیاوازی ناکەن لە نێوان سەفەری کورت و درێژدا.

١٢٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ، وَيَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ))[1].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆدەکردەوە کاتێك لە ڕێگادا بووایە، وە ئێوارە و خەوتنانیش)).

[1] البخاري تعليقا (١١٠٧) مسلم (٧٠٥)

## بـابُ قصرِ الصلاة في السفرِ - بەشی کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا

نوێژ کورتکردنەوە لە سەفەردا نەبێت ناکرێت بە کۆی دەنگی زانایـان وە تـەنها لـە نوێژە چوار ڕکاتیەکاندا دەکرێت.

١٢٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ لا يَزِيدُ فِي السَّفَرِ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ كَذَلِكَ)) [١].

واتە: لە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەرەوە (ڕەزای خوایـان لێبـێ) دەڵـێ: ((هاوڕێیـەتی پێغەمبەری خوام (ﷺ) کرد لە سەفەردا لە دوو ڕکـات زیـاتری نـەدەکرد، وە هـەروەها ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانیش (ڕەزای خوایان لێبێ) بەهەمان شێوە)).

---

١ البخاري (١١٠٢) مسلم (٦٩٤)

## بابُ الجُمُعَةِ - بەشى جومعه

١٣٠ – عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ: أَنَّ رِجَالاً تَمَارَوْا فِي مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ – صلَّى الله عليه وسلم – مِنْ أَيِّ عُودٍ هُوَ؟ فَقَالَ سَهْلٌ مِنْ طَرْفَاءِ الغَابَةِ: ((وَ قَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَامَ عَلَيهِ فَكَبَّرَ وَكَبَّرَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ. ثُمَّ رَكَعَ فَنَزَلَ الْقَهْقَرَى، حَتَّى سَجَدَ فِي أَصْلِ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ صَلاتِهِ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا بِي، وَلِتَعْلَمُوا صَلاتِي))[١]. وَفِي لَفْظٍ – فصَلَّى وَهُوَ عَلَيْهَا. ثُمَّ كَبَّرَ عَلَيْهَا. ثُمَّ رَفَعَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ نَزَلَ الْقَهْقَرَى)).

واته: له سەعدی کوڕی سەهلی ساعیدییەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پیاوانێك موناقەشەیان کرد لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)کە لە چ دارێك دروست کراوه: سەهل (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: لە درەختی دارگەزە کە لە باشووری مەدینەیە، بێگومان پێغەمبەری خوام (ﷺ) دیوه وەستاوه لەسەری ئینجا الله أکبری کردووه وه خەڵکیش لەدوایەوه الله أکبریان کردووه، پاشان ڕکوعی برد ئینجا بەدوایا گەڕایەوه دواوه هەتا سوجدەی برد لەبنی مینبەرەکەدا، پاشان گەڕایەوه هەتا نوێژەکەی تەواو کرد، ئینجا ڕوی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئەی خەڵکینە بۆیە ئەمەم کرد لەبەر ئەوەی شوێنم بکەن و وه فێری نوێژەکەم ببن)).

وه لەدەربڕینێکی تردا هاتووه سەهل (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ)نوێژی کرد لەسەر مینبەرەکە بوو پاشان الله أکبری کرد چووە ڕکوع لەسەری پاشان سەری بەرزکردەوه لەسەری ئینجا پاشەو پاش گەڕایە دواوه)).

---

١ البخاري (٩١٧) مسلم (٥٤٤)

١٣١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ جَاءَ مِنْكُمْ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ)) [١].

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی: ((هەر کەسێك لە ئێوە هات بۆ نوێژی جومعە ئەوا با خۆی بشۆرێ)).

تێبینی وەرگێڕ: ئایا خۆشۆردن بۆ جومعە واجبە یان سونەتە دوو وتەی لەسەرە یەکیان ئەوەیە کە واجبە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)لە فەرمودەکەدا فەرمان دەکات دووەمیان کەوتەی بەهێزە ئەوەیە کە سونەتێکی موئەکەدەیە، بەڵام ئەگەر کەسێك بۆنی ناخۆشی لێدەهات یان پیسی بە جلەکانیوە بوو ئەوا واجبە لەسەری کە خۆی بشوات: شیخ الاسلام ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ : هۆکاری ئەم وتەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە بوو هاوەڵەکانی خاوەن ئیشوکار بوون وە خاوەنی یەك دەست جل زیاتر نەبوون بۆیە کە دەهاتن بۆ نوێژ بۆنی عارەقیان لێدەهات یان پیسی بە جلەکانیوە بوو بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ)وای فەرموو وە بۆ هەموو کاتێك ئەو فەرمانە بەردەوامە کەسێك بۆنی عارەقی لێبێت یان پیسی بە جلەکانیەوە بێت.

١٣٢ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: ((جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ. فَقَالَ: أَصَلَّيْتَ يَا فُلانُ؟ قَالَ: لا. قَالَ: قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ)) [٢]. وَفِي رِوَايَةٍ: فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ)) [٣].

واته: له جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پیاوێك هات وە پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەخویندەوە ڕۆژی جومعە، فەرمووی: نوێژت کرد ئەی فلان؟

---

١ البخاري (٨٩٤) (٨٧٧) (٩١٩) مسلم (٢/٨٤٤)

٢ البخاري (٩٣٠) (٩٣١) مسلم (٨٧٥)

٣ مسلم (٨٧٥/٥٥)

وتى نەخێر فەرمووى: هەستە دوو ڕكات بكە)) وە لەدەربڕينێكى تـردا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووى: ((دوو ڕكات نوێژ بكە)).

١٣٣ – عَنْ جَابِرٍ– رضي الله عنـه – قَـالَ: ((كَـانَ رَسُـولُ اللهِ صلَّى الله عليـه وسـلم يَخْطُبُ خُطْبَتَيْنِ وَهُوَ قَائِمٌ، يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِجُلُوسٍ)) [1].

واتە: لە جابرى كوڕى عەبدوڵلاوە (ڕەزاى خوايـان لێبـێ) دەڵـێ:((پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) سـيفەتى وابـوو دوو وتـارى بـە پێـوە دەخوێنـدەوە، نێـوانى تێـدەكردن بـە دانيشتنێك)).

١٣٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضـي الله عنـه –: أَنَّ النَّبِـيَّ صلَّى الله عليـه وسـلم قَـالَ: ((إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ – فَقَدْ لَغَوْتَ)) [2].

واتە: لە ئەبوهورەيرەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵـێ:((پێغەمبـەر (ﷺ)فـەرمووى : كاتێـك وتـت بـە هاوەڵەكـەت، بێـدەنگ بـە لـە ڕۆژى جومعـەدا وە ئيمـام وتـارى دەخوێندەوە، ئەوا غەڵبە غەڵبت كردووە)).

١٣٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: أَنَّ النَّبِـيَّ صلَّى الله عليـه وسـلم قَـالَ: ((مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ رَاحَ فِي الساعَةِ الأُولى فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً. وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً. وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْـرَنَ. وَمَـنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً. وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْـضَةً. فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ الْمَلائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ)) [3].

---

١ البخاري (٩٢٠) (٩٢٨) مسلم (٨٦١) ذكراه بالمعنى

٢ البخاري (٩٣٤) مسلم (٨٥١)

٣ البخاري (٨٨١) مسلم (٨٥٠)

واته: له ئەبوهورەیرەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: ((هەر کەسێك خۆی بشوا لە ڕۆژی جومعەدا، پاشان بچێت بۆ مزگەوت لە یەکەم سەعاتدا وەك ئەوە وایە وشترێکی کردووە بەخێر، وە هەر کەسێك لە سەعاتی دووەمدا بچێت وەك ئەوە وایە مانگایەکی کردووە بەخێر، وە هەر کەسێك لە سەعاتی سێیەمدا بچێت وەك ئەوە وایە بەرانێکی شاخداری کردووە بەخێر، وە هەر کەسێك لە سەعاتی چوارەمدا بچێت وەك ئەوە وایە کەمریشکێکی کردووە بەخێر، وە هەر کەسێك لە سەعاتی پێنجەمدا بچێت وەك ئەوە وایە کەهێلکەیەکی کردووە بەخێر، کاتێك کە ئیمام دەرچوو فریشتەکان ئامادە دەبن گوێ لە جومعەکە دەگرن)).

١٣٦ – عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأكْوَعِ – وكَانَ مِنْ أصْحَابِ الشَّجَرَةِ – – رضي الله عنه – قَالَ: ((كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم الْجُمُعَةَ، ثُمَّ نَنْصَرِفُ. ولَيْسَ لِلْحِيطَانِ ظِلٌّ نَسْتَظِلُّ بِهِ))[1].

وَفِي لَفْظٍ: ((كُنَّا نُجَمِّعُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم إذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَتَتَبَّعُ الْفَيْءَ))[2].

واته: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە لە هاوەڵانی شەجەرەیە (هاوەڵانی شەجەرە کامانەن ئەوانە بوون کە لە بەیعەتو رضواندا لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) ویستیان بچن بۆ عومرە کافرەکان ڕێگەیان نەدا پێغەمبەر (ﷺ)ئیمامی عوسمانی نارد (ڕەزای خوای لێبێ) بۆ ئەوەی ڕێگەیان بدەن پاشان هەواڵی ئەوە گەشت کە ئیمامی عوسمانیان شەهید کردووە (ڕەزای خوای لێبێ) بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەیعەتی لێوەرگرتن لەسەر جەنگ کردن دژ بەکافرەکان) دەڵێ:((ئێمە

---

١ البخاري (٤١٦٨) مسلم (٣٢/٨٦٠)

٢ مسلم (٨٦٠)

نوێـژى جومعـەمان دەكـرد لەخزمـەت پێغەمبـەرى خـوادا (ﷺ) پاشـان دەگەڕاینـەوە دیوارەكان سێبەرى نەبوو تا پیایدا بڕۆین)).

وە لـەدەربڕینێكى تـردا سـەلەمەى كـوڕى ئـەكوەع (ڕەزاى خـواى لێبـێ) دەڵـێ: : ((ئێمە نوێژى جومعەمان دەكرد لەخزمەت پێغەمبەرى خوادا (ﷺ)كاتێـك كـە خـۆر لـە ناوەڕاستى ئاسمان لاى دەدا پاشان بەبن سێبەرەكاندا دەگەڕاینەوە)).

١٣٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنـه – قَـالَ: ((كَـانَ رَسُـولُ اللهِ صـلّى الله عليـه وسلم يَقْرَأُ فِي صَلاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: الم تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ وَ: هَلْ أَتَى عَلَى الإِنْسَانِ))[1].

واتـە: لـە ئـەبوهورەیرەوە (ڕەزاى خـواى لێبـێ) دەڵـێ:((پێغەمبـەرى خـوا(ﷺ) سیفەتى وابـوو ڕۆژى جومعـان لـە نوێـژى بەیانیـدا سـورەتى السَّجْدَةَ وَ: هَـلْ أَتَـى عَلَـى الإِنْسَانِ: دەخوێند)).

[1] البخاري (٨٩١) (١٠٦٨) مسلم (٨٨٠)

## بابُ صلاة العيدين - بەشی نوێژی دوو جەژنەکە

١٣٨ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((كَانَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ)) [١].

واته: لە عەبدوللای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەرو (ﷺ) ئەبو بەکر و عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) نوێژی هەردوو جەژنەکەیان دەکرد پێش وتار خوێندن)).

١٣٩ - عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه قَالَ: ((خَطَبَنَا النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم يَوْمَ الأَضْحَى بَعْدَ الصَّلاةِ، فَقَالَ: مَنْ صَلَّى صَلاتَنَا وَنَسَكَ نُسُكَنَا فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلاةِ فَلا نُسُكَ لَهُ. فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ - خَالُ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ - يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي نَسَكْتُ شَاتِي قَبْلَ الصَّلاةِ. وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ. وَأَحْبَبْتُ أَنْ تَكُونَ شَاتِي أَوَّلَ مَا يُذْبَحُ فِي بَيْتِي. فَذَبَحْتُ شَاتِي، وَتَغَدَّيْتُ قَبْلَ أَنْ آتِيَ الصَّلاةَ. قَالَ: شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنَّ عِنْدَنَا عِنَاقاً هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْنِ أَفَتُجْزِي عَنِّي؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ)) [٢].

واته: لە بەڕائی کوڕی عازبەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەر (ﷺ)وتاری بۆ خوێندینەوە ڕۆژی جەژنی قوربان دوای نوێژ فەرمووی : هەر کەسێك نوێژی کردبێت وەك نوێژەکەی ئێمە وە قوربانی کردبێت وەك ئەوەی ئێمە ئەوا پێکاویێتی وە هەر کەسێك قوربانی کردبێت پێش نوێژ ئەوا قوربانیەکەی قبوڵ نیە)) جا ئەبو بوردەی کوڕی نیار کە خاڵی بەڕائی کوڕی عازبە (ڕەزای خوایان لێبێ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئاژەڵەکەی خۆمم پێش نوێژ سەر بڕیوە، وە زانیویشمە ئەمڕۆ ڕۆژی

---

١ البخاري (٩٦٣) مسلم (٨٨٨)

٢ البخاري (٩٥٥) (٩٦٥) (٩٨٣) مسلم (١٩٦١)

خواردن و خواردنەوەیە، وە پێم خۆش بوو ئاژەڵەکەی من یەکەم دانە بێت کە سەر ببڕێت لە ماڵەکەمدا، بۆیە سەرم بڕی، وە نانی بەیانیم خوارد پێش ئەوەی بێم بۆ نوێژ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئاژەڵەکەت بۆ خواردنە)) واتە (بە قوربانی ژمارده ناکرێت) وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە گیسکێکمان هەیە، لە دوو مەڕ لەلام خۆشەویسترە، ئایا بۆم دەچێتە بری قوربانیەکەم؟ فەرمووی: ((بەڵێ بەڵام لە بری کەسی تر ناکەوێت دوای تۆ)). واتە ئەم شێوازە تایبەت بوو بەم پیاوەوە.

١٤٠ – عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْبَجَلِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَوْمَ النَّحْرِ. ثُمَّ خَطَبَ. ثُمَّ ذَبَحَ وَقَالَ: مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيَذْبَحْ أُخْرَى مَكَانَهَا، وَمَنْ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللهِ)) [١].

واتە: لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیەوە (ڕەزای خوای لێبێ): ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی کرد ڕۆژی جەژنی قوربان، پاشان وتاری خوێندەوە، پاشان خوێنی ڕشتو فەرمووی، هەرکەسێك خوێنی ڕشتوە پێش ئەوەی کە نوێژ بکات ئەوا با لەشوێنەکەی قوربانیەکی تر بکات، وە هەرکەسێك خوێنی نەڕشتووە ئەوا بابیڕژێ بە ناوی خوا)).

١٤١ – عَنْ جَابِرٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَوْمَ الْعيدِ. فَبَدَأَ بِالصَّلاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، بِلا أَذَانٍ وَلا إِقَامَةٍ. ثُمَّ قَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى بِلالٍ، فَأَمَرَ بِتَقْوَى اللهِ تَعَالَى، وَحَثَّ عَلَى طَاعَتِهِ، ووَعَظَ النَّاسَ وَذَكَّرَهُمْ، ثُمَّ مَضَى حَتَّى أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ، وَقَالَ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، تَصَدَّقْنَ. فَإِنَّكُنَّ أَكْثَرُ حَطَبِ جَهَنَّمَ، فَقَامَتْ امْرَأَةٌ مِنْ سِطَةِ النِّسَاءِ، سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ فَقَالَتْ: لِمَ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: لأَنَّكُنَّ تُكْثِرْنَ الشَّكَاةَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ. قَالَ: فَجَعَلْنَ يَتَصَدَّقْنَ مِنْ حُلِيِّهِنَّ يُلْقِينَ فِي ثَوْبِ بِلالٍ مِنْ أَقْرَاطِهِنَّ وَخَوَاتِيمِهِنَّ)) [٢].

---

١ البخاري (٩٨٥) (٥٥٦٢) (٦٦٧٤) (٧٤٠٠) مسلم (١٩٦٠/٢،١)

٢ رواه مسلم (٨٨٥) البخاري (٩٧٨)

واته: له جابری کوڕی عەبدوڵلاوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەستی کرد به نوێژ پێش وتار خوێندنەوه، بەبێ بانگ و قامەت، پاشان هەستا پاڵی دا بوو به بیلالەوه (ڕەزای خوای لێبێ) ئینجا فەرمانی کرد بەپاراستنی سنورەکانی خودا وه هاندان لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی، وه ئامۆژگاری خەڵکی کردوو بیری چاکەکردنی خستەوه یادیان، پاشان چوو بۆلای ئافرەتەکان، ئامۆژگاری کردن و بیری چاکەکردنی خستەوه یادیان، ئینجا فەرمووی ئەی کۆمەڵەی ئافرەتان چاکه بکەن چونکه ئێوه زۆرینەی سوتەمەنی دۆزەخن، ئافرەتێك هەستا که لەناوەڕاستییاندا دانیشتبووکوڵمەکانی ڕەش بووبویەوه لەبەر نەخۆشی یاخود پیری یاخود زگماکی وتی بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ((چونکه ئێوه ناڕەزایی زۆر دەردەبڕن وه کوفرانەی نیعمەت زۆر دەکەن)) جابر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ئافرەتەکان دەستیان کرد به خێر کردن له ئاڵتونەکانیان دەیان خسته ناو پۆشاکەکەی بیلالەوه (ڕەزای خوای لێبێ) له گوارەو مستیلەکانیان)).

١٤٢ – عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ – نُسَيْبَةَ الأنْصَارِيَّةِ – قَالَتْ: ((أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ نُخْرِجَ فِي الْعِيدَيْنِ الْعَوَاتِقَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، وَأَمَرَ الْحُيَّضَ أَنْ يَعْتَزِلْنَ مُصَلَّى الْمُسْلِمِينَ)) [١].

وَفِي لَفْظٍ: ((كُنَّا نُؤْمَرُ أَنْ نَخْرُجَ يَوْمَ الْعِيدِ، حَتَّى نُخْرِجَ الْبِكْرَ مِنْ خِدْرِهَا، حَتَّى تَخْرُجَ الْحُيَّضُ، فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ وَيَدْعُونَ بِدُعَائِهِمْ، يَرْجُونَ بَرَكَةَ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَطُهْرَتَهُ)) [٢].

واته: له دایکی عەطییەوه (ڕەزای خوای لێبێ) کەناوی نوسەیبەی ئەنصاریه دەڵێ: ((فەرمانی پێکردین مەبەستی پێغەمبەری خوایه(ﷺ) کەله جەژندا دەریکەین کچه

---

١ البخاري (٣٥١) (٩٧١) (٩٧٤) (٩٨١) مسلم (٨٩٠)

٢ البخاري (٩٧١)

عازەبەکان و وە ئەوانەی کە خۆیان دەرنەدەخست وە فەرمانی دەکرد بە حەیزدارەکان کە دوور بکەونەوە لە شوێن نوێژی موسڵمانان)).

وە لەدەربڕینێکی تردا: دەڵێ: ئێمە فەرمانمان پێدەکرا کە دەرچین لە ڕۆژی جەژندا هەتا کچانیش لە پەچەکانیاندا، وە حەیز دارەکانیش، الله أکبر بکەن بە الله أکبر کەیان وە بپاڕێنەوە وەك ئەوان، هەتا بەرەکەتی ئەو ڕۆژەیان بەر بکەوێت وە پاك بوونەوە لە تاوان)).

## بابُ صلاةِ الكُسُوفِ - بەشی نوێژی خۆر و مانگ گیران

١٤٣ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ((أَنَّ الشَّمْسَ خَسَفَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَبَعَثَ مُنَادِياً يُنَادِي: الصَّلاةُ جَامِعَةٌ. فَاجْتَمَعُوا. وَتَقَدَّمَ، فَكَبَّرَ وَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ)) [1].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((خۆر گیرا لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)جا کەسێکی نارد بانگی کرد کە ئامادەی نوێژبن خەڵك کۆبوونەوە وە پێغەمبەر (ﷺ) پێش کەوت الله أكبری کرد ئینجا چوار ڕکات نوێژی کرد لە دوو ڕکاتدا (واتە لە دوو وەستاندا دووجار قورئانی خوێند وە دووجار ڕکوعی برد) وە چوار کڕنوشی برد)).

١٤٤ – عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ – عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، يُخَوِّفُ اللهُ بِهِمَا عِبَادَهُ، وَإِنَّهُمَا لا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ مِنْ النَّاسِ وَلاَ لِحَيَاتِه. فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُمَا شَيْئًا فَصَلُّوا، وَادْعُوا حَتَّى يَنْكَشِفَ مَا بِكُمْ)) [2].

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە ناوی عوقبەی کوڕی عامری ئەنصاریە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ((بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی پەروەردگار، بەندەکانی خۆی پێدەترسێنێت، وە خۆرو مانگ ناگیرێن لەبەر ژیان و مردنی هیچ کەسێك، ئەگەر شتێکتان بینی تیایاندا (واتە ئەگەر خۆر گیران ومانگ گیران ڕویدا) ئەوا نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە هەتا ڕوناکیتان بۆ دەگێڕێتەوە)). (واتە تا ماوەی مانگ گیران و خۆر گیرانەکە تەواو دەبێت).

---

١ البخاري (١٠٦٦) مسلم (٩٠١)

٢ البخاري (١٠٤١) (١٠٥٧) (٣٢٠٤) مسلم (٩١١)

١٤٥ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَامَ فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم بِالنَّاسِ. فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ، فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ – وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ – ثُمَّ رَكَعَ، فَأَطَالَ الرُّكُوعَ – وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ – ثُمَّ سَجَدَ، فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الأُخْرَى مِثْلَ مَا فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَقَدْ إِنْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لا تَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللهَ وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا، ثُمَّ قَالَ: يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللهِ مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ، أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً))[١].

وَفِي لَفْظٍ: ((فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ))[٢].

واته: له دایكمان عائیشهوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((خۆر گیرا لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) جا پێغەمبەر (ﷺ) هەستا نوێژی بۆ خەڵك كرد درێژەی دا بە قیامەكەی، پاشان ڕكوعی برد درێژەی دا بەڕكوعەكەی، پاشان هەستایەوە، درێژەی دا بە قیامەكەی بەڵام كەمتر لەیەكەم جار، پاشان ڕكوعی برد درێژەی دا بەڕكوعەكەی بەڵام كەمتر لەیەكەم جار، پاشان سوجدەی بردو درێژەی دا بە سوجدەكەی، پاشان ئەوەی كەلە ڕكاتی یەكەمدا ئەنجامیدا لە ڕكاتی دووەمدا دووبارەی كردەوە، پاشان سەلامی دایەوە خۆریش ڕۆشن بووبۆوە، ئینجا وتاری بۆ خەڵك خوێندەوەو سوپاس و ستایشی خوای كرد پاشان فەرمووی (( بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی پەروەردگار، ناگیرێن لەبەر ژیان و مردنی هیچ كەسێك، كاتێك ئەمەتان دی لە پەروەردگار بپاڕێنەوەو الله أكبرو نوێژو خێرو چاكە بكەن: پاشان فەرمووی:

---

١ البخاري (١٠٤٤) (١٠٤٦) (١٠٤٧) (١٠٥٨) (٣٢٠٣) (٥٢٢١) مسلم (٩٠١)

٢ مسلم (٩٠١/٣)

ئەی ئومەتی موحەمەد سوێند بە خودا هیچ کەسێك لە خوای گەورە بەغیرەتتر نیە یەکێك لە بەندەکانی کە داوێن پیسی بکەن جا چ نێر بێت یان مێ ئەی ئومەتی موحەمەد سوێند بە خودا ئەوەی کە من دەیزانم ئەگەر ئێوەبتان زانیایە ئەوا کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان)).

وە لەدەربڕینێکی تردا دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەر (ﷺ)چوار ڕکات نوێژی کرد وە چوار سوجدەشی برد)).

١٤٦– عَنْ أَبِي مُوسَى الأشْعَرِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى زَمَانِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم. فَقَامَ فَزِعاً، وَيَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ،حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ. فقَامَ، فَصلَّى بِأَطْولِ قِيَامٍ وَسُجُودٍ، مَا رَأَيْتُهُ يَفْعَلُهُ فِي صَلاتِهِ قَطّ، ثُمَّ قَالَ: إنَّ هَذِهِ الآيَاتِ الَّتِي يُرْسِلُهَا اللهُ تَعَالى: لا تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ. وَلَكِنَّ اللهَ يُرْسِلُهَا يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئاً فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ))[1] .

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:(( خۆر گیرا لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)جا پێغەمبەر (ﷺ) هەستا بەپەلە ترسا کە ڕۆژی دوایی بێت، هەتا هاتە مزگەوت، ئینجا نوێژی کرد بە درێژ ترین وەستان و ڕکوع و سوجدەوە، هەرگیز نەمدیبوو لە نوێژدا وابکات، پاشان فەرمووی: بێگومان ئائەم نیشانانە کە خوای گەورە دەینێرێ لەبەر ژیان و مردنی هیچ کەسێك نیە، بەڵکو خوای گەورە دەینێرێ بەندەکانی خۆی پێدەترسێنێت کاتێك شتێکی واتان دی هەستن بەپەلە یادی خوا بکەن و لێیبپاڕێنەوەو داوای لێبوردنی لێبکەن)).

١ البخاري (١٠٥٩) مسلم (٩١٢)

## بـابُ الاستسقاءِ - بەشى نوێژە بارانە

١٤٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمِ الْمَازِنِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((خَـرَجَ النَّبِـيُّ صلَّى الله عليـه وسـلم يَسْتَـسْقِي، فَتَوَجَّـهَ إِلَـى الْقِبْلَـةِ يَـدْعُو، وَحَـوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُـمَّ صَـلَّى رَكْعَتَيْنِ، جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ)) [١]. وَفِي لَفْظٍ " أَتَى الْمُصَلَّى " [٢].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصمی مازنیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ)دەرچوو بۆ نوێژە بارانە ڕوی کردە قیبلەو پاڕایەوە، وە جلەکانی هەڵگێڕایەوە، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، دەنگی بەرزکردەوە تیایدا بە قوڕئان خوێندن)). وە لەدەربڕینێکی تردا عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصمی مازنی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ شوێنی نوێژ کردن)).

١٤٨ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – ((أَنَّ رَجُـلاً دَخَـلَ الْمَـسْجِدَ يَـوْمَ الْجُمُعَـةِ مِنْ بَابٍ كَانَ نَحْوَ دَارِ الْقَضَاءِ، وَرَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَـائِمٌ يَخْطُـبُ، فَاسْـتَقْبَلَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَائِمًا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلَكَتِ الأَمْـوَالُ، وَانْقَطَعَـتِ السُّبُلُ فَادْعُ اللهَ يُغِيثُنَا، قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَدَيْهِ ثُمَّ قَـالَ: اللَّهُـمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا. قَالَ أَنَسٌ: فَلا وَاَللَّهِ مَا نَـرَى فِـي الـسَّمَاءِ مِـنْ سَحَابٍ وَلا قَزَعَةٍ، وَمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلا دَارٍ قَالَ: فَطَلَعَتْ مِـنْ وَرَائِـهِ سَحَابَةٌ مِثْـلُ التُّـرْسِ. فَلَمَّا تَوَسَّطَتِ السَّمَاءَ انْتَشَرَتْ ثُمَّ أَمْطَرَتْ، قَالَ: فَلا وَاَللَّهِ مَا رَأَيْنَا الشَّمْسَ سَبْتاً، قَالَ: ثُـمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذَلِكَ الْبَابِ فِـي الْجُمُعَـةِ الْمُقْبِلَـةِ وَرَسُـولُ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسـلم قَـائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قَائِماً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتْ الـسُّبُلُ، فَـادْعُ اللهَ يُمْسِكُهَا عَنَّا، قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَدَيْهِ ثُمَّ قَـالَ: اللَّهُـمَّ حَوَالَيْنَـا وَلا

١ البخاري (١٠٢٤) واللفظ له مسلم (٨٩٤/٤)

٢ البخاري (١٠٢٧) مسلم (٨٩٤/٣،٢،١)

عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالظِّرَابِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ، قَالَ: فَأَقْلَعَتْ، وَخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْسِ))[١]. قَالَ شَرِيكٌ: فَسَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: أَهُوَ الرَّجُلُ الأَوَّلُ؟ قَالَ: لا أَدْرِي)).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پیاوێك هاتە مزگەوتەوە لەڕۆژی هەینیدا لەدەرگایەکەوە نزیك دارو القضاء وە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەپێوە وتاری دەخوێندەوە، ڕوی کردە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بە پێوە ئینجا وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ماڵ و دەغڵ و دانمان تیاچوو وە ڕێگاکان پچڕان (واتە کاروانیەکان نەمان) لە خوا بپاڕێرەوە بارانمان بۆ ببارێنێت دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ)هەردوو دەستی بەرز کردەوە پاشان فەرمووی: پەروەردگارا بارانمان بۆ ببارێنە،

پەروەردگارا بارانمان بۆ ببارێنە، پەروەردگارا بارانمان بۆ ببارێنە، ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: نەخێر سوێند بەخوا نەهەورمان دی بە ئاسمانەوە نە پەڵەیەکیش وە لە نێوان ئێمەو کێوی سەلعدا کە لە خۆرئاوای مەدینەوەیە هیچ ماڵ و خانویەك نەبوو (واتە ئاسمانمان جوان لێوە دیار بوو) دەڵێ: لە پشتی ئەو کێوەوە هەورێك هەڵهات وێنەی قەڵغان، کاتێك گەشتە ناوەڕاستی ئاسمان، بڵاو بۆوە پاشان بارانی باراند، دەڵێ: سوێند بە خوا خۆرمان نەدی یەك هەفتە، دەڵێ: پاشان پیاوێك هاتە ژوورەوە هەفتەی داهاتوو هەر لەهەمان دەرگاوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپێوە وتاری دەخوێندەوە، ڕوی کردە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پێوە ئینجا وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ماڵ و دەغڵ و دانمان تیاچوو وە ڕێگاکان پچڕان لە خوا بپاڕێرەوە بیگرێتەوە لێمان، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو دەستی بەرز کردەوە پاشان فەرمووی: پەروەردگارا بیبارێنە بە چوار دەورماندا نەك بەسەرماندا، پەروەردگارا بیبارێنە بەسەر تەپۆڵکەکان و نیمچە شاخەکان و دۆڵ و شیوەکان و شوێنی سەوز

---

١ البخاري (١٠١٣) مسلم (٨٩٧)

بــوونی داروكژوكیاوســەوزایەكان)) ئەنــەس (ڕەزای خــوای لێبــێ) دەڵــێ: هــەور بــە ئاسمانەوە نەما ئینجا ئێمە دەرچووین لەبەر خۆر دەڕۆشتین)).

شەریك (ڕەحمەتی خـوای لێبـێ) دەڵـێ:پرسـیم لـە ئەنەسـی كـوڕی مالیـك (ڕەزای خوای لێبێ) هەر پیاوەكەی هەفتەی پێشوو بوو؟ دەڵێ: ئەنـەس (ڕەزای خـوای لێبـێ) وتی نازانم.

## بابُ صلاةِ الخوفِ - بەشی نوێژی ترس

ئەم نوێژە یەك هۆكار زیاتر نیە بۆ كردنی ئەویش ترسە جا چ لە شوێنی نیشتەجێبووندا بێت یان لە سەفەردا بێت وە بەچەند شێوازێك فەرمووده لەبارەیەوە هاتووه بەهەموو شێوازەكان دروستە.

١٤٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنهما قَالَ: ((صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم صَلاةَ الْخَوْفِ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ، فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ، وَطَائِفَةٌ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ذَهَبُوا، وَجَاءَ الآخَرُونَ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، وَقَضَتِ الطَّائِفَتَانِ رَكْعَةً، رَكْعَةً)) [1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی ترسی پێكردین لە هەندێك لەو ڕۆژانەی كەگەیشت بە دوژمن، جا كۆمەڵێك لەگەڵیدا هەستان، وە كۆمەڵێكیش بەرامبەر دوژمن، نوێژی كرد بەو كۆمەڵەی كە لەگەڵیدا بوو ڕكاتێ پاشان ڕۆشتن، ئەوانی تر هاتن ڕكاتێكی بەوانیش كرد، ئینجا هەردوو كۆمەڵەكە ڕكاتەكەی خۆیان تەواو كرد)).

١٥٠ – عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتِ بْنِ جُبَيْرٍ عَمَّنْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم صَلاةَ ذَاتِ الرِّقَاعِ، صَلاةَ الْخَوْفِ: أَنَّ طَائِفَةً صُفَّتْ مَعَهُ، وَطَائِفَةً وِجَاهَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِماً، فَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَصَفُّوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتْ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى، فَصَلَّى بِهِمْ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ، ثُمَّ ثَبَتَ جَالِساً، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ)) [2].

---

١ البخاري (٩٤٢) مسلم (٨٣٩/٣٠٦)

٢ البخاري (٤١٢٩) (٤١٣١) مسلم (٨٤٢)

واتــه: لـه یەزیـدی کـوڕی ڕومانـەوه ئـەویش لـه صـالّەحی کـوڕی خـەواتی کـوڕی جوبـەیرەوه (ڕەزای خوایـان لێبـێ) ئـەویش لـەو کەسـەی کـه نوێـژی کـردووه لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نوێژی ذَاتُ الرِّقَاعِ، نوێژی تـرس، کـه کۆمـەڵێك ڕیزیـان بەسـت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وه کۆمەڵێکیش ڕووبەڕووی دوژمن، یـەك ڕکـات نوێـژی کرد بەوانەی لەگەڵیدا بوون، پاشان به پێوه وەستا، ئەوان نوێژەکەیان بۆ خۆیان تەواو کـرد، پاشـان سـەلامیان دایـەوەو لاچـوون، ڕیزیـان بەسـت ڕووبـەڕووی دوژمـن، ئینجـا کۆمەڵی دووەم هاتن، ئەو ڕکاته نوێژەی پێکردن که مـابوو، پاشـان بـه دانیـشتنانەوه مایەوه، هەتا ئەوانیش ڕکاتەکەیان بۆ خۆیان تەواو کرد، ئینجا سەلامی پێدانەوه)).

الرجل الذي صلى مع رسول الله صلَّى الله عليه وسلم هو سهل بن أبي حَثْمَة.

ئەو پیاوەی نوێژی کرد لەگەڵ پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ)نـاوی سـەهلی کـوڕی ئـەبو حەثمه بوو (ڕەزای خوای لێبێ).

١٥١ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ رضي الله عنهما قَالَ: ((شَـهِدْتُ مَـعَ رَسُـولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم صَـلاةَ الْخَـوْفِ فَـصَفَفْنَا خَلْـفَ رَسُـولِ اللَّـهِ صـلَّى الله عليـه وسـلم وَالْعَدُوُّ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَكَبَّـرَ النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليـه وسـلم وَكَبَّرْنَـا جَمِيعـاً، ثُـمَّ رَكَـعَ وَرَكَعْنَا جَمِيعاً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ وَرَفَعْنَا جَمِيعاً، ثُمَّ انْحَدَرَ بِالسُّجُودِ وَالصَّفُّ الَّـذِي يَلِيهِ، وَقَـامَ الـصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ فِـي نَحْـرِ الْعَـدُوِّ، فَلَمَّـا قَـضَى النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليـه وسـلم السُّجُودَ، وَقَامَ الصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ: انْحَدَرَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ بِالسُّجُودِ، وَقَامُوا، ثُمَّ تَقَدَّمَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ، وَتَأَخَّرَ الصَّفُّ الْمُقَدَّمُ، ثُمَّ رَكَعَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسـلم وَرَكَعْنَـا جَمِيعـاً، ثُـمَّ رَفَـعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ فَرَفَعْنَا جَمِيعاً، ثُمَّ انْحَدَرَ بِالسُّجُودِ، وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ – الَّذِي كَـانَ مُؤَخَّرًا فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى – فَقَامَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ فِي نَحْرِ الْعَدُوِّ، فَلَمَّا قَـضَى النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليه وسلم السُّجُودَ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ: انْحَدَرَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ بِالـسُّجُودِ، فَـسَجَدُوا ثُـمَّ

سَلَّمَ النَّبيُّ صلَّى الله عليه وسلم وَسَلَّمْنَا جَمِيعاً))[١]. قَالَ جَابِرٌ: كَمَا يَصْنَعُ حَرَسُكُمْ هَؤُلاءِ بِأُمَرَائِكُمْ)).

وَذَكَرَهُ مُسْلِمٌ بِتَمَامِهِ. وَذَكَرَ الْبُخَارِيُّ طَرَفاً مِنْهُ: ((وَأَنَّهُ صَلَّى صَلاةَ الْخَوْفِ مَعَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فِي الْغَزْوَةِ السَّابِعَةِ، غَزْوَةِ ذَاتِ الرِّقَاعِ))[٢].

واتـه: لـه جـابرى كـوڕى عەبـدوڵڵای ئەنـصاريەوە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: ((ئامادەی نوێژی ترس بووم لەگەڵ پێغەمبەری خـوادا (ﷺ)، ڕیزمـان بەسـت لـەدوای پێغەمبـەری خــواداوە (ﷺ) وە دوژمنــیش لــە نێــوان ئێمــەو قیبلــەدا بــوو، جـا پێغەمبەر(ﷺ) الله أكبری كرد ئێمەش هەموومان الله أكبرمان كرد، پاشان ڕكوعی بـرد، ئێمـەش هـەموومان ڕكوعمـان بـرد، پاشـان سـەری بـەرز كـردەوە لـە ڕكـوع ئێمـەش هەموومان سەرمان بەرز كردەوە، پاشان چووە سوجدە وە ئەو ڕیزەشـی كەلەدوایـەوە بوو، وە ڕیزەكەی دواتـریش ڕوو بـەڕووی دوژمـن وەسـتا، كاتێـك كـە پێغەمبـەر (ﷺ) سوجدەی تەواو كرد وە ئەو ڕیزەشی كەلە دوایەوە بوو، ڕیزی دواتـر چـوونە سـوجدەو هەڵیشسانەوە، ئینجا ڕیـزی دواوە چـوونە پێـشەوە، وە ڕیـزی پێـشەوە چـوونە دواوە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ)ڕكوعی برد، ئێمـەش هـەموومان ڕكوعمـان بـرد، پاشـان سـەری بەرز كردەوە لە ڕكوع ئێمەش هەموومان سەرمان بەرز كردەوە، پاشان چووە سـوجدە وە ئەو ڕیزەشی كەلەدوایەوە بوو، ئەو ڕیـزەی كەلـەڕكاتی یەكەمـدا لـە دواوە بـوو، وە ڕیزەكەی دواتریش ڕوو بەڕووی دوژمن وەسـتا، كاتێـك كـە پێغەمبـەر (ﷺ)سـوجدەی تەواو كرد وە ئەو ڕیزەشی كەلە دوایەوە بوو، ڕیزی دواتر چوونە سوجدەو سـوجدەیان برد، پاشان پێغەمبەر (ﷺ)سەلامی دایەوە وە ئێمەش هەموومان سەلاممان دایەوە)).

---

١ مسلم (٨٤٠)

٢ البخاري (٤١٢٥)

جـابر (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: ((هـەروەك ئـەو پاسـەوانانەی ئێـوە پاسـەوانی گەورەكانیان دەكەن)) پێشەوا موسلیم بە تەواوی هێناویەتی.

وە پێشەوا بوخاری بەشێكی باس كردووە ((كە جـابر (ڕەزای خـوای لێبـێ) نوێـژی ترسی كـردووە لەگـەڵ پێغەمبـەردا(ﷺ)لـە جـەنگی حەوتەمـدا كـەناوی جـەنگی (ذَاتُ الرِّقَاعِ)ە)).

# كتابُ الجنائزِ: بەشی مردوو

## بابُ في صلاةِ على الغائب وعلى القبر
## بەشی نوێژکردن لەسەر مردووی دوور یان لەسەر گۆڕ

١٥٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((نَعَى النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم النَّجَاشِيَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ أَرْبَعاً)).[1]

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) پێغەمبەر(ﷺ)هەواڵی مردنی نەجاشی (ڕەزای خوای لێبێ) ڕاگەیاند لەو ڕۆژەی کەتیایدا مرد، ئینجا چوو بۆ شوێنی نوێژ کردن وە چوار الله أکبری لەسەر کرد)).

نەجاشی (ڕەزای خوای لێبێ) پادشای حەبەشە بوو ناوی ئەصحەمە بوو لە مانگی ڕەجەبدا لەساڵی نۆهەمی هیجریدا مردووە.

١٥٣ – عَنْ جَابِرِ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم صَلَّى عَلَى النَّجَاشِيِّ، فَكُنْتُ فِي الصَّفِّ الثَّانِي، أَوْ الثَّالِثِ)) [2].

واتە: لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی لەسەر نەجاشی کرد (ڕەزای خوای لێبێ) من لە ڕیزی دووەم یان سێهەمدا بووم)).

---

١ البخاري (١٣٣٣) مسلم (٩٥١)

٢ البخاري (٣٨٧٨)

١٥٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّـاسٍ رضـي الله عنهمـا: ((أَنَّ النَّبِـيَّ صـلَّى الله عليـه وسـلم صَلَّى عَلَى قَبْرٍ، بَعْدَ مَا دُفِنَ، فَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعاً)) [١].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عەباسـەوە (ڕەزای خوایـان لێبـێ) دەڵـێ: : (( پێغەمبـەر (ﷺ)نوێژی کرد لەسەر گۆڕێك دوای ئەوەی کە نێژرابوو چوار الله أکبری لەسەر کرد)).

١ مسلم (٩٥٤)

## بابُ في الكفن - بەشی كفن كردن

١٥٥ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلا عِمَامَةٌ)) [1].

واته: له دايكمان عائيشەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەر (ﷺ) كفن كرا له سێ پارچه قوماشی يەمەنی سپيدا، نه كراس و نه مێزەری تيادا نه بوو)).

سَحُولِيَّةٍ = گوندێكه لەيەمەن، كۆی سحله = پۆشاكی سپی.

---

١ البخاري (١٢٦٤) (١٢٧١) (١٢٧٢) (١٢٧٣) واللفظ له مسلم (٩٤١/٤٧،٤٦،٤٥)

## بابُ في صفة تغسيل الميِّت وتشيع الجنازة
## بەشى چۆنيەتى شوردنى مردوو وە ناشتنى

١٥٦ - عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأنْصَارِيَّةِ قَالَتْ: ((دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم حِينَ تُوُفِّيَتْ ابْنَتُهُ زَيْنَبُ، فَقَالَ: اغسِلْنَهَا بِثَلاثٍ، أَوْ خَمْسٍ، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ - إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكِ - بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الأخِيرَةِ كَافُوراً - أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ - فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي)) فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ. فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ تَعْنِي إِزَارَهُ[1].

واته: له ئومو عەطيەى ئەنصاريەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لامان لەوكاتەى كە زەينەبى كچى (ڕەزاى خواى لێبێ) مرد، جا فەرمووى بيشۆن بەئاو وسيدر سێ جار يان پێنج جار يان زياتر، بەچەند جار پاك بۆەوە بەوەندە ((ئەگەر بەپێويستان زانى))، با لە كۆتايدا كافورى تێدا بێت، يان كەمێك لە كافور، وە كاتێك تەواو لێبوونەوە ئاگادارم بكەنەوەو بانگم بكەن، دەڵێ: كاتێك تەواو بوين ئاگادارمان كرد، ئەويش پۆشتە ماڵەكەى دايێ و فەرمووى، لەشى پێدابپۆشن، مەبەستى پۆشتە ماڵەكەى بوو)).

وَفِي رِوَايَةِ البخاري "أَوْ سَبْعاً[2]" وَقَالَ: ((ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا))[3]: وَإِنَّ أُمَّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: وَجَعَلْنَا رَأْسَهَا ثَلاثَةَ قُرُونٍ)) [4].

وە لەدەربڕينێكى تردا لەلاى پێشەوا بوخارى ((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى يان حەوت جار بيشۆن وە فەرمووى لەلاى ڕاست و شوێنى دەستنوێژەوە دەست بكەن بە

---

١ البخاري (١٢٥٧) مسلم (٩٣٩)

٢ البخاري (١٢٥٩) مسلم (٩٣٩/٣٩)

٣ البخاري (١٢٥٦) مسلم (٩٣٩/٤٢)

٤ البخاري (١٢٥٩) مسلم (٩٣٩/٣٩)

شۆردنی وه بێگومان ئومو عەطیەی (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: سێ گرێمان لەسەری دا)).

١٥٧ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، إذْ وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِه، فَوَقَصَتْهُ – أَوْ قَالَ: فَأَوْقَصَتْهُ – فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ. وَلا تُحَنِّطُوهُ، وَلا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ. فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً)) [1]. وَفِي رِوَايَةٍ: ((وَلا تُخَمِّرُوا وَجْهَهُ وَلا رَأْسَهُ)) [2].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((له کاتێکدا پیاوێك له کێوی عەرەفە ڕاوەستابوو، لەناکاو لەسەر وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە ملی شکا یاخود دەڵێ:، وڵاخەکەی ملی شکاند، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بیشۆن بە ئاوو سیدر، وه کفنی بکەن بە دووپارچە پۆشاکەکەی که بۆ ئیحرام بەستویەتی، وه بۆنی خۆشی لێمەدەن، سەریشی دامەپۆشن، چونکە ئەو زیندوو دەبێتەوە لە ڕۆژی دوایدا بە لە لبَيْكَ اللَّهُمَ لَبَيْكْ)).

وه لەدەربڕینێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: سەرو دەموچاوی دامەپۆشن.

قَالَ الْمُصَنِفُ: الوَقْصُ: كَسْرُ العُنُقِ.

دانەری کتێب دەفەرمووێ: وَقْصُ: واته: مل شکان

١٥٨ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً: فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إلَيْهِ. وَإِنْ تَكُ سِوَى ذَلِكَ: فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ)) [3].

---

١ البخاري (١٢٦٥)(١٢٦٦) (١٢٦٧) (١٢٦٨) (١٨٤٩) (١٨٥٠) (١٨٥١) مسلم (٩٨،٩٤،٩٣/١٢٠٦)

٢ البخاري(١٢٦٦) (١٢٦٧) (١٢٦٨) (١٨٤٩) (١٨٥٠) (١٨٥١) مسلم (٩٨،٩٤،٩٣/١٢٠٦)

٣ البخاري (١٣١٥) مسلم (٩٤٤)

واته: له ئەبوهورەیرەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ((پەله بکەن له بردن و ناشتنی جەنازەدا، چونکه ئەگەر باش و خواناس بێت، ئەوا بەرەو خۆشیو شادی دەبەن، بەلاَم ئەگەر وانەبوو ئەوا شەڕو خراپەیەکە لە کۆڵ و گەردنی خۆتانی دەکەنەوە)).

١٥٩- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأنْصَارِيَّةِ رضي الله عنها قَالَتْ: ((نُهِينَا عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا)) [1].

واته: له ئومو عەطیەی ئەنصاریەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئێمەی ئافرەتان قەدەغەمان لێدەکرا لەشوێن کەوتنی مردوو بەلاَم زۆر جەختیش لەسەرمان نەدەکرا))

١ البخاري (١٢٧٨) مسلم (٩٣٨)

## بابُ في موقف الإمام من الميت - بەش شوێنی وەستانی ئیمام لای مردووەکە

١٦٠ – عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ– رضي الله عنه – قَالَ: ((صَلَّيْتُ وَرَاءَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا فَقَامَ فِي وَسْطَهَا)) [١].

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((نوێژم کرد لەدوای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لەسەر ئافرەتێك کەلەزەیستانیدا مردبوو لەناوەڕاستیدا وەستا)).

١ البخاري (١٣٣١) (١٣٣٢) (٣٣٢) مسلم (٩٦٤)

## بابُ في تحْريم التسخط بالفعل والقول
## بەشی حەرامی نارەزایی و تورەیی دەربڕین بە کردەوە یان بە وتە

١٦١ - عَنْ أَبِي مُوسَى عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ- رضي الله عنه - : ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم بَرِيءٌ مِنْ الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ)) [١].

قال المصنف: الصالقة، التي ترفع صوتها عند المصيبة.

واتە: لە ئەبو موساوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی قەیسە دەڵێ:((پێغەمبەری خواوە (ﷺ) خۆی بەری کرد لەو ئافرەتانەی کە لەکاتی بەڵاو ناڕەحەتیدا دەنگ بەرز دەکەنەوە وە ئەوانەشی کە قژی خۆیان دەڕنن وە ئەوانەشی کە یەخەی خۆیان دادەڕنن)).

تێبینی وەرگێڕ: ئەم فەرموودەیە تەنها تایبەت نیە بە ئافرەتانەوە بەڵکو پیاوانیش دەگرێتەوە.

١٦٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ - رضي الله عنه - عَنِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم أَنَّهُ قَالَ: ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ)) [٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی لە ئێمە نییە ئەو کەسەی لەڕومەتی خۆی دەدا وە یەخەی خۆی دادەدڕێ وە دەنگ و هاوارو شین و واوەیلێی لێبەرز دەبێتەوە وەك سەردەمی نەفامی)).

---

١ البخاري (١٢٩٦) مسلم (١٠٤)

٢ البخاري (١٢٩٤) (١٢٩٧) (١٢٩٨) (٣٥١٩) مسلم (١٠٣)

١٦٣ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَ: ((لَمَّا اشْتَكَى النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم ذَكَرَ بَعْضُ نِسَائِهِ كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ، يُقَالُ لَهَا: مَارِيَةُ – وَكَانَتْ أُمُّ سَلَمَةَ وَأُمُّ حَبِيبَةَ أَتَتَا أَرْضَ الْحَبَشَةِ – فَذَكَرَتَا مِنْ حُسْنِهَا وَتَصَاوِيرَ فِيهَا، فَرَفَعَ رَأْسَهُ صلَّى الله عليه وسلم وَقَالَ: أُولَئِكَ إِذَا مَاتَ فِيهِمْ الرَّجُلُ الصَّالِحُ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِداً، ثُمَّ صَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللهِ)) [1].

واته: له دايكمان عائيشەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش کەوت هەندێك لە خێزانەکانی (ڕەزای خوایان لێبێ) باسی کەنیسەیەکیان کرد کە بینیبویان لە زەوی حەبەشە کە پێی دەوترا (ماریە) وە ئومو سەلەمەو ئومو حەبیبە (ڕەزای خوایان لێبێ) چووبوون بۆ زەوی حەبەشە باسی جوانی و ئەو وێنانەیان کرد کە تیایدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ)سەری بەرز کردەوەو فەرمووی ((ئائەوانە کاتێك پیاو چاکێك تیایاندا بمردایە لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد، پاشان ئەو وێنانەیان تیادا دەکێشا، ئائەوانە خراپترین مرۆڤن لەلای خودا)).

١٦٤ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي مَرَضِهِ الَّذِي لَمْ يَقُمْ مِنْهُ: ((لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ)). قَالَتْ: وَلَوْلا ذَلِكَ لَأُبْرِزَ قَبْرُهُ غَيْرَ أَنَّهُ خُشِيَ أَنْ يُتَّخَذَ مَسْجِداً " [2].

واته: لە دايكمان عائيشەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی لەو نەخۆشییەیدا کەتیایدا هەڵنەسایەوە: نەفرینی خودا بێت لە گاور و جولەکەکان، چونکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکرد بەمزگەوت)) عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئەگەر لەترسی ئەوە نەبوایە ئێستا گۆڕەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرزدەکرایەوە، جگە لەوە نەبێت کە ترسی ئەوە هەبوو کە گۆڕەکەی بکرایەتە مزگەوت)).

١ البخاري (١٣٤١) (٣٨٧٣) مسلم (٥٢٨)

٢ البخاري (١٣٣٠) (١٣٩٠) (٤٤٤٣) (٤٤٤٤) مسلم (٥٣٠/٢١)

١٦٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: ((مَنْ شَهِدَ الْجِنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ. وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ. قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ))[1].

وَلِمُسْلِمٍ: ((أَصْغَرُهُمَا مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ))[2].

واته: له ئەبوهورەيرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی ((ئەو کەسەی ئامادەی مردوویەك بێت هەتا نوێژی لەسەر دەکرێت ئەوا قیراتێکی بۆ هەیە وە ئەوەش ئامادەی دەبێت هەتا دەنێژرێت دوو قیراتی بۆ هەیە، جا وترا دوو قیرات چین؟ فەرمووی، وێنەی دوو کێوی گەورە وایە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا موسلیم پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((بچووکەکەیان وێنەی کێوی ئوحود وایە)).

---

١ البخاري (١٣٢٥) مسلم (٩٤٥)

٢ مسلم (٩٤٥/٥٣)

## كتابُ الزكاةِ - پەرتووكى زەكات

١٦٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ - حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ -: ((إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْماً أَهْلَ كِتَابٍ. فَإِذَا جِئْتَهُمْ: فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ. فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ: أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ. فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ: أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ. فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ. وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ. فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ)) [1].

واته: له عەبدوڵلاّى كوڕى عەباسەوە (ڕەزاى خوايان لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى بە موعاذى كوڕى جەبەل (ڕەزاى خواى لێبێ) كاتێك كە ناردى بۆ يەمەن ((ئەى موعاذ تۆ دەچيت بۆلاى كەسانێك لە خاوەن كتێبەكان بانگيان بكە كە شايەتمان بهێنن

" أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ " جا ئەگەر ئەوان گوێڕايەڵى تۆيان كرد بۆ ئەوە، هەواڵيان بەرێ كە خواى گەورە لەشەو و ڕۆژێكدا پێنج نوێژى لەسەر فەرز كردوون، جا ئەگەر ئەوان گوێڕايەڵى تۆيان كرد بۆ ئەوەش، هەواڵيان بەرێ كە خواى گەورە زەكاتى لەسەر فەرز كردوون لە دەوڵەمەندەكانيان وەردەگيرێت دەدرێتەوە بە هەژارەكانيان، جا ئەگەر ئەوان گوێڕايەڵى تۆيان كرد بۆ ئەوەش، ئاگاداربە ماڵە بەنرخەكانيان لێوەرنەگريت، وەخۆشت لەنزاى ستەم لێكراو بپارێزە، چونكە لە نێوان ئەو و خواى گەورەدا پەردە نييە)).

---

١ البخاري (٤٣٤٧ (١٣٩٥) (١٤٥٨) (١٤٩٦) واللفظ له مسلم (١٩)

١٦٧ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضـي الله عنـه – قَـالَ: قَـالَ رَسُولُ اللهِ صـلَّى الله عليه وسلم : ((لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ. وَلا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ وَلا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ)) [1] .

واته: له ئـهبو سـهعيدى خودريـهوه (ڕهزاى خـواى لێبـێ) دهڵـێ:((پێغهمبـهر (ﷺ) فـهرمووى لـه زيـودا لـه پێـنج ئوقيـه كـهمتر زهكـاتى ناكـهوێت (هـهر ئوقيـهكيش چل درههمه، كهواته ٥ ئۆقيه = ٢٠٠ درههم زيو) وه له پێنج سهر وشتر كهمتريش زهكاتى تێدانييه، وه لهدهغڵ ودان و خورماشدا لـه پێـنج ويـسق كـهمتر زهكـاتى تێدانييـه (كـه بهرامبهر به ٦٥٢ كغم).

١٦٨ – عَنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رضـي الله عنـه أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليـه وسـلم قَـالَ: ((لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلا فَرَسِهِ صَدَقَةٌ)) [2] .

وَفِي لَفْظٍ: ((إلاَّ زَكَاةَ الْفِطْرِ فِي الرَّقِيقِ)) [3] .

عند مسلم (( لَيْسَ فِي العَبْدِ صَدَقَةٌ إلاَّ صَدَقَةُ الْفِطْرِ)) [4] .

واته: له ئهبوهورهيرهوه (ڕهزاى خواى لێبێ) دهڵێ:پێغهمبهرى خوا (ﷺ) فهرمووى ((بهنده و ئهسپ واجب نييه لهسهر موسڵمان زهكاتى لێبدات)).

وه لهدهربڕينێكى تـردا لـهلاى پێـشهوا ئـهبو داود پێغهمبـهرى خـوا (ﷺ)فـهرمووى ((جگه له زهكاتى سهرفتره نهبێت لهسهر بهنده)).

تێبينى وهرگێڕ: زهكاتى سهرفترهى بهنده دهبێت گهورهكهى بۆى بدات.

وه لـهدهربڕينێكى تـردا لـهلاى پێـشهوا موسـليم پێغهمبـهرى خـوا (ﷺ)فـهرمووى ((زهكات له بهندهدا واجب نييه جگه له زهكاتى سهرفتره نهبێت)).

---

١ البخاري (١٤٠٥) (١٤٤٧) (١٤٨٤) مسلم (٩٧٩)

٢ البخاري (١٤٦٤) (١٤٦٣) مسلم (٩٨٢)

٣ أبو داود (١٥٩٤)

٤ هو الذي في مسلم(٩٨٢/١٠)

١٦٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((الْعَجْمَاءُ جُبَارٌ. وَالبِئْرُ جُبَارٌ. وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ. وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ)) [١].

قال المصنف: الجبار: الهدر الذي لاشيء فيه. والعجماء: الدابة البهيم.

واته: له ئەبوهورەيرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر ئاژەڵ زیانێك بدات بەبێ کەم تەرخەمی خاوەنی ئەوا بەفیڕۆ دەڕوات، وە هەروەها کەسێك دابەزێتە بیرێکەوە بۆ ئیشکردن بێت یان بۆ ئاو دەرهێنان بێت هەرچی بەسەر بێت لەسەر خۆیەتی: تێبینی: ئەگەر زۆری لێنەکرابێت - وە هەروەها کەسێك کە لە کانزایەکدا ئیش دەکات هەرچی لێبێت لەسەر خۆیەتی، وە هەرکەسێك گەنجینەیەك بدۆزێتەوە ئەوا واجبە لەسەری بیکات بە پێنج بەشەوە یەك بەشیان بکات بەخێر)).

دانەری کتێب (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: جوبار: واتە بەفیڕۆ چوونێك کە هیچ لەبری نییە.

وە العجماء: واتە ئاژەڵ.

١٧٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم عُمَرَ – رضي الله عنه – عَلَى الصَّدَقَةِ. فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، وَالْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ، إلاَّ أَنْ كَانَ فَقِيراً: فَأَغْنَاهُ اللهُ تَعَالَى: وَأَمَّا خَالِدٌ: فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِداً. وَقَدْ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتَادَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ. وَأَمَّا الْعَبَّاسُ: فَهِيَ عَلَيَّ وَمِثْلُهَا. ثُمَّ قَالَ: يَا عُمَرُ، أَمَا شَعَرْتَ أَنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ)) [٢].

---

١ البخاري (١٤٩٩) (٢٣٥٥) (٦٩١٢) (٦٩١٣) مسلم (١٧١٠)

٢ البخاري (١٤٦٨) مسلم (٩٨٣)

واته: له ئەبوهورەیرەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)عومەری (ڕەزای خوای لێبێ) نارد بۆ کۆکردنەوەی زەکات وترا (ئیبن جەمیل) و (خالیدی کوڕی وەلید) و (عەباسی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەکاتیان نەداوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئیبن جەمیل ڕقی لەوە هەستاوە کە هەژار بوو خوا دەوڵەمەندی کرد، بەڵام خالید ئێوە ستەمی لێدەکەن ئەو قەڵغان وکەل و پەلی جەنگی لە ڕێگەی خوادا داناوە، بەڵام عەباس چەندی لەسەرە من بۆی دەدەم و ئەوەندەی تریش، پاشان فەرمووی: ئەی عومەر نەتزانیوە کە مامی هەموو کەسێك لەبری باوکێتی.

١٧١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ المازنيِّ قَالَ: ((لَمَّا أفَاءَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ يَوْمَ حُنَيْنٍ: قَسَمَ فِي النَّاسِ، وَفِي الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَلَمْ يُعْطِ الأنْصَارَ شَيْئاً. فَكَأَنَّهُمْ وَجَدُوا فِي أنْفُسِهِمْ إذْ لَمْ يُصِبْهُمْ مَا أصَابَ النَّاسَ. فَخَطَبَهُمْ، فقَالَ: يَا مَعْشَرَ الأنْصَارِ، ألَمْ أجِدْكُمْ ضُلاَّلاً فَهَدَاكُمْ اللهُ بِي؟ وَكُنْتُمْ مُتَفَرِّقِينَ فَألَّفَكُمْ اللهُ بِي؟ وَعَالَةً فَأغْنَاكُمْ اللهُ بِي؟. كُلَّمَا قَالَ شَيْئاً، قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أمَنُّ. قَالَ: مَا يَمْنَعُكُمْ أنْ تُجِيبُوا رَسُولَ اللهِ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أمَنُّ. قَالَ: لَوْ شِئْتُمْ لَقُلْتُمْ: جِئْتَنَا كَذَا وَكَذَا. ألا تَرْضَوْنَ أنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاةِ وَالْبَعِيرِ، وَتَذْهَبُونَ بالنَّبِيِّ إلَى رِحَالِكُمْ؟ لَوْلا الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنْ الأنْصَارِ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِياً أوْ شِعْباً لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأنْصَارِ وَشِعْبَهَا. الأنْصَارُ شِعَارٌ، وَالنَّاسُ دِثَارٌ إنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ بَعْدِي أثَرَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الْحَوْضِ)) [١].

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصمی مازنیەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((کاتێك کە خوای گەورە فەیئی بەخشی بە پێغەمبەرکەی (ﷺ) لە ڕۆژی جەنگی حونەیندا (فەیئ واتە ئەوماڵەی کە دەست موسڵمانان دەکەوێت بەبێ جەنگ) پێغەمبەر (ﷺ)بەشی کرد بەسەر خەڵك و ئەو کەسانەی کە تازە موسڵمان بووبوون ((ئەوانەی دڵیان ڕادەگیرێت))، هیچی لێنەدا بە ئەنصارییەکان، ئەوانیش هەروەك

١ البخاري (٤٣٣٠) مسلم (١٠٦١)

شتێك له ناخیاندا درووست بوو بێت وابوو، که هیچیان بەرنەکەوت لەوەی بەر خەڵك کەوت، جا وتاری بۆ خوێندنەوە (ﷺ) و فەرمووی (( ئەی کۆمەڵی ئەنصار ئایا ئێوە گومرا نەبوو خوا بە بۆنەی منەوە هیدایەتی دان؟، وە ئێوە جیاوازیتان تێدا نەبوو خوا بە بۆنەی منەوە هەمووتانی کرد بەیەك؟، وە هەژار نەبوون خوا بە بۆنەی منەوە دەوڵەمەندی نەکردن؟ جا پێغەمبەر (ﷺ)هەر شتێکی بفەرموویایە، دەیانوت: خوداو پێغەمبەرەکەی زیاتر منەتیان هەیە بەسەرمانەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی چی رێگریتان لێدەکات کە وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەدەنەوە، وتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی زیاتر منەتیان هەیە بەسەرمانەوە، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ((ئێوەش ئارەزوو بکەن دەڵێ:ن کاتێك تۆ هاتیت بۆلامان حاڵت ئاواو ئاوا بوو وە فەرمووی ئایا رازی نابن خەڵك بە مەڕو وشترەوە بڕواتەوە، ئێوەش بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بڕۆنەوەو ئەگەر کۆچکردن نەبوایە ئەوا من کەسێك ئەبووم لە ئەنصار، وە ئەگەر خەڵك شیوو دۆڵێك بگرن، وە ئەنصار شیو و دۆڵێکی تر بگرن ئەوا من شیو و دۆڵی ئەنصار دەگرمو ئەنصار وەك ئەو پۆشاکە وایە کە لەژێرەوە لەبەر دەکەرێ وە خەڵکیش وەك ئەو پۆشاکەی سەرەوە وان، وە ئێوە دوای من تووشی ستەم و ماف خواردن دەبن (بەوەی فەزڵی خەڵکانی تر دەدرێت بەسەر ئەنصاردا)، ئارام بگرن هەتا پێمدەگەن لەسەر حەوزی کەوسەر)).

## بابُ صدقة الفطرِ - بەشی زەكاتی سەرفترە

١٧٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم صَدَقَةَ الْفِطْرِ - أَوْ قَالَ رَمَضَانَ - عَلَى الذَّكَرِ وَالأُنْثَى وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوك: صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ. قَالَ: فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ، عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ)) [1].

وَفِي لَفْظٍ: ((أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاةِ)) [2].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەكاتی سەرفترە یاخود ڕەمەزانی فەرز كرد، لەسەر نێر و مێ و ئازاد و بەندە، مەنێك لە خورما، یاخود مەنێك لە جۆ)).

ڕوون كردنەوە: هەر صاعێك چوار مشتە وە هەر مشتێك ـ ٥٤٤ ـ غرامە وە چوار صاعەكە دوو كیلۆو سەدو حەفتاو شەش غرام دەكات.

جا عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: خەڵك لەبری جۆ و خورما گەنمیان دەدا بەڵام نیو صاع چونكە گەنم بەنرخ ترە.

وە لەدەربڕینێكی تردا: عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی كرد بە بەخشینی زەكاتی سەرفترە پێش دەرچوونی خەڵك بۆ نوێژی جەژن)).

١٧٣ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ - رضي الله عنه - قَالَ: ((كُنَّا نُعْطِيهَا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم صَاعاً مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً

---

١ البخاري (١٥١١) مسلم (٩٨٤)

٢ البخاري (١٥٠٣)

مِنْ أقِطٍ، أوْ صَاعاً مِنْ زَبِيبٍ. فَلَمَّا جَاءَ مُعَاوِيَةُ، وَجَاءَتِ السَّمْرَاءُ، قَالَ: أرَى مُدّاً مِنْ هَذِهِ يَعْدِلُ مُدَّيْنِ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أمَّا أنَا: فَلا أزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم))[١].

واتە: لە ئەبوسەعیدی خودریـەوە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: ((ئێمە زەكاتی سەرفترەمان دەبەخشی لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) مەنێك لە خۆراك، یان مەنێك لە خورما، یان مەنێك لە جۆ، یان مەنێك لە كەشك، یان مەنێك لە مێوژ، بەڵام كاتێك كە موعاویە (ڕەزای خـوای لێبـێ) هات وە گـەنمی شـامیش پەیدا بوو موعاویە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی من وای ئـەبینم مـشتێك لـە گـەنم بەرامبـەر دوو مـشت لـە جـۆ بێت، ئەبوسەعید (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: بەڵام من لەسـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ) چۆنم دەركردووە هەروا دەری دەكەم)).

---

١ البخاري (١٥٠٨) مسلم (٩٨٥/١٨)

# كِتَابُ الصِّيَامِ - پەرتووكی ڕۆژوو

١٧٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه - قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((لا تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ، أَوْ يَوْمَيْنِ إلاَّ رَجُلاً كَانَ يَصُومُ صَوْماً فَلْيَصُمْهُ))[١].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ((ڕۆژێك یاخود دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان بەڕۆژو مەبن، جگە لەکەسێك وەك عادەت ئەو ڕۆژوەی گرتبێت با بەڕۆژوو ببێت)).

١٧٥ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ))[٢].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەیفەرموو: ((كاتێك مانگتان دی ئەوا بەڕۆژوو بن، وەكاتێك دیتان ئەوا بیشكێنن (واتە لە كۆتایی ڕەمەزاندا) وە ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوا سی ڕۆژی شەعبان تەواو بكەن)).

١٧٦ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ - رضي الله عنه - قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ((تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً))[٣].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((پارشێو بكەن چونكە لە پارشێودا بەرەكەت هەیە)).

---

١ البخاري (١٩١٤) مسلم (١٠٨٢)

٢ البخاري (١٩٠٦) مسلم (١٠٨٠/٨)

٣ البخاري (١٩٢٣) مسلم (١٠٩٥)

١٧٧ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلاةِ. قَالَ أَنسٌ: قُلْت لِزَيْدٍ: كَمْ كَانَ بَيْنَ الأَذَانِ وَالسُّحُورِ؟ قَالَ: قَدْرُ خَمْسِينَ آيَةً)) [١].

واته:: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوه ئەویش له زەیدی کوڕی ثابتەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پارشێومان کرد لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پاشان هەستا بۆ نوێژ، ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: وتم بە زەید (ڕەزای خوای لێبێ) ماوەی نێوان بانگ و پارشێوەکە چەند بوو؟ وتی ئەندازەی خوێندنی پەنجا ئایەت)).

١٧٨ – عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ)) [٢].

واته: له دایکانمان عائیشه و ئوم سەلەمەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێن: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیانی بەسەردا دەهاتوو لەشگران بوو له خێزانەکانی پاشان خۆی دەشۆردوو بەڕۆژوو دەبوو)).

١٧٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ. فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ. فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ)) [٣].

واته: له ئەبوهورەیرەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((هەرکەسێك لەبیری نەبوو کە بەڕۆژووە خواردن یان خواردنەوەی خوارد، ئەوا با ڕۆژوەکەی تەواو بکات، چونکه ئەوە خودا خواردن و خواردنەوەی داوەتی)).

---

١ البخاري (١٩٢١) مسلم (١٠٩٧)

٢ البخاري (١٩٢٦) واللفظ له مسلم (١١٠٩)

٣ البخاري (١٩٣٣) (٦٦٦٩) مسلم (١١٥٥)

١٨٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلَكْتُ. قَالَ: مَا أَهْلَكَكَ؟ أَوْ قَالَ مَا لَكَ؟ قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي، وَأَنَا صَائِمٌ – وَفِي رِوَايَةٍ: أَصَبْتُ أَهْلِي فِي رَمَضَانَ – فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً تُعْتِقُهَا؟ قَالَ: لا، قَالَ: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟ قَالَ: لا، قَالَ: فَهَلْ تَجِدُ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِيناً؟ قَالَ: لا، قَالَ: فَسَكَتَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ إِذْ أُتِيَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ – وَالْعَرَقُ: الْمِكْتَلُ – قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ؟ قَالَ: أَنَا، قَالَ: خُذْ هَذَا، فَتَصَدَّقْ بِهِ. فَقَالَ الرَّجُلُ: عَلَى أَفْقَرَ مِنِّي: يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَوَاللهِ مَا بَيْنَ لابَتَيْهَا – يُرِيدُ الْحَرَّتَيْنِ – أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرَ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ. ثُمَّ قَالَ: أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ))[١] ، الحَرَّةُ: الأَرْضُ تَرْكَبُهَا حِجَارَةٌ سُودٌ.

واته: له ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((لە کاتێکدا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ)دانیشتبووین لە ناکاو پیاوێك هات بۆ خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)تیاچووم، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی چی تۆی لەناو بردووە، یاخود فەرمووی تۆ چیتە، وتی لەگەڵ خێزانمدا سەر جێیم کرد وە من بەڕۆژوو بووم، وە لەدەربڕینێکی تردا : کابرا وتی تێکەڵ بووم لەگەڵ خێزانەکەمدا لە ڕەمەزاندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ئایە بەندەیەکت هەیە ئازادی بکەیت؟ وتی نەخێر، فەرموووی ئایا دەتوانیت دوو مانگ بەدوای یەکدا بەڕۆژوو ببیت؟ وتی نەخێر، فەرمووی خواردنی شەست هەژارت بۆ دەدرێت؟ وتی نەخێر، ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ)بێدەنگ بوو. وە ئێمە ئاوا ماینەوە لە ناکاو سەبەتەیەکیان هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خورمای تێدا بوو، " العرق " واتە: سەبەتە ـ پێغەمبەر(ﷺ)

١ البخاري (١٩٣٦) (١٩٣٧) (٢٦٠٠) (٥٣٦٨) (٦٠٨٧) (٦٧٠٩) (٦٧١٠) (٦٧١١) مسلم (١١١١)

فەرمووی كوا پرسیار كەرەكە وتی: منم، فەرمووی: ئەمە بگرە بیكە بەخێر، وتی بۆ لەمن هەژار تر هەیە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ سوێند بەخوا لەمسەر بۆ ئەو سەری مەدینە لە خێزانەكەی من هەژار تری تێدا نییە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ)پێكەنی هەتا ددانەكانی دەركەوت پاشان فەرمووی، خێزانەكەتی پێ تێر بكە)).

الحَرَّةُ: بریتییە لەو زەوییەی كە بەردی ڕەشی بەسەرەوەیە.

## بـابُ الصومِ في السَّفرِ - بەشی ڕۆژوو له سەفەردا

١٨١ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ((أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَسْلَمِيَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم : أَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ – وَكَانَ كَثِيرَ الصِّيَامِ – فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ))[1].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((حەمزەی كوڕی عەمری ئەسلەمی (ڕەزای خوای لێبێ) وتی بە پێغەمبەر (ﷺ)ئایە لەسەفەردا بەڕۆژوو بـبم؟ چونكە ئەو ڕۆژوی زۆر بوو، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ئەگەر ئارەزووت هەبوو ئەوا بەڕۆژوو ببە وە ئارەزووت هەبوو بیشكێنە)).

١٨٢ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ. وَلا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ))[2].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((ئێمە لەسەفەردا بووین لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نە ڕۆژودار تانەی لە بێڕۆژوو دەدا، نە بێڕۆژوو تانەی لە ڕۆژودار دەدا)).

١٨٣ – عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ – رضي الله عنه – قَالَ: ((خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي شَهْرِ رَمَضَانَ. فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، حَتَّى إِنْ كَانَ أَحَدُنَا لَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ. وَمَا فِينَا صَائِمٌ إِلاَّ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ))[3].

---

١ البخاري (١٩٤٣) واللفظ له مسلم (١١٢١)

٢ البخاري (١٩٤٧) مسلم (١١١٨)

٣ البخاري (١٩٤٥) مسلم (١١٢٢)

واتــه: لــه ئەبودەردائــەوە (ڕەزای خــوای لێبــێ) دەڵــێ:((دەرچــووین لەخزمــەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە مانگی ڕەمەزاندا کـەزۆر گـەرم بـوو، هـەتا یـەکێك لـە ئێمـە دەستی لەسەر سەری دادەنا لەبەر تـینی گـەرما، کـەسمان بـەڕۆژوو نـەبووین جگـە لـە پێغەمبەری خوداو (ﷺ)عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە نەبێت (ڕەزای خوای لێبێ))).

١٨٤ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي سَفَرٍ. فَرَأَى زِحَاماً وَرَجُلاً قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: صَائِمٌ. قَالَ: لَيْسَ مِنْ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ)) [١].

وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ: ((عَلَيْكُمْ بِرُخْصَةِ اللهِ الَّتِي رَخَّصَ لَكُمْ)) [٢].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) لـە سـەفەردا بـوو، قەرەباڵغیـەکی دی، وە پیاوێـك سـێبەریان لەسـەر دروسـت کردبوو، فەرمووی ئەوە چیەتی؟ وتیان بەڕۆژوە، فەرمووی: ڕۆژو گـرتن لەسـەفەردا لـە چاکە نییە)).

وە لەدەربڕینێکدا لەلای پێشەوا موسلیم ((پێغەمبەری خـوا (ﷺ)فـەرمووی دەسـت بەو مۆڵەتەی خوداوە بگرن کە بەخشیوێتی بە ئێوە)).

١٨٥– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فِي السَّفَرِ فَمِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فِي يَوْمٍ حَارٍّ، وَأَكْثَرُنَا ظِلاً: صَاحِبُ الْكِسَاءِ. وَمِنَّا مَنْ يَتَّقِي الشَّمْسَ بِيَدِهِ. قَالَ: فَسَقَطَ الصُّوَّامُ، وَقَامَ الْمُفْطِرُونَ فَضَرَبُوا الأَبْنِيَةَ. وَسَقَوْا الرِّكَابَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ)) [٣].

---

١ البخاري (١٩٤٦) واللفظ له مسلم (١١١٥)

٢ مسلم (٠٠٠/١١١٥)

٣ البخاري (٢٨٩٠) مسلم (١١١٩)

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((ئێمە لەسەفەردا بووین لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ)تیاماندا بوو بەڕۆژو بوو وە تیاماندا بوو بەڕۆژو نەبوو، لاماندا لە ڕۆژێکی زۆرگەرمدا ئەوەمان کە زۆر سێبەری هەبوو خاوەن جلێك بوو (واتە جلەکانی خۆی کردبوو بە سێبەر) وە هەمان بوو بەدەستی بەری خۆری دەگرت، دەڵێ: ڕۆژووانەکان کەوتن وە بیڕۆژوەکان هەستان دەستیان کرد بە دەوار هەڵدان و ئاودانی وشترەکان، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ئەوانەی ئەمڕۆ بەڕۆژو نەبوون پاداشتەکەیان بەدەست هێنا)).

١٨٦ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَ إلاَّ فِي شَعْبَانَ)) [١].

واته: له دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((من کە قەرزاری ڕۆژوی ڕەمەزان دەبووم نەم دەتوانی بیگێڕمەوە لە مانگی شەعباندا نەبێت)).

١٨٧ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ)) [٢]. وَأَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد وَقَالَ " هَذَا فِي النَّذْرِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ ".

واته: له دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی هەرکەسێك مردو ڕۆژوش قەرزار بوو ئەوا با کەس و کارەکەی بۆی بگرنەوە)).

١ البخاري (١٩٥٠) مسلم (١١٤٦)

٢ البخاري (١٩٥٢) مسلم (١١٤٧)

وه ئیمامی ئەبوداود ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوەو فەرموویەتی (ئەم ڕۆژو گێڕانەوەیە لەبری مردوو تایبەتە بەوەی کە ئەو مردووە لەسەر خۆی واجب کردبێت ئەوە وتەیەکی ئیمامی ئەحمەدیشە.

تێبینی وەرگێڕ: لە کەس و کارەکەیدا کامیان نزیکتر بێت لێوەی حەق زیاتر لەسەر ئەوە کە بەڕۆژو ببێتەوە لەبری.

١٨٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ. أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ فَقَالَ: لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى))[١] .

وَفِي رِوَايَةٍ: ((جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ نَذْرٍ. أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ فَقَالَ: أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ فَقَضَيْتِيهِ، أَكَانَ يُؤَدِّي ذَلِكَ عَنْهَا؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: فَصُومِي عَنْ أُمِّكِ))[٢] .

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دایکم مردوو وە ڕۆژوی یەك مانگی لەسەرە، ئایە لەبری ئەو بیگرمەوە؟ فەرمووی: ئەگەر دایکت قەرزار بووایە قەرزەکەت لە بری ئەو دەدایەوە؟ وتی بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی قەرزی خوا حەقدار ترو لەبەرترە کە بدرێتەوە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دایکم مردوو وە ڕۆژوی نەزری لەسەرە، ئایە لەبری ئەو بیگرمەوە؟ فەرمووی: ئەگەر دایکت

١البخاري(١٩٥٣) مسلم (١١٤٨)

٢ مسلم (١١٤٨/١٥٦)

قەرزار بووایە تۆش قەرزەکەت بۆ بدایەتەوە، لەسەری لادەچوو؟ وتی بەڵێ: فەرمووی: کەواتە بەڕۆژو بە لە بری دایکت)).

١٨٩ – عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ – رضي الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ)) [١].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((بەردەوام خەڵکی لەخێردان مادەم پەلە بکەن لە ڕۆژو شکاندندا))

وَفِي رِوَايَةٍ ((وَ أَخَّرُوا السُّحُورَ)) [٢].

وە لەدەربڕینێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((وە پارشێویش دوابخەن)).

١٩٠– عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلّى الله عليه وسلم : ((إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ مِنْ هَهُنَا. وَأَدْبَرَ النَّهَارُ مِنْ هَهُنَا: فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ)) [٣].

واتە: لە عومەری کوڕی خەطابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ((کاتێك شەو لە لەوێوە هات (دەستی بۆ خۆر هەڵات درێژ دەکرد) وە ڕۆژیش لەوێوە پشتی هەڵکرد (دەستی بۆ خۆر ئاوا درێژ دەکرد) ئەوە بێگومان کاتی ڕۆژو شکاننی ڕۆژووانە)).

---

١ البخاري (١٩٥٧) مسلم (١٠٩٨)

٢ احمد في المسند (١٤٧/٥،١٧٢) من حديث ابي ذر بسند ضعيف

٣ البخاري (١٩٥٤) مسلم (١١٠٠)

## بَابُ أَفْضَلُ الصِّيَامِ وَغَيْرِهِ - بەشی گەورەترین ڕۆژوو جگە لەویش

١٩١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((نَهَى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ الْوِصَالِ. قَالُوا: يا رَسُولَ اللهِ إنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: إنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إنِّي أُطْعَمَ وَأُسْقَى))[١]. وَرَوَاهُ أَبُو هُرَيْرَةَ وَعَائِشَةُ وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ.

وَلِمُسْلِمٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه –: ((فَأَيُّكُمْ أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ فَلْيُوَاصِلْ إلَى السَّحَرِ))[٢].

واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ)نەهیی کرد لە ڕۆژوی وصال (وصال: بریتییە لە ڕۆژو دانە دەم یەك بۆ ماوەی دوو یان سێ ڕۆژ) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ خۆت وصال دەکەیت، فەرمووی من وەك ئێوە نیم بەڵکو من خواردن و خواردنەوەم پێدەبەخشرێ)).

ئەم فەرموودەیە ئەبوهورەیرە و عائیشە و ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوایان لێبێ) گێڕاویانەتەوە.

تێبینی وەرگێڕ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی من وەك ئێوە نیم بەڵکو من خواردن و خواردنەوەم پێدەبەخشرێ ئەم خواردن و خواردنەوەیە، خواردن و خواردنەوەیەکی ئاسایی نییە بەڵکو بریتیە لە عیبادەت و بەندایەتی کردن بۆ خوا چونکە

خواردن و خواردنەوە ڕۆژو بەتاڵ دەکاتەوە.

وە لەدەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا موسلیم: لە فەرموودەی ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ((کام لە ئێوە دەیەوێت وصال بکات ئەوا بابیکات هەتا پارشێو)).

---

١ البخاري (١٩٦٢) مسلم (١١٠٢)

٢ البخاري (١٩٦٣) (١٩٦٧) ولم يخرجه مسلم

١٩٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما قَالَ: ((أُخْبِرَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم أَنِّي أَقُولُ: وَاَللهِ لأَصُومَنَّ النَّهَارَ، وَلأَقُومَنَّ اللَّيْلَ مَا عِشْتُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : أَنْتَ الَّذِي قُلْتَ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ لَهُ: قَدْ قُلْتُهُ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي. قَالَ: فَإِنَّكَ لا تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ. فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَنَمْ وَقُمْ. وَصُمْ مِنْ الشَّهْرِ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا. وَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ. قُلْتُ: فَإِنِّي لَأُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: فَصُمْ يَوْماً وَأَفْطِرْ يَوْمَيْنِ. قُلْتُ: لَأُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: فَصُمْ يَوْماً وَأَفْطِرْ يَوْماً. فَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ دَاوُد. وَهُوَ أَفْضَلُ الصِّيَامِ. فَقُلْتُ: إِنِّي لَأُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: لا أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ)) [1].

وَفِي رِوَايَةٍ: ((لا صَوْمَ فَوْقَ صَوْمِ أَخِي دَاوُد – شَطْرِ الدَّهْرِ – فَصُمْ يَوْماً وَأَفْطِرْ يَوْماً)) [2].

واتە: لە عەبدەڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((هەواڵ درا بە پێغەمبەر (ﷺ) کەمن وتوومە سوێند بەخوا دەبێت هەموو ڕۆژێك بەڕۆژو ببم وە هەموو شەوێك شەو نوێژ بکەم ئەوەندەی لە ژیاندا بم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی تۆی ئەو قسەیەت کردووە، پێم وت بێگومان من وتوومە بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم، فەرمووی، تۆ ئەوە ناتوانی بەڕۆژوبەو بەڕۆژوش مەبە بشخەوەو شەو نوێژیش بکە، وە لەهەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژو ببە، چونکە چاکە یەك بە دەیە (واتە یەك ڕۆژ وەك دە ڕۆژ وایە) وەك ڕۆژوی هەموو ساڵەکە وایە، عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: وتم من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی ڕۆژێك بەڕۆژو ببەو دوو ڕۆژ بەڕۆژو مەبە، وتم من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی ڕۆژێك بەڕۆژو ببەو ڕۆژێك بەڕۆژو مەبە، ئەوە ڕۆژوی داود پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێ) چاکترین ڕۆژووە، وتم من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی لەوە چاکتر نییە)).

---

١ البخاري (١٩٧٦) مسلم (١١٥٩)

٢ البخاري (١٩٧٩) (٦٢٧٧)

وه لەدەربڕینێکی تردا عەبدوڵلاَ (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((هیچ ڕوژویەك نییە لەسەرو ڕۆژوی برام داودەوە (سەلامی خوای لێبێ) کە نیوەی ساڵەکە دەکات، ڕۆژێك بەڕۆژو ببەو ڕۆژێك بەڕۆژو مەبە)).

١٩٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضيَ اللهُ عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((إِنَّ أَحَبَّ الصِّيَامِ إِلَى اللهِ صِيَامُ دَاوُد. وَأَحَبَّ الصَّلاةِ إِلَى اللهِ صَلاةُ دَاوُد كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ. وَيَنَامُ سُدُسَهُ. وَكَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً)) [١]

واته: له عەبدەڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((خۆشەویسترین ڕوژو لای خوای گەورە ڕۆژوی داودە (سەلامی خوای لێبێ) وە خۆشەویسترین شەونوێژیش لای خوای گەورە نوێژی داودە (سەلامی خوای لێبێ) نیوەی شەو دەخەوت، وە سێیەکی نوێژی دەکرد، وە شەش یەکیشی دەخەوتەوە، هەروەها ڕۆژێك بەڕۆژو دەبوو ڕۆژێك بەڕۆژو نەدەبوو)).

١٩٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((أَوْصَانِي خَلِيلِي صلَّى الله عليه وسلم بِثَلاثٍ: صِيَامِ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيْ الضُّحَى، وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ)). [٢]

واته: له ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((خۆشەویستم (ﷺ) ڕایسپاردم بۆ سێ شت، گرتنی ڕۆژوی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، وە دوورکات نوێژی چێشتەنگاو، وە پێش ئەوەی بخەوم نوێژی ویتر بکەم)).

١٩٥ – عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: ((سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ أَنَهَى النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ)) وَزَادَ مُسْلِمٌ ((وَرَبِّ الْكَعْبَةِ)) [٣].

---

١ البخاري (١١٣١) (٣٤٢٠) مسلم (١٨٩/١١٥٩)

٢ البخاري (١٩٨١) (١١٧٨) مسلم (٧٢١)

٣ البخاري (١٩٨٤) مسلم (١١٤٣)

واتە: لە موحەمەدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەرەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ((پرسیارم کرد لە جابری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێ) ئایە پێغەمبەر (ﷺ)ڕێگری کردووە لە ڕۆژوی ڕۆژی هەینی؟ وتی بەڵێ)) وە لای پێشەوا موسلیم هاتووە کە جابر (ڕەزای خوای لێبێ) وتویەتی بەڵێ سوێند بەخوای کەعبە.

١٩٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((لا يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إلاَّ أَنْ يَصُومَ يَوْماً قَبْلَهُ، أَوْ يَوْماً بَعْدَهُ))[١].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ)دەیفەرموو ((باهیچ کەسێك لە ئێوە ڕۆژی هەینی بەڕۆژ نەبێت مەگەر ڕۆژێك لەپێشیەوە یاخود ڕۆژێك لە دوایەوە بەڕۆژو بێت)).

١٩٧ – عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ وَاسْمُهُ سَعْدُ بْنُ عُبَيْدٍ – قَالَ: ((شَهِدْت الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – فَقَالَ: هَذَانِ يَوْمَانِ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ صِيَامِهِمَا: يَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَالْيَوْمُ الآخَرُ: تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ))[٢].

واتە: لە ئەبو عوبیدەوە کە خزمەتکاری ئیبن ئەزهەرەو ناوی سەعدی کوڕی عوبەیدە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ:((ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عومەری کوڕی خەطابدا (ڕەزای خوای لێبێ) فەرمووی: ئەم دوو ڕۆژە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لە ڕۆژو گرتنیان، ڕۆژی ڕۆژو شکاندنتان لە ڕۆژوەکانتان، (واتە جەژنی ڕەمەزان) وە هەروەها ئەو ڕۆژەی کە لەقوربانیەکانتان دەخۆن تیایدا (واتە جەژنی قوربان))).

---

١ البخاري (١٩٥٨) مسلم (١١٤٤)

٢ البخاري (١٩٩٠) (٥٥٧١) مسلم (١١٣٧)

١٩٨ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((نَهَى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ صَوْمِ يَوْمَيْنِ: النَّحْرِ وَالْفِطْرِ. وَعَنْ إِشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، وَعَنْ الصَّلاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ وَالْعَصْرِ)) [١].

واته: له ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووه له ڕۆژوی دوو ڕۆژ: جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان، وه لەو کەسەی که خۆی بئاڵێنێت لەیەك پارچە جلەوە، (تێبینی وەرگێڕ: چونکه خۆی ناڕەحەت دەبێت وه ترسی ئەوەشی هەیە کە گیانی دەرکەوێت) وه لەوەشی بەیەك پارچە جلەوە دانیشێت لەسەر سمتی بەڵام هەردوو ڕانی بنێ به سکیەوە، وه له نوێژ کردن دوای نوێژی بەیانی و دوای نوێژی عەسر)).

١٩٩ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم :((مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللهِ بَعَّدَ اللهُ وَجْهَهُ عَنْ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً)) [٢].

واته: له ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: هەر کەسێك یەك ڕۆژ لەبەر خوای گەورە بەڕۆژو بێت خوای گەورە حەفتا پایز ڕوخساری له ئاگر دوور دەخاتەوە)).

---

١ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِتَمَامِهِ . وَأَخْرَجَ الْبُخَارِيُّ الصَّوْمَ فَقَطْ البخاري بتمامه (١٩٩١) (١٩٩٢) مسلم مختصرا (٨٢٧/١٤١)

٢ البخاري (٢٨٤٠) مسلم (١١٥٣/١٦٨)

## بابُ ليلةِ القَدرِ - بەشى شەوى قەدر

٢٠٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رِجَالاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم أُرُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ. فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ. فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پیاوانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) (ڕەزای خوا لەوانیش بێت) شەوی قەدریان پیشاندرا لە خەویاندا لەحەوتەمی کۆتایدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی، ئەبینم خەوی هەمووتان وەك یەکە کە لە حەوتەمی کۆتایدایە، هەرکەسێك بەدوایدا دەگەڕێت و دەیەوێ بیدۆزێتەوە ئەوا با لەحەوتی کۆتایدا بەدوایدا بگەڕێت)).

٢٠١ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنْ الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ)) [2].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن لە تاکەکانی دەشەوی کۆتایدا)).

٢٠٢ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الأَوْسَطِ مِنْ رَمَضَانَ. فَاعْتَكَفَ عَاماً، حَتَّى إذَا كَانَتْ لَيْلَةُ إحْدَى وَعِشْرِينَ – وَهِيَ اللَّيْلَةُ الَّتِي يَخْرُجُ مِنْ صَبِيحَتِهَا مِنْ اعْتِكَافِهِ – قَالَ: مَنْ اعْتَكَفَ مَعِي فَلْيَعْتَكِفْ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ فَقَدْ أُرِيتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ. ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، وَقَدْ رَأَيْتُنِي أَسْجُدُ فِي

---

٢٥٤البخاري (٢٠١٥) مسلم (١١٦٥)

٢ البخاري (٢٠١٧) واللفظ له مسلم (١١٦٩)

مَاءٍ وَطِينٍ مِنْ صَبِيحَتِهَا. فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ. وَالْتَمِسُوهَا فِي كُلِّ وِتْرٍ. قَالَ فَمَطَرَتِ السَّمَاءُ تِلْكَ اللَّيْلَةِ. وَكَانَ الْمَسْجِدُ عَلَى عَرِيشٍ. فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ، فَأَبْصَرَتْ عَيْنَايَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَعَلَى جَبْهَتِهِ أَثَرُ الْمَاءِ وَالطِّينِ مِنْ صُبْحِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ)) [١].

واته: له ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیفەتی وابوو لە دەشەوی ناوەڕاستی ڕەمەزاندا دەمایەوە جا ساڵێکیان مایەوە هەتا شەوی بیست و یەك، ئەو شەوەی کە بۆ بەیانیەکەی لە ئیعتیکافەکەی دەردەچوو، فەرمووی، هەر کەسێك لەگەڵ مندا ماوەتەوە ئەوا با دەشەوی کۆتای بمێنێتەوە، بێگومان ئەم شەوەم پیشان درا پاشان لە بیرم برایەوە، (واتە شەوی قەدر) وە من خۆمم دی لە بەیانی ئەو شەوەدا سوجدەم دەبرد لە ئاو و قوڕدا، بەدوایدا بگەڕێن لە دە شەوی کۆتایدا، وە بەدوایدا بگەڕێن لە هەموو تاکێکدا)) ئەبو سەعید (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: هەر ئەو شەوە ئاسمان بارانی باراند، وە مزگەوتەکە لە پەلکی دار خورما دروست کرابوو، دڵۆپەی کرد، لەبەیانی بیست و یەکدا بەهەردوو چاوی خۆم پێغەمبەری خوام (ﷺ)دی شوێنەواری ئاو و قوڕ بە ناوچەوانیەوە بوو)).

١ البخاري (٢٠٢٧) مسلم (١١٦٧)

## بابُ الاعتكافِ - بەشی مانەوە لە مزگەوتدا

٢٠٣- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ تَعَالَى. ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ من بَعْدِهِ)) [١].

وَفِي لَفْظٍ ((كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَعْتَكِفُ فِي كُلِّ رَمَضَانَ. فَإِذَا صَلَّى الْغَدَاةَ جَاءَ مَكَانَهُ الَّذِي اعْتَكَفَ فِيهِ)) [٢].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەمایەوە لەمزگەوتدا لە دەشەوی کۆتای ڕەمەزاندا، هەتا خوای گەورە مراندی، پاشان خێزانەکانی (ڕەزای خوایان لێبێ) لەدوای ئەو لە مزگەوتدا دەمانەوە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیفەتی وابوو لەمزگەوتدا دەمایەوە هەموو ڕەمەزانێك کاتێك نوێژی بەیانی دەکرد دەهاتەوە ئەو شوێنەی کە تیایدا مابۆوە)).

٢٠٤ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ((أَنَّهَا كَانَتْ تُرَجِّلُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم وَهِيَ حَائِضٌ، وَهُوَ مُعْتَكِفٌ فِي الْمَسْجِدِ. وَهِيَ فِي حُجْرَتِهَا: يُنَاوِلُهَا رَأْسَهُ)) [٣]. وَفِي رِوَايَةٍ: ((وَكَانَ لا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ)) [٤].

وَفِي رِوَايَةٍ أَنَّ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ " إِنْ كُنْتُ لا أَدْخُلُ الْبَيْتَ لِلْحَاجَةِ وَالْمَرِيضُ فِيهِ. فَمَا أَسْأَلُ عَنْهُ إِلاَّ وَأَنَا مَارَّةٌ " [٥]. الترجيل: تسريح الشعر.

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ):کە دایکە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) سەری پێغەمبەری (ﷺ) شانە دەکرد لەکاتێکدا لەحیزدا بوو، وە پێغەمبەریش

---

١ البخاري (٢٠٢٦) مسلم (١١٧٢/٥)

٢ البخاري (٢٠٤١)

٣ البخاري (٢٦٩) (٢٠٤٦) مسلم (٢٧٩/٩)

٤ مسلم (٢٧٩)

٥ مسلم (٢٧٩/٧)

(ﷺ) لەئیعتیكافــدا بــوو لەمزگەوتــدا، وەدایكــە عائیــشە (ڕەزای خــوای لێبــێ) لەژوورەكەی خۆیدا بوو پێغەمبەریش (ﷺ) سەری بۆدەبردە ژوورەوە بۆئەوەی بۆی شانە بكات.

وە لەدەربڕینێكی تردا دایكمان عائیشە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: ((پێغەمبـەری خوا (ﷺ) نەئەهاتەماڵەوە مەگەر بۆ پێویستی كەسێك نەبێت)).

وە هـەر لـەدەربڕینێكی تـردا دایكمـان عائیـشە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: ((مـن نەدەچوومە ماڵەوە مەگەر بـۆ پێویـستەیەك نـەبێت، وە نەخۆشیـشی لێبـوو، پرسـیارم لێنەدەكرد تەنها بەدەم ڕێوە نەبێت)).

٢٠٥ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: قُلْتُ: ((يَا رَسُولَ الله، إنِّـي كُنْـتُ نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً)) – وَفِي رِوَايَةٍ: ((يَوْماً – فِـي الْمَـسْجِدِ الْحَـرَامِ. قَـالَ: فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ)) [١]. وَلَمْ يَذْكُرْ بَعْضُ الرُّوَاةِ يَوْماً ولا لَيْلَةً.

واتە: لە عومەری كوڕی خەطابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)من لەسەردەمی نەفامیدا پێویستم كرد لەسەر خۆم كە شەوێك (لەدەربڕینێكی تردا) ڕۆژێك لەمزگەتی مەككەدا بمێنمەوە، فەرمووی نەزرەكەت بەجێبێنە)).

وەهەندێك لەڕاویەكان باسی شەو و ڕۆژیان نەكرد.

٢٠٦ – عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيِّ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَ النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليـه وسلم مُعْتَكِفًا. فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلاً. فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ لأَنْقَلِبَ، فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي – وَكَـانَ مَسْكَنُهَا فِي بَيْتِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ – فَمَرَّ رَجُلانِ مِنْ الأَنْصَارِ فَلَمَّا رَأَيَا رَسُولَ اللهِ صـلَّى الله عليه وسلم أَسْرَعَا فِي الْمَشْيِ. فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليـه وسـلم : عَلَـى رِسْـلِكُمَا. إنَّهَـا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيِّ. فَقَالا: سُبْحَانَ اللهِ يَا رَسُولَ الله. فَقَالَ: إنَّ الشَّيْطَانَ يَجْـرِي مِـنْ ابْـنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ. وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَرّاً– أَوْ قَالَ شَيْئاً)) [٢].

---

١ البخاري (٢٠٣٢) (٢٠٤٣) مسلم (١٦٥٦)

٢ البخاري (٢٠٣٥) (٢٠٣٨) (٣١٠١) (٣٢٨١) (٦٢١٩) مسلم (٢١٧٥)

وَفِي رِوَايَةٍ ((أَنَّهَا جَاءَتْ تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ. فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً. ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ. فَقَامَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم مَعَهَا يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ)) [١]. ثُمَّ ذَكَرَهُ بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە دایکمان صەفییەی کچی حویەی (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمزگەوتدا مابۆوە شەوێکیان هاتم بۆلای سەردانم کرد، قسەم لەگەڵدا کرد، پاشان هەستام بڕۆم هەستا لەگەڵما بۆئەوەی بەڕێم بکات، وە ماڵی صەفییە (ڕەزای خوای لێبێ) لە ماڵی ئوسامەی کوڕی زەیدا بوو (ڕەزای خوایان لێبێ)، جا دوو پیاو ڕۆشتن لە ئەنصاریەکان، کاتێك پێغەمبەریان (ﷺ)بینی پەلەیان کرد لە ڕۆشتندا، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی، لەسەر خۆبن ئەوە صەفییەی کچی حویەییە (ڕەزای خوایان لێبێ) وتیان، پاکی بۆ خوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی، بێگومان شەیتان بەناو دەماری ئەوەی ئادەمدا دەڕوات وە من ترسام خراپە بخاتە ناو دڵی ئێوەوە، یان فەرمووی من ترسام شتێك بخاتە ناو دڵی ئێوەوە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا صەفییە (ڕەزای خوای لێبێ) هات سەردانی پێغەمبەری (ﷺ)کرد کە لە دەشەوی کۆتای ڕەمەزاندا لە مزگەوتدا مابۆوە، ماوەیەك گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، پاشان هەستا بڕوا پێغەمبەر (ﷺ)هەستا لەگەڵیدا بۆ ئەوەی بەڕێی بکات، هەتا گەشتە دەرگای مزگەوت لای دەرگای ماڵی ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێبێ). پاشان وەك فەرموودەی پێشوو گێڕایەوە.

---

١ مسلم (٢١٧٥/٢٥)

# كتابُ الحجِّ - پەرتووكی حەج

## بابُ المواقيتِ - شوێن و كاتەكانی ئیحرام بەستن

حـەجكردن یەكێكـە لـە پێـنج پایەكـەی ئیـسلام كـە لـە سـاڵی نویـەمی كۆچـیدا فەرزكراوەو لە ژیاندا یەكجار فەرزە ئەجام بدرێت.

٢٠٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما:((أَنَّ رَسُـولَ اللهِ صـلّى الله عليـه وسـلم وَقَّتَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ: ذَا الْحُلَيْفَةِ. وَلأَهْلِ الشَّامِ: الْجُحْفَةَ. وَلأَهْلِ نَجْدٍ: قَـرْنَ الْمَنَـازِلِ. وَلأَهْـلِ الْيَمَنِ: يَلَمْلَمَ وَقَالَ هُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْـرِ أَهْلِهِـنَّ، مِمَّـنْ أَرَادَ الْحَجَّ أَوْ الْعُمْـرَةَ. وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ: فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ))[1] .

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئیحرام بەستن بۆ خەڵكی مەدینە (ذَو الْحُلَيْفَةِ) ی دیـاری كـرد، وە بـۆ خـەڵكی شام (جُحْفَةُ) وە بۆ خەڵكی نەجد قَرْنَ الْمَنَازِلِ: وە بۆ خەڵكی یەمـەن: يَلَمْلَـم: ی دیـاری كرد، ئینجا فەرمووی، ئەوانە بۆ خەڵكی ئەو وڵاتانەو ئەو خەڵكانەشی كەبەسەر ئەوانـدا دێن جگە لە خەڵكی ئەو وڵاتانە، هەر كەس دەیەوێت حەج یاخود عومرە بكات، وە هەر كەسێك بێجگە لەوە ئەوە لەو شوێنەوەی كـە دێـت ئیحـرام دەبەسـتێت، هـەتا خـەڵكی مەككە لە مەككە دەیبەستن)).

---

١ البخاري (١٥٢٤) (١٥٢٦) (١٥٢٩) (١٥٣٠) (١٨٤٥) مسلم (١١٨١/١٢)

٢٠٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((يُهِلُّ أهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذي الْحُلَيْفَةِ، وَأهْلُ الشَّامِ مِنْ الْجُحْفَةِ، وَأهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنِ المَنَازِلِ)). قَالَ عَبْدُ اللهِ: وَبَلَغَنِي أنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((وَيُهِلُّ أهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ)) [1].

واته: له عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((خەڵكی مەدینه ئیحرام له: ذُو الْحُلَيْفَةِ: دەبەستن وه خەڵكی شام له: جُحْفَة: وه خەڵكی نەجد له: قَرْنُ المَنَازِلِ: عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێم گەیشت كه پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی، خەڵكی یەمەن ئیحرام له: يَلَمْلَم: دەبەستن)).

---

١ البخاري (١٥٢٥) مسلم (١١٨٢)

## باب ما يلبس المُحْرِمُ من الثياب
## بەشی ئەو پۆشاكەی كە حاجی لەبەری دەكات

٢٠٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أنَّ رَجُلاً قَالَ يَا رَسُولَ اللهِ، مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنْ الثِّيَابِ؟ قَالَ صلَّى الله عليه وسلم : لايَلْبَسُ الْقَمِيصَ، وَلا الْعَمَائِمَ، وَلا السَّرَاوِيلاتِ، وَلا الْبَرَانِسَ، وَلا الْخِفَافَ، إلاَّ أَحَدٌ لا يَجِدُ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنْ الْكَعْبَيْنِ، وَلا يَلْبَسْ مِنْ الثِّيَابِ شَيْئاً مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ أَوْ وَرْسٌ)) [1].
وَلِلْبُخَارِيِّ: ((وَلا تَنْتَقِبِ الْمَرْأَةُ. وَلا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ)) [2].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوكەسەی لەئیحرامدایە چی پۆشاكێك لەبەر بكات؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی، نە كراس لەبەر بكات، وە نە مێزەر بكاتە سەری، نەشەرواڵ لە پێبكات، نە كڵاو لەسەر بكات، نە خوف لەپێبكات، جگە لە كەسێك نەبێت كە نەعلی دەست نەكەوێت ئەوا با خوف لەپێبكات بەڵام لە خواروو قاپە ڕەقەی قاچیەوە ببیڕێت، وە با هیچ پۆشاكێك لەبەر نەكات كە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت (كە دوو جۆر گیای بۆن خۆشن))).

وە لەدەربڕینێكدا لەلای پێشەوا بوخاری: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی، با ئافرەت پەچە نەكات و دەست كێشیش لەدەست نەكات)).

---

١ البخاري (١٥٤٢) (١٣٤) (٣٦٦) (١٨٤٢) (٥٧٩٤) (٥٨٠٣) (٥٨٠٥) (٥٨٠٦) (٥٨٥٢) مسلم (١١٧٧)

٢ البخاري (١٨٣٨)

٢١٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم يَخْطُبُ بِعَرَفَاتٍ: مَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَس خُفَّيْنِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَاراً فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ: يَعْنِي لِلْمُحْرِمِ)) [١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((گوێم لە پێغەمبەری (ﷺ)وتاری دەخوێندەوە لە عەرەفاتدا: فەرمووی، هەر کەسێك نەعلی دەست ناکەوێت ئەوا با خوف لەپێبکات، وە هەر کەسێك پەشتەماڵی دەست ناکەوێت ئەوا با شەرواڵ لەپێبکات، واتە بۆ کەسێك کە لە ئیحرامدا بێت)).

١ البخاري (٥٨٠٤) (٥٨٥٣) مسلم (١١٧٨)

## بابُ تلبية - بەشی تەلبیە کردن

٢١١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ تَلْبِيَةَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لا شَرِيكَ لَكَ))[1] . قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ يَزِيدُ فِيهَا " لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إلَيْكَ وَالْعَمَلُ ". " هذه الزيادة عند مسلم "

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((تەلبیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وابوو: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لا شَرِيكَ لَكَ: واتە: پەروەردگارا پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەیەمەوەو تۆ تەنهاو بێ شەریکیت، وە بێگومان، سوپاس و ستایش و هەموو ناز و نیعمەتێك موڵك دەسەڵاتێك هەر بۆ تۆیە، تۆ بێ هاوەڵ و بێ وێنەیت)).

وە گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێ:عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) ئەمەشی زیاد کردبوو: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إلَيْكَ وَالْعَمَلُ:

واتە: پەروەردگارا پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، هەموو خۆش گوزەرانیەك هەر هی تۆیە، وە هەموو خێر و چاکەیەك بە دەست تۆیە، هەموو داخوازی و پاڕانەوە و هەر بۆلای تۆیە، وە هەموو کار و کردەوەیەك هەر بۆ تۆیە)).

---

١ البخاري (١٥٤٩) (١٩١٥) مسلم (١١٨٤)

## بابُ سفر المرأة بدون المحرم - بەشی سەفەر كردنی ئافرەت بەبێ

٢١٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ((لا يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ إلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَم))[1].

وَفِي لَفْظِ الْبُخَارِيِّ: ((لا تُسَافِرُ مَسِيرَةَ يَوْمٍ إلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ)) [2].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ((بۆ هیچ ئافرەتێك دروست و حەلأڵ نییە، باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت، كە سەفەر بكات، ماوەی ڕۆژ و شەوێك مەگەر لەگەڵ مەحرەمدا نەبێت)).

وە لەدەربڕینێكدا لەلای پێشەوا بوخاری: ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی، با ئافرەت سەفەر نەكات بەئەندازەی ڕۆژێك مەگەر لەگەڵ مەحرەمدا نەبێت)).

---

١ البخاري (١٠٨٨) مسلم (١٣٣٩/٤٢١)

٢ ليس هذا اللفظ للبخاري من حديث أبي هريرة كما ذكر المؤلف، و إنما هو بمعناه عند مسلم رقم (١٣٣٩/٤٢٠)

## بابُ الفِدْيَةِ - بەشی فیدیە دان

٢١٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْقِلٍ قَالَ: ((جَلَسْتُ إِلَى كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ. فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْفِدْيَةِ؟ فَقَالَ: نَزَلَتْ فِي خَاصَّةً. وَهِيَ لَكُمْ عَامَّةً. حُمِلْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ـوَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي. فَقَالَ: مَا كُنْتُ أُرَى الْوَجَعَ بَلَغَ بِكَ مَا أَرَى – أَوْ مَا كُنْتُ أَرَى الْجَهْدَ بَلَغَ بِكَ مَا أَرَى – أَتَجِدُ شَاةً؟ فَقُلْتُ: لا. فَقَالَ: فَصُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ نِصْفُ صَاعٍ))[1].

وَفِي رِوَايَةٍ: ((أَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ يُطْعِمَ فَرَقاً بَيْنَ سِتَّةٍ، أَوْ يُهْدِيَ شَاةً، أَوْ يَصُومَ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ))[2].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەعقیلەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ((دانیشتم لای کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لێبێ) پرسیارم لێکرد دەربارەی فیدیە، وتی ئەو ئایەتە بەتایبەتی بۆ من دابەزی وە بۆ ئێوەشە بەگشتی، هەڵگیرام بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەسپێ بە دەم و چاومدا دەهاتە خوارەوە، فەرمووی، گومانم نەدەبرد کە ئەوەندە ئازارت هەبێت کە من دەتبینم، یاخود، من نەمزانیوە ئەوەندە ماندویت کە دەتبینم، ئایە مەڕێکت پێ هەڵدەسوڕێ؟ وتم نەخێر، فەرمووی سێ ڕۆژ بەڕۆژو ببە، یاخود خواردنی شەش هەژار بدە بۆ هەر هەژارێك نیو مەن خواردن،

وە لەدەربڕینێکی تردا هاتووە ((پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمانی پێکردوە کە سێ مەن خواردن لە نێوان شەش هەژاردا دابەش بکات، یاخود مەڕێك بکات بەخێر، یاخود سێ ڕۆژ بەڕۆژو ببێت)).

---

١ البخاري (١٨١٦) (٤٥١٧) مسلم (١٢٠١/٨٥)

٢ البخاري (١٨١٧)

## بـابُ حرمة مَكة - بەشى حەرامى مەككە

٢١٤ – عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ – خُوَيْلِدِ بْنِ عَمْرٍو – الْخُزَاعِيِّ الْعَدَوِيِّ رضي الله عنه: أَنَّـهُ قَـالَ لِعَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ – وَهُـوَ يَبْعَـثُ الْبُعُـوثَ إِلَـى مَكَّـةَ – ائْـذَنْ لِـي أَيُّهَـا الأَمِـيرُ أَنْ أُحَدِّثَكَ قَوْلاً قَامَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم الْغَدَ مِنْ يَوْمِ الْفَتْحِ. فَـسَمِعَتْهُ أُذُنَـايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي، وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَايَ، حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ: ((أَنَّهُ حَمِـدَ اللهَ وَأَثْنَـى عَلَيْـهِ. ثُـمَّ قَـالَ: إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللهُ تَعَالَى، يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ، وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ. فَـلا يَحِـلُّ لامْـرِئٍ يُؤْمِنُ بِاَللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ: أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَماً، وَلا يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً. فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ بِقِتَـالِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقُولُوا: إِنَّ اللهَ أَذِنَ لِرَسُولِهِ، وَلَـمْ يَـأْذَنْ لَكُـمْ. وَإِنَّمَـا أَذِنَ لِرَسُولِهِ سَـاعَةً مِـنْ نَهَـارٍ. وَقَـدْ عَـادَتْ حُرْمَتُهَـا الْيَـوْمَ كَحُرْمَتِهَـا بِـالأَمْسِ. فَلْيُبَلِّـغِ الـشَّاهِدُ الْغَائِبَ. فَقِيلَ لأَبِي شُرَيْحٍ: مَا قَالَ لَكَ عَمْرٌو؟ قَالَ: أَنَا أَعْلَـمُ بِـذَلِكَ مِنْـكَ يَـا أَبَـا شُـرَيْحٍ، إِنَّ الْحَرَمَ لا يُعِيذُ عَاصِياً، وَلا فَارّاً بِدَمٍ وَلا فَارّاً بِخَرْبَةٍ))[1].

الخَرْبَة: بالخاء المعجمة والراء المهملة. قيل: الخيانة، وقيل: البليَّة، وقيل: التهمة.

واتە: لـە ئـەبو شـورەیحەوە کـەناوی خوێلیـدی کـوڕی عـەمری خـوزاعی عەدەوییـە (ڕەزای خوای لێبێ) کە بە عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی وتـوە لـەو کاتـەی کـە هێزی ناردووە بۆ مەککە، ڕێگەم بە ئەی ئەمیر کە قسەیەکت بـۆ بکـەم کـە پێغەمبـەری خوا (ﷺ) هەستاوە پێی بەیانی ڕۆژی فەتحی مەککە، هەردوو گوێم بیستی وە دڵیـشم وەری گرت، وە هەردوو چـاوم دی کاتێـك کـە پێغەمبـەر (ﷺ) باسـی کـرد، سـوپاس و ستایشی خوای گەورەی کـرد، پاشـان فـەرمووی (( بێگومـان خـوای گـەورە مەککـەی حەرام کردووە کە شەڕی تیادا بکرێت لەو ڕۆژەوەی کـە زەوی و ئاسمانـەکانی دروسـت کـردووە وە خـەڵك حـەرامیان نـەکردووە، وە ڕەواو حـەڵاڵ نییـە بـۆ هـیچ کەسـێك کـە باوەڕی بە خـواو ڕۆژی دوایـی هـەبێت خـوێنی تیـادا بڕێـژێت، یـاخود دارێکـی ببڕێـت،

---

[1] البخاري (١٠٤) (١٨٣٢) (٤٢٩٥) مسلم (١٣٥٤)

وەهەرکەسێك ئەو جەنگەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد بە بیانو بۆخۆی، ئەوا بڵێن خوای گەورە ڕێگەی دا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ)ڕێگەی بە ئێوە نەداوە، وە ڕێگەی دا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) چەند ساتێك لە ڕۆژدا، وە حەرامێکەی گەڕایەوە ئەمڕۆ هەروەك دوێنێ، جابا ئامادە بە ئامادە نەبوی بگەیەنێت)).

بە ئەبوشورەیح وترا: عەمر چی پێوتی؟ وتی، عەمر وتی من لەتۆ باشتر ئەوە دەزانم ئەی ئەبوشورەیح، بێگومان مەککە تاوان بار ناپارێزێت وە خوێن ڕێژێکی ڕاکردوو ناپارێزێت، وە توهمە دارێکی ڕاکردووش ناپارێزێت)).

الخَرَبَة: سێ وتەی لەسەرە، ١ـ کوشتن. ٢ـ بەلا. ٣ـ تاوان.

تێبینی وەرگێڕ: عەمر کاتێك ئەو قسانەی بە ئەبوشورەیح وت مەبەستی بەتاوان بارەکە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بوو (ڕەزای خوایان لێبێ) چونکە عەبدوڵڵای (ڕەزای خوای لێبێ) بەیعەتی نەدا بە یەزیدی کوڕی موعاویە کاتێك کە موعاویە (ڕەزای خوای لێبێ) یەزیدی کوڕی لەشوێنی خۆی دانا ئەوەبوو یەزید فەرمانی کرد بە عەمر کە والی مەدینە بوو هێز بنێرێت بۆ مەککە بۆ شەڕکردن دژی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خوایان لێبێ) بۆیە ئەبوشورەیح ئەم ئامۆژگاریانەی کرد، وە عەبدوڵڵای (ڕەزای خوای لێبێ) لەسەر حەق بوو حاشا کە ئەو ئەوەندە تاوانبار بێت.

٢١٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم – يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ – ((لا هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ. وَإِذَا اُسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا، وَقَالَ: يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: إِنَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللهُ يَوْمَ خَلَقَ اللهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَأَنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيهِ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَلَمْ يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ وَهَذِهِ سَاعَتِي فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. لا يُعْضَدُ شَوْكُهُ، وَلا يُنَفَّرُ صَيْدُهُ، وَلا يَلْتَقِطُ لُقْطَتَهُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَهَا. وَلا يُخْتَلَى خَلاهُ. فَقَالَ الْعَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِلاَّ الإِذْخِرَ. فَإِنَّهُ لِقَيْنِهِمْ وَبُيُوتِهِمْ. فَقَالَ: إِلاَّ الإِذْخِرَ)) [١]. القينُ: الحدَّاد.

---

١ البخاري (٣١٨٩) (٢٧٨٣) (٢٨٢٥) (١٥٨٧) (١٨٣٣) (١٨٣٤) (٤٣١٣) مسلم (١٣٥٣) واللفظ لمسلم

واته: له عه‌بدوڵلای كوڕی عه‌باسه‌وه (ڕه‌زای خوایان لێبێ) ده‌ڵێ: ((پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ڕۆژی فه‌تحی مه‌ككه فه‌رمووی، كۆچ كردن نییه دوای فه‌تحی مه‌ككه له‌مه‌ككه‌وه بۆ مه‌دینه، به‌ڵكو جیهاد و ویست بۆ كرده‌وه‌ی باش ماوه، وه كاتێك دوای هه‌ستانتان بۆ جیهاد لێكرا ئه‌وا هه‌ستن، وه‌هه‌ر له ڕۆژی فه‌تحی مه‌ككه‌دا فه‌رمووی ((بێگومان ئه‌م شاره خوای گه‌وره حه‌رامی كردوه له‌و ڕۆژه‌وه‌ی كه زه‌وی و ئاسمانه‌كانی دروست كردووه وه حه‌رامه به‌بۆنه‌ی ئه‌وه‌وه‌ی خوای گه‌وره خۆی حه‌رامی كردووه هه‌تا ڕۆژی دوایی، وه‌شه‌ڕكردن تیایدا حه‌ڵاڵ نه‌بووه بۆ هیچ كه‌سێك پێش من، وه بۆ منیش حه‌ڵاڵ نه‌بوو جگه له چه‌ند ساتێكی ڕۆژێك نه‌بێت، ئه‌وه‌ش ئائه‌م سه‌عاته‌یه، وه حه‌رامه به‌بۆنه‌ی ئه‌وه‌وه‌ی خوای گه‌وره خۆی حه‌رامی كردووه هه‌تا ڕۆژی دوایی، دڕكی نابڕڕێت، وه نێچیری ڕاونانرێت، وه وون بوی هه‌ڵناگیرێته‌وه جگه له‌كه‌سێك نه‌بێت كه بیناسێنێت، وه نابێت گژ و گیای ببڕڕێت)).

عه‌باس (ڕه‌زای خوای لێبێ) وتی ((جگه له إِذْخِر (كه گیایه‌كی بۆن خۆشه) ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) بۆ ئاسنگه‌ر و سه‌قفی خانوه‌كانیان به‌كاری ده‌هێنن، فه‌رمووی، جگه له إِذْخِر)). القينُ: واته: ئاسنگه‌ر.

## بابُ ما يجوزُ قتلُهُ - بەشی ئەو ئاژەڵانەی کە کوشتنیان دروستە

٢١٦ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم قَالَ: ((خَمْسٌ مِنْ الدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ، يُقْتَلْنَ فِي الْحَرَمِ: الْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ))[1].

وَلِمُسْلِمٍ قَالَتْ أَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلم: ((يُقْتَلُ خَمْسُ فَوَاسِقَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ))[2].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((پێنج جۆر ئاژەڵ هەموویان ئازار دەرن لە مەککەدا دەکوژرێن، قەلەڕەش و، کۆلارە وە (سوورە داڵ و مشك گرەشی پێدەوترێ) وە دوو پشك، وە مشك، وە سەگی هار)).

وە لەدەربڕینێکدا لەلای پێشەوا موسلیم: دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمانی کرد بەکوشتنی پێنج ئازار دەر لە مەککەو دەورووبەری مەککە)).

ڕوونکردنەوە: هەرچی گیاندارێك ئازار دەر بێت وەك ئەمانە یاخود ئازار و زیانی زیاتری هەبێت ئەوا کوشتنی دروستە لە مەککەو غەیری مەککە.

---

١ البخاري (١٨٢٩) (٣٣١٤) مسلم (١١٩٨/٧١)

٢ مسلم (١١٩٨/٦٧)

## بابُ دخولِ مكةَ والبيت- بەشی چوونە ناو مەککە و بەیتەوە

٢١٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه -: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ، وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ، فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ فَقَالَ: اُقْتُلُوهُ)) [1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ)هاتە مەککەوە ساڵی فەتح، وە کڵاوێکی سەربازی لەسەردا بوو، کاتێک کە دایکەند لەسەری پیاوێك هات بۆلای وتی، ابْنُ خَطَل، خۆی هەڵواسیوە بە دیوارەکانی کەعبەدا، فەرمووی، بیکوژن)).

تێبینی وەرگێڕ: ابْنُ خَطَل، یەکێك بوو لەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمانی کوشتنی دەرکردبوو لە ڕۆژی فەتحدا چونکە موسڵمان بوو پاشان موسڵمانێکی کوشت وەلە ئیسلام هەڵگەڕایەوەو چووەوە ناو بێباوەڕەکانی مەککە وە چەند کەنیزەکێکی هەبوو گۆرانیان دەوت بەجنێودان بەسەر پێغەمبەری خوادا (ﷺ)

٢١٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم دَخَلَ مَكَّةَ مِنْ كَدَاءٍ، مِنْ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا الَّتِي بِالْبَطْحَاءِ، وَخَرَجَ مِنْ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى)) [2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە مەککەوە لە کەدائەوە (کە ڕێگەیەکە) لە الثَّنِيَّةُ الْعُلْيَا واتە لەبەشی سەرەوەی مەککە کەلەنێو گۆڕستانەکانی مەککەدایە لە بطحاء وە دەردەچوو لەبەشی خوارەوەی مەککە)).

---

١البخاري (١٨٤٦)(٣٠٤٤) (٤٢٨٦) (٥٨٠٨) مسلم (١٣٥٧)

٢ البخاري (١٥٧٦) مسلم (١٢٥٧) واللفظ للبخاري

٢١٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم الْبَيْتَ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبِلالٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ، فَأَغْلَقُوا عَلَيْهِمْ الْبَابَ فَلَمَّا فَتَحُوا الْبَابَ: كُنْتُ أَوَّلَ مَنْ وَلَجَ. فَلَقِيتُ بِلالاً، فَسَأَلْتُهُ: هَلْ صَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم؟ قَالَ: نَعَمْ، بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ)) [١].

واته: له عهبدوڵلاّی كوڕی عومهرهوه (ڕهزای خوایان لێبێ) دهڵێ: ((پێغهمبهری خواو (ﷺ) أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبِلالٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ (ڕهزای خوایان لێبێ)، چوونه بهیتهوه، وه دهرگایان لهسهر خۆیان داخست كاتێك كه دهرگاكهیان كردهوه، یهكهم كهس من چوومه ژوورهوه، به بیلال گهشتم (ڕهزای خوای لێبێ) پرسیارم لێكرد ئایه پێغهمبهری خوا (ﷺ) نوێژی له كهعبهدا كرد؟ وتی، بهڵێ، له نێوان دوو كۆڵهكهی یهمانی)).

---

١ البخاري (١٥٩٨) مسلم (١٣٢٩/٣٩٣)

## بابُ الطَّواف وأدبه - بەشی تەواف و ئادابەکانی

٢٢٠ – عَنْ عُمَرَ – رضي الله عنه – ((أَنَّهُ جَاءَ إِلَى الْحَجَرِ الأَسْوَدِ، وَقَبَّلَهُ. وَقَالَ: إِنِّي لأَعْلَمُ أَنَّك حَجَرٌ، لا تَضُرُّ وَلا تَنْفَعُ، وَلَوْلا أَنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ)) [١].

واتە: لە عومەرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ((کە هاتووە بۆلای بەردە ڕەشەکە و ماچی کردووە وە فەرموویەتی سوێند بەخوا من دەزانم کەتۆ بەردێکیت، نە زیان و نەسوودت نییە، ئەگەر پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەبینیایە ماچی کردویت ماچم نەدەکردیت)).

٢٢١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم وَأَصْحَابُهُ مَكَّةَ. فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّهُ يَقْدَمُ عَلَيْكُمْ قَوْمٌ قَدْ وَهَنَتْهُمْ حُمَّى يَثْرِبَ. فَأَمَرَهُمْ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ الثَّلاثَةَ، وَأَنْ يَمْشُوا مَا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ، وَلَمْ يَمْنَعْهُمْ أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ كُلَّهَا: إلاَّ الإِبْقَاءُ عَلَيْهِمْ)) [٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خواو (ﷺ) هاوەڵەکانی (ڕەزای خوایان لێبێ) هاتن بۆ مەککە، بێباوەڕەکان وتیان، خەڵکانێك دێن گەرمای یەثریب (واتە مەدینە) بێهێز و لاوازی کردوون پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی کرد بەهاوەڵانی کە لەسێ دەورانی یەکەمدا بەدەوری بەیتدا خێرا بڕۆن، وە لە نێوان ڕوکنی یەمانیدا بەئاسایی بڕۆن، وە هیچ شتێك ڕێگری نەکردن کە هەموو دەورانەکان بەخێرایی بکەن، جگە لەوە نەبێت کەتوانایان بمێنێت)).

ڕوونکردنەوە: جائەم خێراییە لە دەوران کردن بەدەوری بەیتدا بۆ ئەوە بوو کە بێباوەڕەکان بیان بینن کە ئەوان لاواز نە بوون هەروەك خۆیان بەهێزن وە دڵیان بتەقێ لە داخدا.

---

١ البخاري (١٥٩٧) مسلم (١٢٧٠/٢٥١)

٢ البخاري (١٦٠٢) (٤٢٥٦) مسلم (١٢٦٦)

٢٢٢– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ إذَا اسْتَلَمَ الرُّكْنَ الأسْوَدَ – أوَّلَ مَا يَطُوفُ – يَخُبُّ ثَلاثَةَ أشْوَاطٍ))[1].

واته: له عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوام دی (ﷺ) كاتێك كه هاته مەككه یەكەم جار كه تەواف كرد بەدەوری بەیتدا دەستی دا لەبەردە ڕەشەكه وه سێ جار بەهەروەله بەدەوری بەیتدا سووڕایەوه)).

٢٢٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((طَافَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى بَعِيرٍ، يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ))[2].

المِحْجَنُ: عصا مَحْنِيَّةُ الرَّأسِ.

واته: له عەبدوڵلای كوڕی عەباسەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ)تەواف كرد له حەجیماڵئاوایدا بەسەر وشترێكەوه، بە گۆچانێكی سەر چەماوه دەستی دەدا له ڕوكنەكان)).

المِحْجَنُ: واته گۆچانێكی سەر چەماوه.

٢٢٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((لَمْ أرَ النَّبيَّ صلَّى الله عليه وسلم يَسْتَلِمُ مِنْ الْبَيْتِ إلاَّ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ))[3].

واته: له عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەدیوه دەست با لەهیچ شتێكەوه له بەیت جگه له دوو ڕوكنه یەمانێكه نەبێ)).

---

١ البخاري (١٦٠٣) واللفظ له مسلم (١٢٦١)

٢ البخاري (١٦٠٧) مسلم (١٢٧٢)

٣ البخاري (١٦٠٩) واللفظ له مسلم (١٢٦٩)

## بابُ التَّمتُّعِ - بەشى حەجكردن بە تەمەتوع

حەج كردن سىَ جۆرە ١ـ تمتع. ٢ـ قِران. ٣ـ إفراد.

التمتع: واتە كەسێك كە چوو بۆ حەج ئيحرام ببەستێت بە عومرە لە مانگەكانى حەجدا هەركەچووە ئەوىَ تەواف بكات سەعى نێوان صەفا و مەروە بكات وە قژى كورت بكاتەوە ياخود صفرى بكات پاشان ئيحرام لە خۆى دەكاتەوە وە هەموو شتێكى بۆ حەلاَڵە هەتا كاتى حەج كردن بەلاَم واجبە لەسەرى كە خوێن برِێژێت.

القران: بريتييە لەوەى كە ئيحرام ببەستێت بە حەج و عومرە بەيەكەوە، وە ئەوكەسەى كەبە ئيفراد بە ستويەتى چيدەكات ئەميش بەهەمان شێوە، بەلاَم ئەم كردەوەكانى هى حەج و عومرەيە بەيەكەوە، وە واجبە لەسەرى كە خوێن برِێژێت.

الأفراد: بريتييە لەوەى كە ئيحرام ببەستێت بە حەج بەتەنيا، كاتێك كە چووە ناو مەككەوە تەوافى قدوم دەكات، كە سونەتە پاشان ويستى كرد سەعى نێوان صەفاو مەروە دەكات بۆ حەج وە ئەگەر ئارەزووى كرد دواى دەخات بۆ دواى تەوافى زيارەت دواى ئەمانە هيچ شتێك بۆى حەلاَڵ نييە هەتا رِۆژى جەژن حەجەكەى تەواو دەكات.

٢٢٥- عَنْ أَبِي حَمْزَةَ نَصْرِ بْنِ عِمْرَانَ الضُّبَعِيِّ، قَالَ: ((سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ الْمُتْعَةِ؟ فَأَمَرَنِي بِهَا، وَسَأَلْتُهُ عَنْ الْهَدْيِ؟ فَقَالَ: فِيهِ جَزُورٌ، أَوْ بَقَرَةٌ، أَوْ شَاةٌ، أَوْ شِرْكٌ فِي دَمٍ قَالَ: وَكَأَنَّ أُنَاساً كَرِهُوهَا، فَنِمْتُ. فَرَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ: كَأَنَّ إنْسَاناً يُنَادِي: حَجٌّ مَبْرُورٌ، وَمُتْعَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ. فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَحَدَّثْتُهُ. فَقَالَ: اللهُ أَكْبَرُ سُنَّةُ أَبِي الْقَاسِمِ صلَّى الله عليه وسلم)) [1].

واتە: لە ئەبو حەمزەوە (رِەحمەتى خواى لێبىَ) كە ناوى نەصرى كورِى عيمرانى ضەبعييە دەلَىَ:پرسيارم كرد لە عەبدوڵلاَى كورِى عەباس (رِەزاى خوايان لێبىَ) سەبارەت بە حەجى تەمەتوع؟ فەرمانى پێكردم كە بيكەم،وە پرسيارم لێكرد

---

١ البخاري (١٦٨٨) مسلم (١٢٤٢)

سەبارەت بە قوربانی؟ فەرمووی، وشترێك، یاخود مانگایەك، یاخود مەڕێك، یاخود حەوت یەكی وشترێك یان مانگایەك، دەڵێ:خەڵكی وەك ئەمەیان پێناخۆش بێت وابوو، خەوتم لەخەوما دیم وەك كەسێك بانگ بكات، حەجێكی وەرگیراو، وە تەمەتوعێكی قوبوڵ كراو، هاتم بۆلای عەبدوڵڵای كوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێ) هەواڵم پێدا، وتی الله أكبر ئەوە سونەتی أبو القاسمه واتە پێغەمبەری خوا (ﷺ))).

٢٢٦ – عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم أَنَّهَا قَالَتْ: ((يَا رَسُولَ الله، مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا مِنَ الْعُمْرَةِ وَلَمْ تَحِلَّ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ فَقَالَ: إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلا أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ)) [1].

واتە: لە دایكمان حەفصەوە (ڕەزای خوای لێبێ) كە خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ)كە وتویەتی ((ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی خەڵكی ئیحرامی عومرەیان لەخۆیان كردۆتەوە وە تۆ هەر لە ئیحرامدایت، فەرمووی، من قژم بەستووە، وە حەیوانیشم لەگەڵ خۆم هێناوە، ئیحارام ناشكێنم هەتا خوێن نەڕژم)).

ڕوونكردنەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە قژی بەستبوو چونكە قژی درێژ بوو وەدەشیزانی هەتا ڕۆژی جەژن لە ئیحرامدا دەبێت بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا خۆڵ و تەپو تۆزی تێنەچێت كە شانەی ناكات.

٢٢٧ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: ((أُنْزِلَتْ آيَةُ الْمُتْعَةِ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى. فَفَعَلْنَاهَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَلَمْ يَنْزِلْ قُرْآنٌ بِحُرْمَتِهَا، وَلَمْ يَنْهَ عَنْهَا حَتَّى مَاتَ. فَقَالَ رَجُلٌ بِرَأْيِهِ مَا شَاءَ)) [2]. قَالَ الْبُخَارِيُّ " يُقَالُ: " إِنَّهُ عُمَرُ ". وَلِمُسْلِمٍ ((نَزَلَتْ آيَةُ الْمُتْعَةِ – يَعْنِي مُتْعَةَ الْحَجِّ – وَأَمَرَنَا بِهَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ثُمَّ لَمْ تَنْزِلْ آيَةٌ تَنْسَخُ آيَةَ مُتْعَةِ الْحَجِّ وَلَمْ يَنْهَ عَنْهَا حَتَّى مَاتَ)) [3]. وَلَهُمَا بِمَعْنَاهُ.

---

١ البخاري (١٥٦٦) (١٦٩٧) (١٧٢٥) (٥٩١٦) مسلم (١٢٢٩)

٢ البخاري (٤٥١٨)

٣ مسلم (١٢٢٦/١٧٢)

واته: له عیمرانی کوڕی حوصەینەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئایەتی حەج کردن به تەمەتوع دابەزی له کتێبی خوای گەوره (واته قورئان) وه ئێمەش کردمان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وه قورئان دانەبەزی بە حەرام کردنی، وه پێغەمبەری خواداش (ﷺ)قەدەغەی نەکرد هەتا وەفاتی کرد، پیاوێك قەدەغەی کرد بە ئارەزووی خۆی، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:، وتراوه ئەو پیاوه عومەره (ڕەزای خوای لێبێ)).

وه لەدەربڕینێکی تردا لەلای پێشەوا موسلیم: عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئایەتی موتعه دابەزی - واته - حەجی تەمەتوع - وه پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردین، پاشان هیچ ئایەتێك دانەبەزی ئایەتی حەج کردن بەتەمەتوع هەڵبوەشێنێتەوه، وه پێغەمبەری خواداش (ﷺ) قەدەغەی نەکرد هەتا وەفاتی کرد. لەلای پێشەوا بوخاری و موسلیم هاتووه بەیەك واتا.

ڕوونکردنەوه: ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) کە ڕێگری لە حەج کردن بە تەمەتوع دەگرد بۆ سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)نەبوو بەڵکو ئیجتیهادێك بوو وه دەیبینی خەڵکی تەمەڵی دەکەن وه لەو عومرەیە زیاتر ناکەن کەلەگەڵ حەجدا دەیکەن بۆیە ئاوا فەرمانی پێدەکردن بەڵام حەج کردن بە تەمەتوعیش هەر لەلایەن خوداوەیەو درووستە بۆمان بەبێ جیاوازی.

٢٢٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((تَمَتَّعَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ وَأَهْدَى. فَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْيَ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ. وَبَدَأَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، فَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَكَانَ مِنْ النَّاسِ مَنْ تَمَتَّعَ، فَسَاقَ الْهَدْيَ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ. وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ – صلَّى الله عليه وسلم – مَكَّةَ قَالَ لِلنَّاسِ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ قَدْ أَهْدَى، فَإِنَّهُ لا يُحِلُّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى يَقْضِيَ

حَجَّهُ. وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ أهْدَى فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلْيُقَصِّرْ وَلْيَحْلِلْ، ثُمَّ لِيُهِلَّ بِالْحَجِّ وَلْيُهْدِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً فَلْيَصُمْ ثَلاثَةَ أيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةً إذَا رَجَعَ إلَى أهْلِهِ فَطَافَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم حِينَ قَدِمَ إلى مَكَّةَ. وَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ أوَّلَ شَيْءٍ، ثُمَّ خَبَّ ثَلاثَةَ أشْوَاطٍ مِنْ السَّبْعِ، وَمَشَى أرْبَعَةً، وَرَكَعَ حِينَ قَضَى طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَأتَى الصَّفَا، وَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعَةَ أشْوَاطٍ، ثُمَّ لَمْ يَحِلَّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى قَضَى حَجَّهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ يَوْمَ النَّحْرِ. وَأفَاضَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ حَرُمَ عَلَيهِ، وَفَعَلَ مِثْلَ مَا فَعَلَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : مَنْ أهْدَى فَسَاقَ الْهَدْيَ مِنْ النَّاسِ [1].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ)له حەجی ماڵ ئاوایدا له پێشدا ئیحرامی به عومره بەست پاشان به حەج، وه مەڕێکی کرد به فیدیه له (ذو الحليفة) وه ئەو حەیوانەشی لەگەڵ خۆی هێنابووی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرەتا به عومره دەستی پێکرد، پاشان بەحەج، وه خەڵکیش له خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئیحرامیان له نێوان عومره بۆ حەج بەست، جا خەڵکانێك هەبوو فیدیەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو له ذو الحليفة هەش بوو نەیهێنا بوو، کاتێك که پێغەمبەر (ﷺ) گەشته مەککه به خەڵکەکەی فەرموو، هەر کەسێك له ئێوه که فیدیەی لەگەڵ خۆیدا هێناوه ئەوا هیچ شتێك لەوانەی کەلێی حەرام کراوه بۆی حەلاڵ نییه هەتا حەجەکەی تەواو دەکات، وه هەر کەسێك له ئێوه که فیدیەی پێنییه ئەوا با تەواف بەیت و صەفاو مەروه بکات وه مووی سەری ببڕێ و ئیحرام بشکێنێت، پاشان ئیحرام بۆ حەج ببەستێت وه فیدیه بدات، ئەوەش توانای فیدیه دانی نییه با سێ ڕۆژ له حەج بەڕۆژو ببێت وه حەوتیش کاتێك گەڕایەوه ناو کەس و کاری، ئینجا پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کاتێك گەشته مەککه یەکەم شت دەستی دا لەبەردە

---

١ البخاري (١٦٩١) مسلم (١٢٢٧)

ڕەشەکە، پاشان سیّ سووڕی لە حەت جارەکە بەهەروەلە کرد وە چوار جارەکەی تریش بە ڕۆشتن، وە دوو ڕکات نوێژی لای مەقامدا کرد کاتێك کە تەوافەکەی بەدەوری بەیتدا تەواو کرد، پاشان سەلامی دایەوە و هات بۆ صەفا حەوت جار لە نێوان صەفا و مەروەدا گەڕا پاشان ئیحرامی نەشکاند وە هیچ شتێك لەو شتانەی لێی حەرام بوو بۆی حەلاڵ نەبوو هەتا حەجەکەی تەواو کرد، وە قوربانیەکەی لە ڕۆژی جەژندا سەر بڕی وە لەمینا هاتە خوارەوەو تەوافی بەیتی کرد، پاشان ئیحرامی شکاند لەو شتانەی کە لێی حەرام بوو وە ئەو کەسانەی کە حەیوانی قوربانیان هێنابوو هەر وەك پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کرد)).

٢٢٩ – عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم أَنَّهَا قَالَتْ: ((يَا رَسُولَ الله، مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا مِنْ الْعُمْرَةِ وَلَمْ تَحِلَّ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ فَقَالَ: إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلا أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ)) [1].

واتە: لە دایکمان حەفصەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ) کە وتویەتی ((ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆچی خەڵکی ئیحرامی عومرەیان لەخۆیان کردۆتەوە وە تۆ هەر لە ئیحرامدایت، فەرمووی، من قژم بەستووە، وە حەیوانیشم لەگەڵ خۆم هێناوە، ئیحارام ناشکێنم هەتا خوێن نەڕژم)).

ڕوونکردنەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆیە قژی بەستبوو چونکە قژی درێژ بوو وەدەشیزانی هەتا ڕۆژی جەژن لە ئیحرامدا دەبێت بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا خۆڵ و تەپو تۆزی تێنەچێت کە شانەی ناکات.

١ البخاري (١٥٦٦) (١٦٩٧) (١٧٢٥) (٥٩١٦) مسلم (١٢٢٩)

## بابُ الهَدْيِ - بەشی حەیوانی قوربانی حەج كردن

٢٣٠ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((فَتَلْتُ قَلائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ثُمَّ أَشْعَرَهَا وَقَلَّدَهَا – أَوْ قَلَّدْتُهَا – ثُمَّ بَعَثَ بِهَا إِلَى الْبَيْتِ. وَأَقَامَ بِالْمَدِينَةِ، فَمَا حَرُمَ عَلَيْهِ شَيْءٌ كَانَ لَهُ حِلاًّ)) [١].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پەتم كردە ملی ئەو حەیوانانەی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەینارد بۆ مەككە بۆ خێر، پاشان لایەكیم داخ دەكردو وە پەتم دەكردە ملی، پاشان دەینارد بۆ مەككە، وە خۆشی لە مەدینە بوو، هیچ شتێكی لێ حەرام نەبوو كە بۆ ئەو حەلاڵ بوو)).

٢٣١ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((أَهْدَى النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم مَرَّةً غَنَماً)) [٢].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((جارێكیان پێغەمبەر (ﷺ) مەڕی نارد بۆ مەككە بەدیاری (واتە بۆ خێر))).

٢٣٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، قَالَ: ارْكَبْهَا، قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ ارْكَبْهَا. فَرَأَيْتُهُ رَاكِبَهَا، يُسَايِرُ النَّبِيَّ.والنَّعْلُ فِي عُنُقِهَا)) [٣]. وَفِي لَفْظٍ قَالَ فِي الثَّانِيَةِ، أَوْ الثَّالِثَةِ: ((ارْكَبْهَا. وَيْلَكَ، أَوْ وَيْحَكَ)) [٤].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێكی دی وشترێكی دابۆ پێش خۆی، فەرمووی، سواری ببە، وتی بۆ قوربانییە،

---

١ البخاري (١٦٩٩) مسلم (١٣٢١)

٢ البخاري (١٧٠١) مسلم (١٣٢١/٣٦٧)

٣ البخاري (١٧٠٦)

٤ البخاري (٢٧٥٥) (٦١٦٠) مسلم (١٣٢٢)

فەرمووی، سواری ببە، ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: کابرام دی سواری بوو بەلای چەپی پێغەمبەردا (ﷺ)دەڕۆشت، وە نەعلەکانی لەملی وشترەکەدا بوو)).

وە لەدەربڕینێکی تردا: ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە دووەم جاردا یاخود لە سییەم جاردا فەرمووی، سواری ببە داماو.

٢٣٣ – عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((أَمَرَنِي النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِلَحْمِهَا وَجُلُودِهَا وَأَجِلَّتِهَا، وَأَنْ لا أُعْطِيَ الْجَزَّارَ مِنْهَا شَيْئًا وَقَالَ: نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا)) [1].

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو طالبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمانی پێکرد کە سەرپەرشتی قوربانییەکەی بکەم، وە گۆشت و پێستەو سەر پشتەکەی بکەم بەخێر هیچی نەدەم بە قەسابەکە، وە فەرمووی ئێمە خۆمان کرێکەی دەدەینێ)).

٢٣٤– عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: ((رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ قَدْ أَتَى عَلَى رَجُلٍ قَدْ أَنَاخَ بَدَنَتَهُ يَنْحَرُهَا. فَقَالَ ابْعَثْهَا قِيَاماً مُقَيَّدَةً سُنَّةَ مُحَمَّدٍ صلَّى الله عليه وسلم)) [2].

واتە: لە زیادی کوڕی جوبەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((عەبدوڵلای کوڕی عومەرم دی (ڕەزای خوایان لێبێ) هاتەلای پیاوێك وشترەکەی بەچۆکدا خستبوو سەری دەبڕی، وتی هەڵیبسێنە سەر پێو ببەستەرەوە ئینجا سەری ببڕە، سونەتی موحەمەدە (ﷺ))).

---

١ البخاري (١٧١٣) مسلم (١٣٢٠)

٢ البخاري (١٧١٣) مسلم (١٣٢٠)

## بابُ الغُسْلِ للمُحْرِمِ - بەشی خۆشۆردنی ئیحرام پۆش

٢٣٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُنَيْنٍ: ((أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ. وَقَالَ الْمِسْوَرُ: لا يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ قَالَ: فَأَرْسَلَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه –. فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ، وَهُوَ يَسْتَتِرُ بِثَوْبٍ. فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ. فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ حُنَيْنٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ ابْنُ عَبَّاسٍ، يَسْأَلُكَ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ، فَطَأْطَأَهُ، حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ. ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ الْمَاءَ: اُصْبُبْ، فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ. ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ. ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ صلَّى الله عليه وسلم يَفْعَلُ)) [١].
وَفِي رِوَايَةٍ " فَقَالَ الْمِسْوَرُ لابْنِ عَبَّاسٍ: لا أُمَارِيكَ بَعْدَهَا أَبَداً " [٢].

القرنانِ: العمودان اللذان تُشَدُّ فيهما الخشبة التي تُعَلَّقُ عليها بَكرةُ البئرِ.

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی حونەینەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ((عەبدوڵڵای کوڕی عەباس و میسوەری کوڕی مەخرەمە (ڕەزای خوایان لێبێ) لە (أبواء ـ کە ناوچەیەکە لە نێوان مەککە و مەدینەدا) ڕایان جیاواز بوو، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێ) وتی، ئیحرام پۆش بۆی هەیە سەری بشوات، میسوەر (ڕەزای خوای لێبێ) وتی، ئیحرام پۆش بۆی نییە سەری بشوات، دەڵێ:، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێ) ناردمی بۆلای ئەبو ئەیوبی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێبێ) سەیر دەکەم خۆی دەشوات لە نێوان دوو کۆڵەکەدا وە پەردەی پۆشیوە، جا سەلامم لێکرد، وتی ئەوە کێیە؟ وتم عەبدوڵڵای کوڕی حونەینم عەبدوڵڵای کوڕی

١ البخاري (١٨٤٠) مسلم (١٢٠٥)
٢ مسلم (١٢٠٥/٩٢)

عەباس (ڕەزای خوایان لێبێ) ناردمی بۆلای تۆ تا لێت بپرسێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن سەری شۆردووە کاتێك کە لە ئیحرامدا بوو، ئەبو ئەیوب (ڕەزای خوای لێبێ) دەستی خستە سەر پەردەکە و دای نەواند هەتا سەریم لێدەرکەوت، پاشان وتی بەکەسێك کە ئاو بکات بەسەریدا، ئەویش کردی بەسەریدا پاشان سەری جولاند بە هەردوو دەستی پێش و دوای بەدەستەکانی کرد پاشان وتی، ئابەم شێوەیە پێغەمبەریم (ﷺ) دیوە سەری شۆردووە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا هاتووە: کە میسوەر (ڕەزای خوای لێبێ) بە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسی وتوە (ڕەزای خوایان لێبێ) هەرگیز دەدەمێت لەگەڵدا ناکەم.

## بابُ فَسْخِ الحجِّ إلى العُمْرَةِ - بەشى هەڵوەشانەوەى حەج بۆ عومرە

٢٣٦ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ ((أَهَلَّ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم وَأَصْحَابُهُ بِالْحَجِّ وَلَيْسَ مَعَ أَحَدٍ مِنْهُمْ هَدْيٌ غَيْرَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم وَطَلْحَةَ، وَقَدِمَ عَلِيٌّ – رضي الله عنه – مِنْ الْيَمَنِ. فَقَالَ: أَهْلَلْتُ بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فَأَمَرَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم أَصْحَابَهُ: أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَيَطُوفُوا ثُمَّ يُقَصِّرُوا وَيُحِلُّوا، إلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ الْهَدْيُ فَقَالُوا: نَنْطَلِقُ إلَى " مِنىً " وَذَكَرُ أَحَدِنَا يَقْطُرُ؟ فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: لَوْ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَوْلا أَنَّ مَعِي الْهَدْيَ لأَحْلَلْتُ. وَحَاضَتْ عَائِشَةُ. فَنَسَكَتِ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا، غَيْرَ أَنَّهَا لَمْ تَطُفْ بِالْبَيْتِ. فَلَمَّا طَهُرَتْ وَطَافَتْ بِالْبَيْتِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، تَنْطَلِقُونَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ، وَأَنْطَلِقُ بِحَجٍّ فَأَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ: أَنْ يَخْرُجَ مَعَهَا إلَى التَّنْعِيمِ فَاعْتَمَرَتْ بَعْدَ الْحَجِّ)) [١].

واتە: لە جابرى كوڕى عەبدوڵڵاوە (ڕەزاى خوايان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەرو (ﷺ)هاوەڵانى (ڕەزاى خوايان لێبێ) ئیحراميان بەست بەحەج (واتە بە إفراد) وە كەسيشيان حەيوانى قوربانيان پێنەبوو جگە لە پێغەمبەرو (ﷺ) طەلحە نەبێت (ڕەزاى خواى لێبێ) وە عەلى (ڕەزاى خواى لێبێ) لەيەمەنەوە هات وتى، ئيحرامم بەست بەوەى كە پێغەمبەر (ﷺ) ئیحرامى بەستووە، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانى كرد بەهاوەڵەكانى (ڕەزاى خوايان لێبێ) كە ئيحرامەكانيان هەڵبوەشێننەوەو بە عومرە بيبەستن، تەواف بكەن و پاشان موى سەريان ببڕن وە ئيحرام بشكێنن جگە لەكەسێك نەبێت كە قوربانى پێبێت، وتيان بچين بۆ ميناو وە عەورەتمان ئاوى لێدەتكێ (واتە دواى ئيحرام شكاندن ئافرەتيان بۆ حەلاڵ بوو ئەوانيش وتيان چۆن وا دەبێت) ئەمە گەشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى، ئەگەر ئێستام ئەوسا بوايە منيش حەيوانى

---

١ البخاري (١٦٥١) (١٧٨٥) (٧٢٣٠) مسلم (١٢١٣)

دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا وە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە دیاری بەیتم پێیە ئەوا ئیحرامم دەشکاندو دەمکرد بەعومرە، وە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) کەوتە حەیزەوە وە هەموو پایەکانی حەجی جێبەجێکرد، جگە لەوەی کە تەواف بەدەوری بەیتدا نەکرد، کاتێك کە پاك بۆوە وە تەواف بەدەوری بەیتدا کرد وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڕۆنەوە بەحەج و عومرەوە وە من بێمەوە بە حەجەوە پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی کرد بە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر (ڕەزای خوایان لێبێ) کە بچێت لەگەڵیدا بۆ تەنعیم، ئینجا عومرەی کرد دوای حەج)).

٢٣٧ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ – رضي الله عنهما – قَالَ: ((قَدِمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم وَنَحْنُ نَقُولُ: لَبَّيْكَ بِالْحَجِّ. فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَجَعَلْنَاهَا عُمْرَةً)) [١].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ)چووین بۆ حەج دەمانوت: لَبَّيْكَ بِالْحَجِّ. پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمانی پێکردین کە بیکەین بە عومرە (واتە لە ئیفرادەوە کردیان بە تەمەتوع)).

٢٣٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مِنْ ذِي الحِجَّةِ مُهِلِّينَ بِالحَجِّ. فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً. فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الْحِلِّ؟ قَالَ: الْحِلُّ كُلُّهُ)) [٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خواو (ﷺ) هاوەڵانی (ڕەزای خوایان لێبێ) لە هاتن چواری مانگی: ذِي الحِجَّةِ: دا ئیحرامیان بەستبوو بە حەج (واتە بە ئیفراد) پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمانی پێکردن کە بیشکێنن

١ البخاري (١٥٧٠) واللفظ له مسلم (١٢١٨)

٢ البخاري (١٥٦٤) (٣٨٣٢) مسلم (١٢٤٠)

وه بیکـەن بـه عـومره وتیـان، ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چـی ئیحـرام شـکاندنێك، فەرمووی هەموو شکاندنێك (واته هەموو شتێکیان بۆ حەڵاڵ بوو))).

٢٣٩ – عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: ((سُئِلَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ – وَأَنَا جَالِسٌ – كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَسِيرُ حِينَ دَفَعَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ. فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ)) [١].

العَنَقُ: انبساطُ السَّيرِ، و " النَّصُّ " فوق ذلكَ.

واته: له عورووەی کوڕی زوبەیرەوه (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: ((مـن دانیـشتبووم پرسیار کرا له ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوایان لێبێ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن دەڕۆی کاتێك له عەرەفەوه هات بۆ موزدەلیفه؟ وتی، مام ناوەندی دەڕۆشـت وەکاتێـك بۆشایی و مەجالێکی بەدی بکردایه خێراتری دەکرد)).

العَنَقُ: واته: مام ناوەندی ڕۆشتن. " النَّصُّ " خێراتر.

---

١ البخاري (١٦٦٦) مسلم (١٢٨٦/٢٨٣)

## بابُ حكم تقديم الرمي والنحر والحلق والإفاضة بعضها على بعض
## بەشی پێشخستن و دواخستنی شەیتان ڕەجمکردن و قوربانی کردن و مرتاشین و تەواف کردن هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا

٢٤٠ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرو بْن العَاصِ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رَسُولَ اللَـهِ صلَّى الله عليه وسلم وَقَفَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. فَجَعَلُوا يَسْأَلُونَهُ. فَقَالَ: رَجُلٌ لَمْ أَشْعُرْ، فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ قَالَ. اذْبَحْ وَلا حَرَجَ. وَقَالَ الآخَرُ: لَمْ أَشْعُرْ، فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ فَقَالَ: ارْمِ وَلا حَرَجَ. فَمَا سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلا أُخِّرَ إلاَّ قَالَ: افْعَلْ وَلا حَرَجَ))[1] .

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەستا لە حەجیماڵئاوایدا خەڵکی پرسیاریان لێدەکرد، پیاوێك وتی، نەمزانی سەرم تاشی پێش قوربانی کردن، فەرمووی، قوربانی بکە قەیناکە تاوان نییە، کەسێکی تر وتی، نەمزانی قوربانیم کرد پێش ئەوەی بەرد باران بکەم، فەرمووی، بەرد باران بکە قەیناکە تاوان نییە، هیچ پرسیارێکی لێنەکرا ئەو ڕۆژە سەبارەت بەشتێك پێش خرابێت یاخود دوا خرابێت هەر فەرمووی، بیکە گوناهو تاوان نییە)).

تێبینی وەرگێڕ: لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەو کارانەی کە ڕۆژی قوربانی دەکرێن ئەگەر پێش و دوا بخرێن ئەوا تاوان نییە بەلاّم گەر بەتەرتیب بکرێن ئەوە شوێن کەوتنی سونەتە ئەو کارانەش ئەمانەن بە ڕیز بەندی: بەرد باران ـ قوربانی ـ سەرتاشین ـ تەواف کردن.

---

١ البخاري (١٧٣٦) مسلم (١٣٠٦)

## بابُ كيف ترمي جمرة العقبة - بەشی چۆن شەیتان بەرد باران دەکەیت

٢٤١ – عنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ النَّخَعِيِّ: ((أَنَّهُ حَجَّ مَعَ ابْنِ مَسْعُودٍ. فَرَآهُ يَرمَى الْجَمْرَةَ الْكُبْرَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ فَجَعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ، وَمِنًى عَنْ يَمِينِهِ. ثُمَّ قَالَ: هَذَا مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ صلَّى الله عليه وسلم)) [١].

واتە: لە عەبدولڕەحمانی کوڕی یەزیدی نەخەعیەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ): ((کە حەجی کردووە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودا (ڕەزای خوایان لێبێ) دیوێتی کە بەرد بارانی الْجَمْرَةَ الْكُبْرَى: کردووە بەحەوت بەرد بەیتی خستۆتە لای چەپیو میناشی خستۆتە لای ڕاستی، پاشان وتویەتی، ئەمە ئەو جێگایەیە کە سورەتی " بقرة " دابەزیوەتە سەری (ﷺ))). (مەبەستی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)).

١ البخاري (١٧٤٧) (١٧٤٩) (١٧٥٠) مسلم (١٢٦٩/٣٠٧)

## بابُ فضل الحلق وجواز التقصير
## بەشى گەورەيى سەرتاشين وە دروستى كورت كردنەوەى

٢٤٢ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ. قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟. قَالَ: اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ. قَالُوا وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟. قَالَ: اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ. قَالُوا وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَالْمُقَصِّرِينَ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵلاى كوڕى عومەرەوە (ڕەزاى خوايان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرمووى ((پەروەردگارا لەوانە خۆش ببە كە سەريان تاشيوە، وتيان ئەى ئەوانەى كە كورتيان كردۆتەوە، فەرمووى، پەروەردگارا لەوانە خۆش ببە كە سەريان تاشيوە، وتيان ئەى ئەوانەى كە كورتيان كردۆتەوە، فەرمووى، پەروەردگارا لەوانە خۆش ببە كە سەريان تاشيوە، وتيان ئەى ئەوانەى كە كورتيان كردۆتەوە، فەرمووى، ئەوانەش كە كورتيان كردۆتەوە)).

---

١ البخاري (١٧٢٧) مسلم (١٣٠١/٣١٧)

## بابُ طواف الإفاضة والوداع
## بەشى تەوافى گەڕانەوە لەعەرەفەو تەوافى كۆتايى

٢٤٣ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((حَجَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَأَفَضْنَا يَوْمَ النَّحْرِ. فَحَاضَتْ صَفِيَّةُ. فَأَرَادَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم مِنْهَا مَا يُرِيدُ الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِهِ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا حَائِضٌ. قَالَ: أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا قَدْ أَفَاضَتْ يَوْمَ النَّحْرِ قَالَ: اُخْرُجُوا)) [١].

وَفِي لَفْظٍ: قَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : ((عَقْرَى، حَلْقَى. أَطَافَتْ يَوْمَ النَّحْرِ؟ قِيلَ: نَعَمْ. قَالَ: فَانْفِرِي)) [٢].

واته: له دايكمان عائيشهوه (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((حەجمان كرد لە خزمەت پێغەمبەرى خوادا (ﷺ) وە تەوافمان كرد ڕۆژى جەژن، ئينجا صەفييە (ڕەزاى خواى لێبێ) كەوتە حەيزەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ويستى سەر جێى لەگەڵدا بكات، منيش وتم ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ)ئەو لە حەيزدايە، فەرمووى، تۆ بڵێى نەمان هێڵێتەوە؟ وتيان ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ئەو ڕۆژى جەژن تەواف كردووە، فەرمووى، بڕۆن)).

وە لەدەربڕينێكى تردا: عائيشە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى ((لەش بەبار و زمان بەئازار بێت، ئايە تەواف كردووە ڕۆژى جەژن؟ وترا، بەڵێ: فەرمووى كەواتە بڕۆ)).

ڕوونكردنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) كە واى فەرموو مەبەستى دۆعا كردن نەبوو لێى بەڵكو ئەوە قسەيەكە لەسەر دەميان هەروەك نەريت.

---

١ البخاري (١٧٣٣) (١٧٥٧) مسلم (١٢١١/٣٨٦)

٢ البخاري (١٧٧١)

٢٤٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((أُمِرَ النَّاسُ أنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إلاَّ أنَّهُ خُفِّفَ عَنْ الْمَرْأةِ الْحَائِضِ)) [١].

واته: له عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((فەرمان كرا بەخەڵكی كه كۆتا كاریان تەوافی بەیت بێت، جگه لەئافرەتی حەیز دار نەبێت كه مۆڵەتی دراوەتێ)).

١ البخاري (١٧٥٥) مسلم (١٣٢٨)

## بـابُ وجوب المبيت بمنى - بەشى واجبيەتى مانەوە لە مينا

٢٤٥- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((اسْتَأْذَنَ الْعَبَّـاسُ بْـنُ عَبْـدِ الْمُطَّلِـبِ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنىً، مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ فَأَذِنَ لَه)) [١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((عەباسی کوڕی عبدالمطلب مۆڵەتی وەرگرت لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە شـەوەکانی مینـا لـە مەککـە بمێنێتەوە لەبەر ئاودان بەخەڵکی ئەویش مۆڵەتی دایە)).

ڕوونکردنەوە: مانەوە لە مینا واجبە بەڵام بـۆ کەسـێك نـەبێت وەك عەباسـی (ڕەزای خوای لێبێ) کە خزمەتی حاجیانی دەکرد یـاخود کەسـێك کـە مـاڵێکی هـەبێت ترسـی فەوتانی هەبێت یان کەسێکی نەخۆش کەسیش نەبێت خزمـەتی بکـات ئـەوا بـۆ ئەمانـە دروستە کە لە مینا نەمێننەوە.

## بـابُ جمعُ المغرب والعشاء في المزدلفة
## بەشى كۆكردنەوەى نوێژى ئێوارەو خەوتنان لە موزدەلیفە

٢٤٦ – عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهمـا – قَـالَ: ((جَمَـعَ النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليـه وسلم بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ " بِجَمْعٍ "، لِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَـا إِقَامَـةٌ. وَلَـمْ يُـسَبِّحْ بَيْنَهُمَـا، وَلا عَلَى أَثَرِ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا)) [٢].

واتـە: لـە عەبـدوڵلای کـوڕی عومـەرەوە (ڕەزای خوایـان لێبـێ) دەڵـێ: ((پێغەمبـەر (ﷺ) نوێـژی ئێـوارەو خـەوتنانی کـۆکردەوە بەکۆکردنەوەیـەك، بـۆ هـەر یـەکێکیان قامـەتێك، وە نوێـژی نـەکرد لـە نێوانیانـدا، وە لـە دوای هیـچیانەوە (واتـە نوێـژی سونەت))).

---

١ البخاري (١٧٤٥) مسلم (١٣١٥)

٢ البخاري (١٦٧٣) واللفظ له مسلم (١٢٨٧/٢٨٧)

## بابُ المُحْرِمِ يأكلُ من صيدِ الحلالِ
## بەشی ئیحرام پۆش بۆی هەیە گۆشتی نێچیر بخوات

٢٤٧ – عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم خَرَجَ حَاجًّا. فَخَرَجُوا مَعَهُ. فَصَرَفَ طَائِفَةً مِنْهُمْ – فِيهِمْ أَبُو قَتَادَةَ – وَقَالَ: خُذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ، حَتَّى نَلْتَقِيَ. فَأَخَذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ فَلَمَّا انْصَرَفُوا أَحْرَمُوا كُلُّهُمْ، إلاَّ أَبَا قَتَادَةَ، لَمْ يُحْرِمْ. فَبَيْنَمَا هُمْ يَسِيرُونَ إذْ رَأَوْا حُمُرَ وَحْشٍ. فَحَمَلَ أَبُو قَتَادَةَ عَلَى الْحُمُرِ. فَعَقَرَ مِنْهَا أَتَانًا. فَنَزَلْنَا وَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهَا. ثُمَّ قُلْنَا: أَنَأْكُلُ مِنْ لَحْمِ صَيْدٍ، وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ؟ فَحَمَلْنَا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا فَأَدْرَكْنَا رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم. فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: مِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَنْ يَحْمِلَ عَلَيْهَا، أَوْ أَشَارَ إلَيْهَا؟ قَالُوا: لا. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم: فَكُلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا))[1].

وَفِي رِوَايَةٍ: ((قَالَ: هَلْ مَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ؟ فَقُلْت: نَعَمْ. فَنَاوَلْتُهُ الْعَضُدَ، فَأَكَلَ مِنْهَا أَوْ فَأَكَلَهَا))[2].

واتە: لە ئەبو قەتادەی ئەنصارییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتەڕێ بۆ حەج هاوەڵانیش (ڕەزای خوایان لێبێ) لە خزمەتیدا، هەندێك لە هاوەڵانی جیاکردەوە کە ئەبو قەتادەیان تێدابوو، ئینجا فەرمووی، کەناری دەریاکە بگرن هەتا پێتان دەگەینەوە، کەناری دەریاکەیان گرت، کاتێك کە ڕۆشتن هەموویان ئیحرامیان بەست جگە لە ئەبو قەتادە نەبێت کە ئیحرامی نەبەست، کاتێك کە بەڕێگادا دەڕۆشتن چاویان کەوت بە کۆمەڵێك گوێ درێژی کێوی، ئەبو قەتادە هێرشی بۆ بردن مێینەیەکی لێ ڕاوکردن، ئینجا لاماندا و لە گۆشتەکەیمان خوارد، پاشان وتمان، گۆشتی

---

١ البخاري (١٨٢٤) مسلم (٦٠/١١٩٦)

٢ البخاري (٢٥٧٠)

ڕاوکراو بخۆین و وه ئێمه له ئیحرامداین؟ ئـهو گۆشـتـهی کـه مـابۆوه هـهڵمان گـرت کـه گهشتین به پێغهمبـهری خـوا (ﷺ)پرسـیارمان لێکـرد لـه بارهیـهوه، فـهرمووی، ئایـه کهس له ئێوه فهرمانی پێکرد یاخود ئاماژهی بۆ کرد؟ وتیـان نـهخێر، جـا پێغهمبـهری خوا (ﷺ)فهرمووی، ئهوهی که ماوهتهوه له گۆشتهکهی بیخۆن)).

له دهربڕینێکی تردا: ئهبو قـهتاده (ڕهزای خـوای لێبـێ) دهڵـێ: ((پێغهمبـهری خـوا (ﷺ) فهرمووی ئایه هیچتان پێماوه؟ وتم، بهڵێ قـۆڵێکیم بـۆ درێـژ کـرد لێـی خـوارد، یاخود، خواردی)).

٢٤٨ – عَنْ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَـةَ اللَّيْثِـيِّ – رضـي الله عنـه – ((أَنَّـهُ أَهْـدَى إِلَـى النَّبِـيِّ صلَّى الله عليه وسلم حِمَاراً وَحْشِيًّا، وَهُوَ بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ – فَرَدَّهُ عَلَيْـهِ. فَلَمَّـا رَأَى مَـا فِي وَجْهِهِ، قَالَ: إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنَّا حُرُمٌ))[1].

وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ " رِجْلَ حِمَارٍ " وَفِي لَفْظٍ " شِقَّ حِمَارٍ " وَفِي لَفْظٍ " عَجُزَ حِمَارٍ "[2].

قال المصنف: وجه هذا الحديث: أنه ظن أنه صيد لأجلـه والمحـرم لا يأكـل مـا صـيد لأجله.

واتـه: له صهعبی کوڕی جهثامهی لهیثیهوه (ڕهزای خوای لێبـێ) ((کـه گوێدرێـژێکی کێوی به دیاری هێنا بۆ پێغهمبهر (ﷺ) له ئهبواء یاخود له وهددان (کـه دوو ناوچـهی نزیك لهیهکن لـه نێـوان مهککـه و مهدینـهدا) گێڕایـهوه بـۆی، کاتێـك دی ڕوخـساری بـه جۆرێکه فهرمووی، ئێمه بۆمان نهدهگێڕایهوه تهنها لهبهر ئهوه نهبێت کـه لـه ئیحـرام داین)).

---

١ البخاري (١٨٢٥) (٢٥٧٣) (٢٥٩٦) مسلم (١١٩٣)

٢ مسلم (١١٩٣/٥٤)

وه له سىّ دەربڕینى تردا لەلاى ئیمامى موسلیم: هاتووه كه ئەو دیارییەى كـه بـۆى هێناوه، یان ڕانێكى گوێدرێژ بووه، یاخود لایەكى بووه، یاخود، پشتى بووه.

دانەرى كتێب (ڕەحمەتى خواى لێبىّ) دەفەرمووىّ: ئەم فەرموودەیە وادەردەكەوێت كه پێغەمبەر (ﷺ) گومانى برد كه لەبەر ئەو ڕاو كـراوه، وه كەسێك كـه لـه ئیحرامـدا بێت نابێت گۆشتى نێچیرێك بخوات كه له بەر ئەو ڕاوكرا بێت.

# كتابُ البيوعِ - پەرتووكی كڕين و فرۆشتن

٢٤٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنْ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم أَنَّـهُ قَالَ: ((إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلانِ، فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا وَكَانَا جَمِيعاً، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ. قَالَ: فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهُمَا الآخَرَ فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ. وَجَبَ الْبَيْعُ))[1].

واته: له عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) ئەويش له پێغەمبەری خواوه (ﷺ)كه فەرموويەتی ((كاتێك دوو كەس كڕين و فرۆشتنيان كرد هەردووكيان سەر پشكن بۆ ئەوەی پەشيمان ببنەوه، هەتا بەيەكەوه بن و لەيەك جيانەبنەوه، ياخود يەكێكيان بەويتريان بڵێ من ڕازيم تۆش سەر پشكيت، ئينجا فەرمووی، ئەگەر يەكێكيان ئەوی تری سەر پشك كرد وه ڕێك كەوتن لەسەر ئەوه ئەوا ئەو مامەڵەيه دامەزراوه)).

٢٥٠ - وَفِي مَعْنَاهُ مِنْ حَدِيثِ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا - أَوْ قَالَ: حَتَّى يَتَفَرَّقَا - فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا. وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا))[2].

واته: هەر له واتای ئەو فەرموودەيەدا له حەكيمی كوڕی حيزامەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((كڕيار و فرۆشيار سەر پشكن مادەم لەيەك جيانەبووبێتنەوه، ياخود فەرمووی، هەتا لەيەك جيادەبنەوه، جا ئەگەر لەگەڵ يەكدا ڕاستگۆبن و عەيبەكانی بۆ يەكتری ڕوون بكەنەوه پيرۆزی دەكەوێتە مامەڵەكەيانەوه، وه ئەگەر درۆيان كرد لەگەڵ يەكدا و عەيبەكانيان لەيەكتری شاردەوه ئەوا خێر و فەڕی مامەڵەكەيان دەڕوات)).

---

١ البخاري (٢١١٢) مسلم (١٥٣١/٤٤)

٢ البخاري (٢٠٧٩) (٢٠٨٢) (٢١١٠) (٢١١٤) مسلم (١٥٣٢)

## بابُ مانُهِيَ عنْهُ منَ البيوعِ - بەشی ئەو مامەڵانەی كە قەدەغەی لێكراوە

٢٥١ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنـه –: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ الْمُنَابَذَةِ – وَهِيَ طَرْحُ الرَّجُلِ ثَوْبَهُ بِالْبَيْعِ إلَى الرَّجُلِ قَبْلَ أَنْ يُقَلِّبَهُ، أَوْ يَنْظُرَ إلَيْهِ – وَنَهَى عَنْ الْمُلامَسَةِ. وَالْمُلامَسَةُ: لَمْسُ الرَّجُلِ الثَّوْبَ وَلا يَنْظُرُ إلَيْهِ)) [1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەڵەی: مُنَابَذَة: قەدەغە كرد. مُنَابَذَة: بریتییە لەوەی پیاوێك جلەكەی هەڵدا بۆ پیاوێكی تر ببێت بە ماڵی پێش ئەوەی ئەم دیوو ئەو دیوی بكات یاخود سەیری بكات، وە مامەڵەی: مُلامَسَة: قەدەغە كرد. مُلامَسَة: واتە هەر بەدەست لێدانی ببێتە ماڵی سەیری نەكات)).

٢٥٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ، وَلا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ. وَلا تَنَاجَشُوا. وَلا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ وَلا تُصَرُّوا الْغَنَمَ. وَمَنْ ابْتَاعَهَا فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَهَا. إنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعاً مِنْ تَمْرٍ)) [2].

وَفِي لَفْظٍ: ((هُوَ بِالْخِيَارِ ثَلاثاً)) [3].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((ڕووبەڕووی قافڵە و كاروانی مەڕۆن (واتە پێش ئەوەی بێنە بازاڕەوە ماڵەكەیان لێبكڕن) وە با هەندێكتان مامەڵە لەسەر مامەڵەی هەندێكتان نەكات، وە زەمكاری مەكەن (واتە كەسێكی تر بەبێ ئەوەی نیازی كڕینی هەبێت نرخی ماڵەكە

١ البخاري (٢١٤٤) مسلم (١٥١٢)

٢ البخاري (٢١٥٠) مسلم (١٥١٥/١١)

٣ مسلم (١٥٢٤/٢٥،٢٤)

بەرز بکاتەوە) وە با شار نشینێك شت و مەك بۆ گوند نشینێك نەفرۆشێت (لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە دەیکڕن خێریان بۆ بمێنێتەوە یاخود هەڵیان دەخەڵەتێنن بە نرخێکی کەم بۆ خۆیانی بکڕن) وە گوانی مەڕومالآت مەبەستن (بۆ ئەوەی شیری زۆر تێبێت بۆ کاتی فرۆشتن) هەرکەسێك ئەمەی کڕی دوو ڕێگەی لە بەردەمدایە دوای ئەوەی کە دۆشی، ئەگەر پێی ڕازی بوو ئەوا با بیهێڵێتەوە، وە ئەگەر حەزی لێینەبوو ئەوا بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی وە مەنێك خورماش (لەبری ئەو شیرەی کە دۆشیویەتی))) وە لەدەربڕینێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی ((کڕیار تا سێ ڕۆژ سەر پشکە)).

٢٥٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ تُتَلَقَّى الرُّكْبَانُ، وَأَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ)) [1]. قَالَ: فَقُلْتُ لابْنِ عَبَّاسٍ: مَا قَوْلُهُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَالَ: لا يَكُونُ لَهُ سِمْسَاراً)).

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ)ڕووبەڕووی قافڵە و کاروانی قەدەغەی کرد، وە شار نشینێك شت و مەك بۆ گوند نشینێك بفرۆشێت)). گێڕەرەوەی فەرموودەکە کە ناوی طاوسی کوڕی کەیسانی یەمانییە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ:ت بە عەبدوڵلای کوڕی عەباسم وت (ڕەزای خوایان لێبێ) مەبەست چییە لەوەی با شار نشینێك شت و مەك بۆ گوند نشینێك نەفرۆشێت؟ فەرمووی، نەبێت بە دەلآڵ بۆی.

٢٥٤ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ. وَكَانَ بَيْعاً يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ، كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الْجَزُورَ إِلَى

١ البخاري (٢١٥٨) (٢٢٧٤) مسلم (١٥٢١)

أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ. ثُمَّ تُنْتَجَ الَّتِي فِي بَطْنِهَا)) [١]. قِيلَ: إِنَّهُ كَانَ يَبِيعُ الشَّارِفَ – وَهِيَ الْكَبِيرَةُ الْمُسِنَّةُ – بِنِتَاجِ الْجَنِينِ الَّذِي فِي بَطْنِ نَاقَتِهِ)).

واته: له عه‌بدوڵلای كوڕی عومه‌ره‌وه (ڕه‌زای خوایان لێبێ) ده‌ڵێ: (( پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) مامه‌ڵه‌ی: حَبَلِ الْحَبَلَةِ. قه‌ده‌غه‌ی كرد، ئه‌مه مامه‌ڵه‌یه‌ك بوو خه‌ڵكی سه‌رده‌می نه‌فامی ده‌یان كرد، كه‌سێك وشتری ده‌فرۆشت وه ئه‌و به‌چكه‌یه‌ش كه له سكیایه‌تی وه پاشان ئه‌وه‌ی كه له سكی ئه‌ویشدایه)).وه وتراوه، ئه‌وه مامه‌ڵه كردنی شارفه كه وشترێكی به ساڵا چووه، به‌و به‌چكه‌یه‌ی كه له‌ناو سكی وشتره‌كه‌ی ئه‌ودایه)).

ڕوونكردنه‌وه: ئه‌م جۆره مامه‌ڵانه هه‌رهه‌موویان حه‌رام و ناشه‌رعین چونكه مامه‌ڵه‌ی نادیارن ده‌بێته هۆكاری زه‌ره‌رو زیان بۆ لایه‌نێك بۆیه ئیسلام ئه‌م مامه‌ڵانه‌ی قه‌ده‌غه كردووه.

---

١ البخاري (٢١٤٣) (٣٨٤٣) مسلم (٥،٦/١٥١٤)

## بابُ مانُهِيَ عن بيع الثمرة قبل بُدُوِّ صلاحها

## بەشی قەدەغەكردنی فرۆشتنی بەروبوم پێش پێگەیشتنی

٢٥٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاحُهَا. نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەڵەی بەروبوومی قەدەغە كرد هەتا پێدەگات قەدەغەی كرد لە فرۆشیارو كڕیار)).

٢٥٦ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ قِيلَ: وَمَا تُزْهِي؟ قَالَ: حَتَّى تَحْمَرَّ أَوْ تَصْفَرَّ. قَالَ: أَرَأَيْتَ إنْ مَنَعَ اللهُ الثَّمَرَةَ، بِمَ يَسْتَحِلُّ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ؟)) [2].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەڵەی بەروبوومی قەدەغە كرد هەتا پێگەشتن لێی دیاری دەدات، وترا چۆن لێی دیاری دەدات؟ وتی، هەتا سوور دەبێت یاخود زەرد، ئینجا وتی، ئەگەر خوای گەورە ڕێگری بەروبوومەكەی كرد (واتە توشی ئافەتێك بوو) چۆن یەكێك لە ئێوە ئەو ماڵە بە حەڵاڵ دەزانێت كە وەری گرتووە (واتە هەتا ئەو بەروبوومە پێنەگات مامەڵەی دروست نییە))).

---

١ البخاري (٢١٩٤) مسلم (١٥٣٤)

٢ البخاري (٢١٩٨) مسلم (١٥٥٥)

٢٥٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلم عَنْ الْمُزَابَنَةِ: أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ، إِنْ كَانَ نَخْلاً: بِتَمْرٍ كَيْلاً. وَإِنْ كَانَ كَرْماً: أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلاً، أَوْ كَانَ زَرْعاً: أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ. نَهَى عَنْ ذَلِكَ كُلِّهِ)) [١].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەڵی: مُزَابَنَة:ی قەدەغە کرد، واتە ئەگەر بەروبوومی باخەکەی خورما بوو، بیفرۆشێت بە خورمای وشکی پێوراو، وە ئەگەر باخەکەی ترێ بوو بیفرۆشێت بە مێوژی پێوراو، یاخود، کشتوکاڵ بێت، بیفرۆشێت بە خۆراکی پێوراو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو ئەمانەی قەدەغە کرد)).

٢٥٨ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: ((نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلم عَنْ الْمُخَابَرَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ، وَعَنْ الْمُزَابَنَةِ وَعَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاحُهَا، وَأَنْ لا تُبَاعَ إلاَّ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ، إلاَّ الْعَرَايَا)) [٢]. الْمُحَاقَلَةِ: بيعُ الحِنْطَةِ في سُنْبُلِها بِحِنْطَةِ.

واته: له جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ)مامەڵەی: مُخَابَرَة: و: مُحَاقَلَة: و: مُزَابَنَة: ی قەدەغە کرد وە مامەڵەی بەروبوومیش هەتا پێدەگات، وە مامەڵەی پێوە نەکرێت بەپارە نەبێت جگە لە: عَرَايَا: نەبێت (لە جێی خۆیدا باس دەکرێت))).

مُخَابَرَة: واتە کەسێك زەویەکی هەبێت بەکەسێکی تر بڵێت وەرە بکێڵە و تۆوی بکە دوایی بەشێکت دەدەمێ ئەمە دروست نییە چونکە لەوانەیە ئەو زەرعە نەبێت بەلاّم لەسەرەتاوە لە کێڵان و تۆو کردن و هەموو شتێکیا هاوبەش بن ئەوا دروستە.

مُحَاقَلَة: بریتییە لە فرۆشتنی گەنم لە گوڵەکەیدا بە گەنمی ساغ و پاککراو ئەمەش دروست نییە لەوانەیە گەنمی ناو ئەو گوڵە پوکاوەو خراپ بێت.

---

١ البخاري (٢١٧١) (٢١٨٥) (٢٢٠٥) مسلم (١٥٤٢/٧٦)

٢ البخاري (٢٣٨١) مسلم (١٥٣٦)

٢٥٩ – عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ)) [1].

واته: له ئهبو مهسعودی ئهنصارییهوه (ڕهزای خوای لێبی) دهڵێ: (( پێغهمبهری خوا (ﷺ)بهها و نرخی سهگ و کرێی ئافرهتی داوێن پیس و کرێی فاڵچی و قاوه گرهوه و دهست گرهوهی قهدهغه کرد)).

٢٦٠ – عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ – رضي الله عنه – أَنْ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((ثَمَنُ الْكَلْبِ خَبِيثٌ. وَمَهْرُ الْبَغِيِّ خَبِيثٌ، وَكَسْبُ الْحَجَّامِ خَبِيثٌ)) [2].

واته: له ڕافعی کوڕی خهدیجهوه (ڕهزای خوای لێبی) دهڵێ: پێغهمبهری خوا (ﷺ)فهرمووی ((بهها و نرخی سهگ پیسه، کرێی ئافرهتی داوێن پیس پیسه، دهست کهوت و پارهی کهڵهشاخ گر پیسه)).

تێبینی وهرگێڕ: دوو برگهی یهکهم گومانی تێدا نییه که حهرامه بهڵام، پارهی کهڵهشاخ گر زانایان جیاوازیان ههیه لهسهر حهڵاڵی بهڵام وتهی بههێز ئهوهیه که حهڵاڵه چونکه پێغهمبهری خوا (ﷺ) خۆی کهڵهشاخی گرتووهو پارهشی داوهتێ بهڵگهش لهسهری ئهم فهرموودهیهیه ((أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) حَجَمَ، وَ أَعْطَى الحَجَّامَ أَجْرَهُ)) [3]. (واته: پێغهمبهر (ﷺ) کهڵهشاخی گرتوو وه کرێشی دا به کهڵهشاخ گرهکه) وه خهڵکیش بهردهوام پێویستیان پێیهتی بهڵام کارێکی بێنرخه.

---

١ البخاري (٢٢٣٧) (٢٢٨٢) (٥٣٤٦) (٥٧٦١) مسلم (١٥٦٧)

٢ مسلم (١٥٦٨/٤١) و لم يخرجه البخاري

٣ أخرجه البخاري في كتاب الإجارة : باب خراج الحجام : رقم (٢٢٧٨،٢٢٧٩)

## بابُ العَرايا - بەشی عەرایا

عەرایا: واتە كڕینی خورمای تەڕ بە خورمـای وشـك بەخەملاندن جـا ئـەم ئـالوگۆڕە جمهوری زانایان دەفەرموون تایبەتە بە خورماوە چونكە جاران لە مەدینە دەكرا بـەلام كۆمەڵێك لە زانایان بە إبن تیمیەشەوە دەفەرموون، خورما میوەی مەدینەیە وە بۆ هەر شارێك میوەیەكی تایبەت بە خۆیان هەیە بۆیە ڕێگەدانەكە گشتیە واتـە هـەموو شـارێك دەتوانن لە میوەی سەرەكی خۆیاندا بیكەن بەلام بەچەند مەرجێك كە ئەو مەرجانە بـۆ خورماشە.

١ـ دەبێت پێویستی بە خورمای تەڕ هەبێت.

٢ـ دەبێت پارەی پێنەبێت.

٣ـ دەبێت بیخەملێنێت بەرامبەر خورما وشكەكە.

٤ـ دەبێت لە یەكی وەرگرن دەست بەدەست پێش جیابوونەوە.

٥ـ دەبێت لە پێنج ویسق زیاتر نەبێت (كە بەرامبەر بە ٦٥٢ كغم).

٢٦١ – عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ – رضي الله عنه – ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم رَخَّصَ لِصَاحِبِ الْعَرِيَّةِ: أَنْ يَبِيعَهَا بِخَرْصِهَا)) [١].

وَلِمُسْلِمٍ: ((بِخَرْصِهَا تَمْراً، يَأْكُلُونَهَا رُطَباً)) [٢].

واتە: لە زەیدی كوڕی ثابتەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ((مۆڵەتی داوە بە خاوەن عەرییە كە بیفرۆشێت بە خەملاندن)).

---

١ البخاري (٢١٨٨) مسلم (١٥٣٩/٦٠)

٢ مسلم (١٥٣٩/٦١)

وه له‌ده‌ربڕینێكی تردا له‌لای ئیمامی موسلیم: زه‌یدی كوڕی ثابت (ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ((مۆڵه‌تی دا كه‌ وشكه‌كه‌ بخه‌مڵێنن به‌ته‌ڕ، بۆ ئه‌وه‌ی به‌ته‌ڕی بیخۆن)).

٢٦٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، أَوْ دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ)) [1].

واته: له ئه‌بوهوره‌یره‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ((مۆڵه‌تی داوه له مامه‌ڵه‌و ئاڵو گۆڕی عه‌رایا كه پێنج ویسق بێت یاخود كه‌متر)).

ئاگاداری: ئه‌گه‌ر له پێنج ویسق زیاتر بێت ئه‌وا ده‌بێت به سوو حه‌رام ده‌بێت.

٢٦٣ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ الله صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ بَاعَ نَخْلاً قَدْ أُبِّرَتْ فَثَمَرُهَا لِلْبَائِعِ، إلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ)) [2].

وَلِمُسْلِمٍ ((وَمَنْ ابْتَاعَ عَبْداً فَمَالُهُ لِلَّذِي بَاعَهُ إلاَّ أَنْ يُشْتَرَطَ الْمُبْتَاعُ)) [3].

واته: له عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ره‌وه (ڕه‌زای خوایان لێبێ) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی ((هه‌ر كه‌سێك بێستانێك خورما فرۆشت (واته به داره‌كانه‌وه) كه تۆو كرابوو ئه‌وا به‌روبوومه‌كه‌ی بۆ فرۆشیاره، مه‌گه‌ر كڕیار به‌مه‌رجی دانابێت)).

وه له‌ده‌ربڕینێكی تردا له‌لای ئیمامی موسلیم: عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ر (ڕه‌زای خوایان لێبێ) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی ((هه‌ر كه‌سێك به‌نده‌یه‌كی فرۆشت ئه‌وا ماڵه‌كه‌ی بۆ ئه‌و كه‌سه‌یه كه فرۆشتویه‌تی مه‌گه‌ر كڕیار به‌مه‌رجی گرتبێت)).

---

١ البخاري (٢١٩٠) مسلم (١٥٤١)

٢ البخاري (٢٢٠٤) مسلم (١٥٤٣)

٣ مسلم (١٥٤٣/٨٠)

## بابُ نَهي المشتري عن بيع الطعام قبل قبضه

## بەشی ڕێگری کردن لەکڕیار لە فرۆشتنی خۆراك پێش وەرگرتنی

٢٦٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ))[١]. وَفِي لَفْظٍ: ((حَتَّى يَقْبِضَهُ))[٢].

وَعَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ مِثْلُهُ [٣].

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((هەر کەسێك خۆراکێکی کڕی ئەوا با نەیفرۆشێت هەتا وەری نەگرێت)).

وە لەدەربڕینێکی تردا: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((هەتا نەیەتە دەستێوە)).

وە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) بەهەمان شێوە.

---

١ البخاري (٢٢٠٤) مسلم (١٥٢٦)

٢ مسلم (١٥٢٦/٣٦)

٣ مسلم (١٥٢٥)

## بابُ تحريم بيع الخبائث - بەشی قەدەغەكردنی فرۆشتنی شتە پیسەكان

٢٦٥ – عَنْ جَابِرِ رضي الله عنه أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ عَامَ الْفَتْحِ: ((إنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ. فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ؟ فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ. وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ. فَقَالَ: لا، هُوَ حَرَامٌ. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم عِنْدَ ذَلِكَ: قَاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ. إنَّ اللهَ لَمَّا حَرَّمَ شُحُومَهَا، جَمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ))[1].

جَمَلُوهُ: أَذَابُوهُ.

واتە: لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) كە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) فەرموویەتی لە ساڵی ئازادكردنی مەككەدا ((بێگومان خودا و پێغەمبەرەكەی مامەڵەی مەیی و مردارەوەبوو بەراز و بتیان حەرام كردوە، وترا، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕات چییە بەرامبەر بەز و پیوی مردارەوەبوو، چونكە دیواری كەشتی پێ سواغ دەدرێت، وە پێستەی پێ چەور دەكرێت، وە خەڵكی بۆ چرا بەكاری دەهێنن و ڕۆژی پێدەكەنەوە؟ فەرمووی، نەخێر ئەوە حەرامە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوێدا فەرمووی، خودا جولەكەكان بكوژێت و لە سۆزی خۆی دەریان بكات، كاتێك كە خوای گەورە بەز و پیوی لێ حەرام كردن توانیانەوە، پاشان دەیانفرۆشت و پارەكەیان دەخوارد)).

جَمَلُوهُ: واتە: دەیان توان

---

١ البخاري (٢٢٣٦) مسلم (١٥٨١)

## بابُ السَّلَمِ - بەشی سەلەم

سەلەم: واتە فرۆشتنی ماڵێك كە لەبەر چاو نەبێت بەڵام وەصف بكرێت وە پارەكەی هەر لەو دانیشتنەدا وەربگیرێت. بۆ نموونە: كەسێكی خاوەن پارە بە كەسێكی خاوەن حەیوان بڵێت ئەوا من ئەم دوو هەزارەم دا بە تۆ بەسەلەمی پێنج بەرخ لە فلاَنە ڕۆژ و لە فلاَنە شوێن بمدەیتێ ئەویش وەری بگرێت و ڕازی ببێت.

٢٦٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم الْمَدِينَةَ، وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي الثِّمَارِ: السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ وَالثَّلاثَ. فَقَالَ: مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ)) [١].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ مەدینە خەڵكی سەلەمیان دەكرد لە بەروبومدا بۆ ساڵێك وە بۆ دوو ساڵ وە بۆ سێ ساڵ. فەرمووی، هەر كەسێك سەلەم لە شتێكدا دەكات، ئەوا با سەلەم بكات لە پێوانەیەكی دیاردا، وە كێشێكی دیاریدا وە بۆ ماوەیەكی دیاریكراو))

١ البخاري (٢٢٣٩) (٢٢٤٠) (٢٢٥٣) مسلم (١٦٠٤)

## بابُ الشُّروطِ في البيعِ - بەشی مەرج دانان لە مامەڵەدا

٢٦٧ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((جَاءَتْنِي بَرِيرَةُ: فَقَالَتْ: كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَّةٌ. فَأَعِينِينِي. فَقُلْتُ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ، وَوَلاؤُكِ لِي فَعَلْتُ. فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا، فَقَالَتْ: لَهُمْ. فَأَبَوْا عَلَيْهَا. فَجَاءَتْ مِنْ عِنْدِهِمْ وَرَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم جَالِسٌ. فَقَالَتْ: إِنِّي عَرَضْتُ ذَلِكَ عَلَيهم، فَأَبَوْا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْوَلاءُ. فَأَخْبَرَتْ عَائِشَةُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم. فَقَالَ: خُذِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلاءَ. فَإِنَّمَا الْوَلاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ. فَفَعَلَتْ عَائِشَةُ. ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي النَّاسِ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ. ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ. فَمَا بَالُ رِجَالٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ؟مَا كَانَ مِنْ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ. قَضَاءُ اللهِ أَحَقُّ. وَشَرْطُ اللهِ أَوْثَقُ. وَإِنَّمَا الْوَلاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ))[1].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: بەریرە (ڕەزای خوای لێبێ) هات بۆلام وتی خۆم کڕیوەتەوە لە گەورەکەم بە نۆ ئوقییە (هەر ئوقییەك چل درهەم دەکات واتە ٣٦٠ درهەم) بۆ هەر ساڵێك ئوقییەك یارمەتیم بدە. منیش پێم وت، ئەگەر گەورەکەت پێی خۆشە ئەوا من پارەکەیان دەدەمێ وە سەرپەرشتیاریت بۆ من بێت، جا بەریرە چوو بۆلای گەرەکەیو پێی وتن ئەوانیش ڕەفزیان کردوو ڕازی نەبوون، ئینجا بەریرە هاتەوە لەلایان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو، وتی، ئەوەم پێ وتن بەلآم ئەوان ڕازی نەبوو جگە لەوەی سەرپەرشتیاریەکە بۆ ئەوان بێت، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) هەواڵی دا بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وەری گرەو سەرپەرشیارێکە بەمەرج دانێ بۆ ئەوان، چونکە سەرپەرشتیاری بۆ ئەو کەسەیە کە بەندە ئازاد دەکات. جا عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) کردی، پاشان پێغەمبەری خوا

---

١ البخاري (٢١٦٨) (٨/١٥٠٤)

(ﷺ) هەستا لەناو خەڵکەکەدا سوپاس و ستایشی خوای کردوو پاشان فەرمووی: ئایە حاڵ و فکری ئەو پیاوانە چۆنە کۆمەڵە مەرجێك دادەنێن کە لە کتێبی خوای گەورەدا نییە؟ (واتە لە قورئاندا نییە) هەرچی مەرجێك کە لە کتێبی خوای گەورەدا نەبێت ئەوە بەتاڵە ئەگەر سەد مەرجیش بێت، حوکم و بڕیاری خوا ڕاسترە، وە مەرجی خوای گەورە پتەوترە بەهێزترو چەسپاو ترە، وە ئەو ماڵەی لەدوای مردنی ئەو بەندەیەی ئازاد کراوە لایەن کەسێکەوە بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی کردووە)).

٢٦٨ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما ((أَنَّهُ كَانَ يَسِيرُ عَلَى جَمَلٍ فَأَعْيَا، فَأَرَادَ أَنْ يُسَيِّبَهُ. قَالَ: فَلَحِقَنِي النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فَدَعَا لِي، وَضَرَبَهُ. فَسَارَ سَيْرًا لَمْ يَسِرْ مِثْلَهُ قَطُّ. ثُمَّ قَالَ: بِعْنِيهِ بِأُوقِيَّةٍ. قُلْتُ: لا. ثُمَّ قَالَ: بِعْنِيهِ. فَبِعْتُهُ بِأُوقِيَّةٍ. وَاسْتَثْنَيْتُ حُمْلانَهُ إِلَى أَهْلِي. فَلَمَّا بَلَغْتُ: أَتَيْتُهُ بِالْجَمَلِ. فَنَقَدَنِي ثَمَنَهُ. ثُمَّ رَجَعْتُ. فَأَرْسَلَ فِي أَثَرِي. فَقَالَ: أَتُرَانِي مَاكَسْتُكَ لآخُذَ جَمَلَكَ؟ خُذْ جَمَلَكَ وَدَرَاهِمَكَ. فَهُوَ لَكَ)) [١].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) ((کە بەسەر وشترێکەوە دەڕۆشت هیلاك بوو بوو نەیدەتوانی بڕوات، ویستی بەرەڵای بکات، دەڵێ: پێغەمبەرم (ﷺ) پێگەیشت دوعای بۆ کردموئینجا لە وشترەکەی دا، ڕۆشتنێك دەڕۆی هەرگیز وا نەڕۆشتبوو، پاشان فەرمووی، پێم بفرۆشە بە ئوقییەك، وتم نایفرۆشم، پاشان فەرمووی، پێم بفرۆشە منیش پێم فرۆشت بە ئوقییەك، وە بەو مەرجەی سواری ببم تا ماڵەوە، کاتێك گەشتمە ماڵەوە، وشترەکەم بۆ هێنا، ئەویش پارەکەی داپێم، پاشان گەڕامەوە، یەکێکی نارد بە شوێنمدا، فەرمووی: گومانت وا پێبردم کە مامەڵم لەگەڵدا کردی بۆ ئەوەی وشترەکەت لێسەنم؟ وشترەکەت و درهەمەکانت بەرە ئەوە بۆ تۆیە)).

---

١ البخاري (٢٧١٨) مسلم (١٠٩/١٤١٣)

٢٦٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((نَهَى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ. وَلا تَنَاجَشُوا وَلا يَبِعِ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ. وَلا يَخْطُبْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ. وَلا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلاقَ أُخْتِهَا لِتُكْفِئَ مَا فِي إِنَائِهَا)) [1].

واته: له ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کرد کە شار نشینێك شت و مەك بۆ گوند نشینێك بفرۆشێت، وە فەرمووی زەمکاری مەکەن، وە با کەس مامەڵە لەسەر مامەڵەی براکەی نەکات، وە با داخوازی لەسەر داخوازی براکەی نەکات (واتە نەچێتە داوای ئافرەتێك کە کەسێکی تر چۆتە داوای هەتا دوای وەلاّم دانەوەی ئەو) وە با ئافرەت داوای تەلاّقی خوشکەکەی نەکات بۆ ئەوەی چی لە قاپەکەیایەتی قلّپی بکاتەوە (واتە با داوای تەلاّقی هەوێکەی نەکات چونکە خوشك لێرەدا مەبەست پێی خوشکی دینییە بۆ ئەوەی لە ناز و نیعمەتی مێردی بکات))).

١ البخاري (٢١٤٠) (٢٧٢٣) مسلم (١٤١٣/٥٢)

## بابُ الرِّبا والصَّرْفِ - بەشی سوو و پارە گۆڕینەوە

٢٧٠ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((الذَّهَبُ بالذَّهَبِ رِبًا، إلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالفِضَّةُ بالفِضَّةِ رِبًا، إلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِباً، إلاَّ هَاءَ وَهَاءَ. وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِباً، إلاَّ هَاءَ وَهَاءَ)) [1].

واتە: لە عومەری کوڕی خەطابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((گۆڕینەوەی ئاڵتون بە ئاڵتون سووە ئەگەر دەست بە دەست نەبێت، وە زیویش بە زیو سووە ئەگەر دەست بە دەست نەبێت، وە گەنمیش بە گەنم سووە ئەگەر دەست بە دەست نەبێت، وە جۆش بە جۆ سووە ئەگەر دەست بە دەست نەبێت)).

تێبینی وەرگێڕ: دوو مەرجی تریش پێویستە هەبێت بۆ ئەوەی نەبێت بە سوو دەبێت لە یەك كات و شوێندا بێت.

٢٧١ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ. وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ. وَلا تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ. وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ. وَلا تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِباً بِنَاجِزٍ)) [2].

وَفِي لَفْظٍ ((إلاَّ يَداً بِيَدٍ)) [3].

وَفِي لَفْظٍ ((إلاَّ وَزْناً بِوَزْنٍ، مِثْلاً بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ)) [4].

---

١ البخاري (٢١٣٤) (٢١٧٠) (٢١٧٤) مسلم (١٥٨٦)

٢ البخاري (٢١٧٧) مسلم (١٥٨٤)

٣ مسلم (١٥٨٤/٧٦)

٤ مسلم (١٥٨٤/٧٧)

واته: له ئـهبو سـهعیدی خودریـهوه (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)فەرمووی ((ئاڵتون به ئاڵتون مەفرۆشن مەگەر وەك یەك بن، وه فەزڵی هەندێکیان مەدەن بەسەر هەندێکیاندا (واته هەر یەکه بڵێت ئـەوەی مـن چـاکتره لـەوەی تـۆ بۆیـه زیادەت لێدەسەنم) وه زیو به زیو مەفرۆشن مەگەر وەك یەك بن، وه فەزڵی هەنـدێکیان مـەدەن بەسـەر هەندێکیانـدا، وه کـڕین و فرۆشـتنی دوور و پـەنهان لەمانـه بـه ئامـاده مەکەن (چونکه دەست به دەستی تێدا نییه))).

وه لـەدەربڕینێکی تـردا هـاتووه: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی ((کـڕین و فرۆشتن مەکەن دەست به دەست نەبێت)).

وه لـەدەربڕینێکی تـردا هـاتووه: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)فەرموویـەتی ((کـڕین و فرۆشتن مەکەن ئەگەر کێشیان وەك یەك نەبێت وه هاو وێنەش نەبن)).

٢٧٢– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((جَاءَ بِلالٌ إلَى النَّبِـيِّ صـلَّى الله عليه وسلم بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : مِنْ أَيْنَ هَذَا؟ قَـالَ بِـلالٌ كَانَ عِنْدَنَا تَمْرٌ رَدِيءٌ، فَبِعْـتُ مِنْـهُ صَـاعَيْنِ بِصَـاعٍ لِـيَطْعَمَ النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليـه وسـلم فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم عِنْدَ ذَلِـكَ: أَوَّه، أَوَّه، عَـيْنُ الرِّبَـا، عَـيْنُ الرِّبَـا، لا تَفْعَـلْ وَلَكِنْ إذَا أَرَدْتَ أَنْ تَشْتَرِيَ فَبِعِ التَّمْرَ بِبَيْعٍ آخَرَ. ثُمَّ اشْتَرِ بِهِ)) [1].

واته: له ئەبو سەعیدی خودریەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((بیلال (ڕەزای خوای لێبـێ) هـات بـۆلای پێغەمبـەر (ﷺ)بـه خورمـای بەڕنییـەوه (جـۆره خورمایەکـه تـا ئێستاش ماوه زەردەو مەیلەو درێژه) پێغەمبەر (ﷺ)پێـی فـەرموو: ئەمـەت لـه کـوێ بوو؟ بیلالیش (ڕەزای خوای لێبێ) وتی خورمایەکی ناشرین و خراپمـان هـەبوو منـیش دوو مەنم لێ گۆڕییەوه به مەنێك، بۆ ئـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) لێـی بخـوات. پێغەمبـەر (ﷺ) لەوێدا فـەرمووی: ئـەی هـاوار، ئـەی هـاوار، خـودی سـوو ئەوەیـه، خـودی سـوو

١ البخاري (٢٣١٢) مسلم (١٥٩٤)

ئەوەیە، کاری وا مەکە، بەلاّم کاتێك ویستت خورمای جوان بکڕیت خورماکەی خۆت بفرۆشە بە شتێکی تر پاشان ئەوەی پێ بکڕە)).

٢٧٣ – عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ قَالَ: ((سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ وَزَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ، عَنْ الصَّرْفِ؟ فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا يَقُولُ: هَذَا خَيْرٌ مِنِّي. وَكِلاهُمَا يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالْوَرِقِ دَيْناً)) [1].

واتە: لە ئەبو مینهالەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ((پرسیارم کرد لە بەڕائی کوڕعازب و زەیدی کوڕی ئەرقەم (ڕەزای خوایان لێبێ) سەبارەت بە پارە گۆڕینەوە؟ هەر یەکێکیان دەیان وت، ئەو لە من چاکترە، وە هەردووکیان دەیان وت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەڵەی ئاڵتون بە زیوی قەدەغە کرد بەقەرز)).

تێبینی وەرگێڕ: پارە گۆڕینەوە ئەگەر جۆریان جیاواز بێت دروستە بەلاّم بەمەرجێك دەست بەدەست بێت نابێت بە قەرز بێت.

٢٧٤ – عَنْ أَبِي بَكْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم عَنْ الْفِضَّةِ بِالْفِضَّةِ، وَالذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، إلاَّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَأَمَرَنَا: أَنْ نَشْتَرِيَ الْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ، كَيْفَ شِئْنَا. وَنَشْتَرِيَ الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ كَيْفَ شِئْنَا. قَالَ: فَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَداً بِيَدٍ؟ فَقَالَ: هَكَذَا سَمِعْتُ)) [2].

واتە: لە ئەبو بەکرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەڵەی زیو بە زیوی قەدەغەی کرد، وە ئاڵتون بە ئاڵتونیش، مەگەر وەك یەك وابێت، وە فەرمانی پێکردین: کە زیو بە ئاڵتون بکڕین، چۆن بمانەوێت، وە ئاڵتونیش بە زیو بکڕین چۆن بمانەوێت، گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێ: پیاوێك پرسیاری کرد لە ئەبو بەکرە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی، دەست بە دەست بێت؟ وتی ئاوا بیستوومە (واتە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ))).

---

١ البخاري (٢١٨٠) (٢١٨١) مسلم (١٥٨٩/٨٧)

٢ البخاري (٢١٨٢) مسلم (١٥٩٠)

## بابُ الرَّهْنِ - بەشی بارمتە

٢٧٥ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم اشْتَرَى مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَاماً، وَرَهَنَهُ دِرْعاً مِنْ حَدِيدٍ))[1].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردەمەنی لە جولەکەیەك كڕی وە زرێپۆشەكەی كە لە ئاسن بوو بە بارمتە داینا)).

## بابُ الحَوَالة - بەشی گواستنەوە

حوالة: واتە ـ گواستنەوەی قەرز لەئەستۆی قەرز دارێك بۆ ئەستۆی قەرز دارێكی تر.

٢٧٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ. وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ))[2].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (( سستی و قەرز كوێری دەوڵەمەند ستەمە، وە كاتێك یەكێك لە ئێوە نێردرا بۆلای دەوڵەمەندێك بابچێت (واتە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەكەی))).

---

١ البخاري (٢٠٦٨) (٢٠٩٦) (٢٢٠٠) (٢٢٥١) (٢٢٥٢) (٢٣٨٦) (٢٥٠٩) (٢٥١٣) مسلم (١٦٠٣/١٢٥)

٢ البخاري (٢٢٨٧) (٢٢٨٨) (٢٤٠٠) مسلم (١٥٦٤)

## بابُ منْ وجد سِلعَته عند رجل قد أفلس
## بەشی کەسێك ماڵی خۆی لای کەسێك بینیەوە کەدووچاری مایە پوچ بوون هاتووە

٢٧٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلم أَوْ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم يَقُولُ –: ((مَنْ أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ – أَوْ إِنْسَانٍ – قَدْ أَفْلَسَ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ)) [1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی یاخود دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: ((هەر کەسێك گەشت بە ماڵەکەی لای پیاوێك یاخود کەسێك، کە بێپارە و مایە پوچ بووە ئەوا ئەو شایستە و مافدار ترە جگە لە خۆی)).

## بابُ الشفعة - بەشی هەڵگرتنەوەی ماڵ

٢٧٨ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ ((جَعَلَ – وَفِي لَفْظٍ: ((قَضَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلم بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ. فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ، وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ: فَلا شُفْعَةَ)) [2].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) گێڕای یاخود فەرمانی کرد بە هەڵگرتنەوەی هەموو ماڵێك کە دابەش نەکرێت، ئەگەر سنور دیاری کرا، وە ڕێگا دانرا، ئەوا هەڵگرتنەوە نییە)).

---

١ البخاري (٢٤٠٢) مسلم (١٥٥٩)

٢ البخاري (٢٢١٣) (٢٢١٤) (٢٢٥٧) (٢٤٩٥) (٢٤٩٦) (٦٩٧٦) مسلم (١٦٠٨/١٣٤)

## بابُ أحكام الجِوار - بەشی ئەدەب لەگەڵ دراوسێ

٢٧٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا يَمْنَعَنَّ جَارٌ جَارَهُ: أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ: ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ؟ وَاَللهِ لأَرْمِيَنَّ بِها بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ)).

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((با دراوسێ ڕێگری نەکات لە دراوسێکەی کە دارێك بخاتە سەر دیوارەکەی، پاشان ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی، چیە دەتان بینم پشتی لێ هەڵدەکەن، سوێند بە خوا لە نێوان شانیشتان بێت هەر دایدەنێم)).

ڕوونکردنەوە: ئەم فەرموودەیە ئاماژە بەوە دەدات ئەگەر دراوسێ ویستی دارە ڕایەك دابنێت ئەوا دراوسێ بۆی نییە ڕێگری لێبکات ئەگەر زەرەری لێنەدەکەوت کەواتە دراوسێ پێویستی بە دراوسێ بوو ئەویش ئەوکارەی بۆ بکرێت ئەوا واجبە لەسەری کە بۆی بکات.

## بابُ الغَصْبِ - بەشی زەوتکردن

٢٨٠ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ مِنْ الأَرْضِ: طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ)) [١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((هەر کەسێك بستێك زەوی بەستەم داگیر بکات ئەوا حەوت چین زەوی تەوق دەکرێتە ملی – دەکرێت بەناخی هەر حەوت چینی زەویدا)).

١ البخاري (٢٤٥٣) مسلم (١٦١٢)

## بابُ المساقاة والمزارعة - بەشی ئاودان وكشتوكاڵ كردن

٢٨١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ عَلَى شَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ تَمْرٍ أَوْ زَرْعٍ)) [١].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ دانیشتوانی خەیبەر پێك هات لەسەر نیوەی ئەو بەرهەمەی كە لێی دەردەچێت، لە خورماو كشتوكاڵ (واتە ئەوان باخەكان ئاو بدەن و پەروەردەی بكەن بەر بەنیوەیی))).

١ البخاري (٢٣٢٩) مسلم (١٥٥١)

## بابُ في جواز كراء الأرض بالشيء المعلوم والنهي عن الشروط الفاسدة
## بەشی دروستیەتی بەکرێدانی زەوی بەماڵێکی دیار وە ڕێگری لە دانانی مەرجە خراپەکان

٢٨٢ – عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: ((كُنَّا أَكْثَرَ الأَنْصَارِ حَقْلاً. وَكُنَّـا نَكْرِي الأَرْضَ، عَلَـى أَنَّ لَنَا هَذِهِ، وَلَهُمْ هَذِهِ وَرُبَّمَا أَخْرَجَتْ هَذِهِ، وَلَمْ تُخْرِجْ هَذِهِ فَنَهَانَا عَنْ ذَلِـكَ. فَأَمَّـا الْـوَرِقُ: فَلَمْ يَنْهَنَا)) [١].

واتە: لە ڕافعـی کـوڕی خەدیجـەوە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: ((ئێمـە لـە هـەموو ئەنصارییەکان زیاتر زەوی کشتوکاڵیمان هـەبوو، وە زەویمـان دەدا بـە کـرێ، لەسـەر ئەوەی ئەم بەشەی بۆ ئێمە، وە ئـەو بەشەشـی بـۆ ئـەوان (واتـە بـەر و بوومەکـە)، وە هەندێ جار بەشەکەی ئێمە بەرهەمی باشـی دەبـوو، ئـەوی تریـان نەیـدەبوو وە هـەنێ جاریش بە پێچەوانەوە، جا پێغەمبەر (ﷺ)ئەمەی لێ قەدەغە کردین، بەڵام بە کرێـدان بە زیو لێی قەدەغە نەکردین)).

ڕوونکردنەوە: بە کرێ دانی ئەو جۆرە زەویانە بە پارە یاخود بە زێڕ و زیو دروستو بێگرفتە، بەڵام بەو بەرهەمەی کە لەزەویەکە دەردەچێت حـەرام و نـا شـەرعیە چـونکە ئەوە مامەڵەیەکی نادیارە.

٢٨٣– وَلِمُسْلِمٍ عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: ((سَـأَلْتُ رَافِـعَ بْـنَ خَـدِيجٍ عَـنْ كِـرَاءِ الأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ؟ فَقَالَ: لا بَأْسَ بِهِ. إنَّمَا كَانَ النَّاسُ يُؤَاجِرُونَ عَلَى عَهْدِ النَّبِـيِّ صـلَّى الله عليه وسلم بِمَا عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ، وَأَقْبَالِ الْجَدَاوِلِ، وَأَشْيَاءَ مِنْ الـزَّرْعِ فَيَهْلِـكُ هَـذَا، وَيَـسْلَمُ

---

١ البخاري (٢٣٢٧) مسلم (١٥٤٧/١١٧)

هَذَا وَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَاءٌ إلاَّ هَذَا. فَلِذَلِكَ زَجَرَ عَنْهُ. فَأَمَّا شَيْءٌ مَعْلُومٌ مَضْمُونٌ: فَلا بَأْسَ بِهِ))[١].

الْمَاذِيَانَات: الأَنْهَارُ الْكِبَارُ وَالْجَدْوَلُ النَّهَرُ الصَّغِيرُ.

واته: له دهربڕینێكی تردا لهلای پێشهوا موسلیم: له حهنظهلهی كوڕی قهیسهوه (ڕهحمهتی خوای لێبێ) دهڵێ: ((پرسیارم كرد له ڕافعی كوڕی خهدیج (ڕهزای خوای لێبێ) سهبارهت به كرێدانی زهوی به ئاڵتون و زیو؟ وتی: بێ گرفته، خهڵكی له سهردهمی پێغهمبهردا (ﷺ)ئهو زهویانهیان دهدا به كرێ كه لهسهر ڕووباره گهوره و بچووكهكان بوو، به ههندێ كشتوكاڵ، جا جاری وا ههبوو ئهمهیان دهفهوتاو ئهوهیان دههاته بهرههم، وه هیچ به كرێدانێكیان نهبوو جگه لهم شێوازه نهبێت، ههر بۆیه پێغهمبهر (ﷺ)ڕێگری لێكرد، بهڵام به شتێكی دیار و زامن و دابینكراو هیچ گرفتێكی تیادا نییه)).

الْمَاذِيَانَاتُ: واته: ڕووباری گهوره.

الْجَدْوَلُ: واته: ڕووباری بچكۆله.

---

١ مسلم (١٥٤٧/١١٦)

## بابُ الوقف - بەشی وەقف

وقف: واته: دانان و وەستاندنی شتێکی به سوود که به ماڵێکی حەلاڵ کڕابێت بۆ سوود لێوەرگرتن.

٢٨٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((أَصَابَ عُمَرُ أَرْضاً بِخَيْبَرَ. فَأَتَى النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضاً بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ هُوَ أَنْفَسُ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُنِي بِهِ؟ فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا. قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ. غَيْرَ أَنَّهُ لا يُبَاعُ أَصْلُهَا، وَلا يُورَثُ وَلا يُوهَبُ قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ فِي الْفُقَرَاءِ، وَفِي الْقُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ. لا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا: أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقاً غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ)).

وَفِي لَفْظٍ: ((غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ)) [1].

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) زەویەکی لە خەیبەر بەرکەوت جا هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) پرسی پێبکات سەبارەت بەو زەوییە، وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من زەوییەکم بەر کەوتووە لە خەیبەر هەرگیز ماڵێکم بەر نەکەوتووە کە لەوە بەنرخ تر بێت لەلام فەرمانم بەچی پێدەکەی کە لێیبکەم؟ فەرمووی: ئەگەر دەتەوێت دەیهێڵیتەوە وە خێر و بەرهەمەکی دەکەیت بەخێر. عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) کردی بەخێر بەڵام زەوییەکە نابێت بفرۆشرێت و بە میرات ببرێت و ببەخشرێت، دەڵێ:عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) کردی بەخێر (واتە بەرهەمی ئەو زەوییە) بۆ هەژارەکان و خزمە نزیکەکانی و بەندەو ئەوانەی کە جیهاد دەکەن لە ڕێی خودادا و

---

[1] البخاري (٢٧٣٧) (٢٧٧٢) مسلم (١٦٣٢)

ڕێبوار و میوان، وه گوناهیش نییه لەسەر ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی دەکات کە لێی بخوات بە ئەندازەی پێویستی یاخود لێی بدات بە هاوڕێیەکی بەلاّم بە ئەندازەی پێویستی، وه لەدەربڕینێکی تردا هاتووه: کەوا لێی بەریَ هەروەك وابێت ماڵەکە هی خۆیەتی)).

## بابُ الهِبَة - بەشی بەخشین

٢٨٥ – عَنْ عُمَرَ– رضي الله عنه – قَالَ: ((حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَأَضَاعَهُ الَّذِي كَانَ عِنْدَهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيَهُ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَبِيعُهُ بِرُخْصٍ. فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم؟ فَقَالَ: لا تَشْتَرِهِ. وَلا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ. فَإِنَّ الْعَائِدَ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ)) [١].

واتە: لە عومەرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئەسپێکم بەخشی بە پیاوێك تا لە ڕێی خوادا جیهادی پێبکات، جا ئەویش کەم تەرخەمی کرد لەوەی کە لای بوو، ویستم لێی بکڕمەوە، وە گومانم برد کە بەهەرزان دەیفرۆشێت، پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەیکڕیتەوە ئەگەر بە یەك درهەمیش بداتێ وە لە خێرەکەشت پاشگەز مەبەرەوە، چونکە ئەوەی کە لە بەخشینەکەی بگەڕێتەوە وەك سەگ وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی)).

٢٨٦– عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ـ صلَّى الله عليه وسلم ـ قَالَ: ((الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ)) [٢].

وَ فِي لَفْظٍ ((فَإِنَّ الَّذِي يَعُودُ فِي صَدَقَتِهِ كَالْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ)) [٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو کەسەی کە لە بەخشینەکەی بگەڕێتەوە وەك ئەو کەسە وایە کە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی (واتە بۆ ئەوەی بیخوات)))

---

١ البخاري (٢٦٢٣) (١٤٩٠) مسلم (١٦٢٠)

٢ البخاري (٢٦٢١) مسلم (١٦٢٢/٧)

٣ مسلم (١٦٢٢/٨)

وه لەدەربڕینێکی تردا: پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: ((بێگومان ئەو کەسەی کە لە بەخشینەکەی دەگەڕێتەوە وەك سەگ وایە بڕشێتەوە پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی)).

## بابُ العدل بين الأولاد في العطية
## بەشی داد پەروەری لە بەخشیندا لە نێوان منداڵدا

٢٨٧ – عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ. فَقَالَتْ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لا أَرْضَى حَتَّى يَشْهَدَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم. فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلم لِيُشْهِدَ عَلَى صَدَقَتِي فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلم : أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ؟ قَالَ: لا. قَالَ: اتَّقُوا اللهَ وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلادِكُمْ، فَرَجَعَ أَبِي، فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ)) [١]. وَفِي لَفْظٍ: ((فَلا تُشْهِدْنِي إِذاً. فَإِنِّي لا أَشْهَدُ عَلَى جَوْرٍ)) [٢]. وَفِي لَفْظٍ: ((فَأَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْرِي)) [٣].

واته: له نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((باوکم هەندێك لە ماڵەکەی پێبەخشیم دایکم عەمرەی کچی ڕەواحە وتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ)نەزانێ، جا باوکم چوو بۆخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆ ئەوەی بیکات بە شایەت لەسەر ئەو خەڵاتەی کە پێشکەشی کردم، پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێی فەرموو ئایە ئەمەت لەگەڵ هەموو منداڵەکانی تردا کردووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: لە خوا بترسن وە دادگەر بن لە نێوان منداڵەکانتاندا، ئیتر باوکم گەڕایەوە وە لە خەڵاتەکەی پەشیمان بۆوە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا: پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێی فەرموو ((کەواتە من مەکە بە شایەت چونکە من شایەتی لەسەر ستەم نادەم)).

وە لەدەربڕینێکی تردا: پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێی فەرموو ((کەسێکی تر جگە لە من بکە بە شایەت)).

---

١ البخاري (٢٥٨٧) (١٦٢٣/١٣)

٢ مسلم (١٦٢٣/١٤)

٣ مسلم (١٦٢٣/١٧)

## بابُ هِبَةُ العُمري - بەشی بەخشین بەکەسێك تا لە ژیاندا بێت

٢٨٨ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: ((قَضَى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم بِالْعُمْرَى لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ)) [١].

وَفِي لَفْظٍ: ((مَنْ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ. فَإِنَّهَا لِلَّذِي أُعْطِيَهَا. لا تَرْجِعُ إِلَى الَّذِي أَعْطَاهَا لأَنَّهُ عَطَاءٌ وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ)) [٢].

وَقَالَ جَابِرٌ: ((إِنَّمَا الْعُمْرَى الَّتِي أَجَازَهَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم، أَنْ يَقُولَ: هِيَ لَكَ وَلِعَقِبِكَ، فَأَمَّا إِذَا قَالَ: هِيَ لَك مَا عِشْتَ: فَإِنَّهَا تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا)) [٣].

وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ: ((أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ أَمْوَالَكُمْ وَلا تُفْسِدُوهَا، فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ عُمْرَى فَهِيَ لِلَّذِي أُعْمِرَهَا: حَيّاً، وَمَيِّتاً، وَلِعَقِبِهِ)) [٤].

ئەم بەشە باسی عومرا دەکات: عومرا: واتە کەسێك بە کەسێکی تر بڵێت ئەم خانووەی من یاخود ئەم دوکانەی من یاخود ئەم باخەی من هتد، پێشکەش بە تۆ بێت ئەوەندەی من لە ژیاندا بم یاخود ئەوەندەی تۆ لە ژیاندا بیت، جا ئەم جۆرە بەخشینە لە سەردەمی پێش ئیسلام و نەفامیدا زۆر بوو ئێستا دەتوانین بڵێین هەر نەماوە یاخود زۆر زۆر کەمە.

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بە عومرا لە بۆ ئەو کەسەی پێی بەخشراوە)).

---

١ البخاري (٢٦٢٥) مسلم (١٦٢٥/٢٥)

٢ مسلم (١٦٢٥)

٣ مسلم (١٦٢٥/٢٣)

٤ مسلم (١٦٢٥/٢٦)

وه لەدەربڕینێکی تردا: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((هەر کەسێك خەڵاتێکی وای پێ بەخشرا ئەوە بۆ خۆی و نەوەکانیشێتی ئەوە دەبێتە موڵکی ئەو کەسەی کە پێی بەخشراوە ناگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە بەخشیوێتی چونکە ئەوە خەڵاتێکە بەشی میرات گرانی تێکەوتووە)).

جابر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئەو عومرایەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)ڕێگەی پێیاوە ئەمەیە کە بڵێ: ئەمە بۆ تۆ و نەوەکانیشت، بەڵام کاتێك وتی: ئەمە بۆ تۆ هەتا لە ژیاندا بیت، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی)).

وه لەدەربڕینێکی کەشدا لەلای پێشەوا موسلیم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((دەست بەسەر ماڵ و سامانەکانتانەوە بگرن و لە ناوی مەبەن، چونکە هەرکەسێك ماڵێك ببەخشێت بە کەسێك ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی خەڵات کردووە بە زیندووی و مردوویش وە بۆ نەوەکانیشی)).

## بابُ اللُّقطَةِ - بەشی هەڵگرتنەوەی وون بوو

٢٨٩ – عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((سُئِلَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلم عَنْ لُقَطَةِ الذَّهَبِ، أَوْ الْوَرِقِ؟ فَقَالَ: اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً فَإِنْ لَمْ تُعْرَفْ فَاسْتَنْفِقْهَا وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْماً مِنْ الدَّهْرِ: فَأَدِّهَا إِلَيْهِ، وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الإِبِلِ؟ فَقَالَ: مَا لَك وَلَهَا؟ دَعْهَا فَإِنَّ مَعَهَا حِذَاءَهَا وَسِقَاءَهَا، تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا. وَسَأَلَهُ عَنْ الشَّاةِ؟ فَقَالَ: خُذْهَا فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيك، أَوْ لِلذِّئْبِ)) [١].

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پرسیا کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە زێڕ یاخود زیوی دۆزراوە فەرمووی: بزانە بەچی بەستراوە، وە لەناو چیدایە، پاشان ساڵێك بانگەوازی بکە، ئەگەر کەس نەبوو بە خاوەنی ئەوا بیکە بەخێر یاخود بۆ خۆت بەکاری بێنە، وە با وەك ئامانەتێك بمێنێتەوە لەلات، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان خاوەنەکەی هات ئەوا دەیدەیتەوە. وە پرسیاری لێکرد سەبارەت بە وشتری وون بوو: فەرمووی: چیت داوە لەو؟ وازی لێبهێنە چونکە ئەو خوی لە گەڵدایە وە ئاویشی پێیە (واتە پێی وشتر بە شێوەیەکە دەتوانێت ماوەیەکی زۆر پێی بڕوات وە ئاویش هەڵدەگرێت بۆ کاتی پێویستی و بێ ئاوی) بۆ خۆی ئاو دەخوات وە داریش دەخوات، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە. وە پرسیاری لێکرد سەبارەت بە مەڕ وبزنی وون بوو: فەرمووی: بیگرە ئەوە بۆ تۆیە یاخود بۆ براکەتە یاخود بۆ گورگە (واتە ئەگەر تۆ نەیگریت کەسێکی تر دەیگرێت یاخود گورگ دەیخوات))).

---

١ البخاري (٩١) (٢٣٧٢) (٢٤٢٧) (٢٤٢٨) (٢٤٢٩) (٢٤٣٦) (٢٤٣٨) (٦١١٢) مسلم (١٧٢٢/٥)

## بابُ الوصايا - بەشی وەسێت کردن

٢٩٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَهُ شَيْءٌ يُوصِي بِهِ، يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ)) [١]. زَادَ مُسْلِمٌ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: ((فَوَ اللهِ مَا مَرَّتْ عَلَيَّ لَيْلَةٌ مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ ذَلِكَ، إلاَّ وَعِنْدِي وَصِيَّتِي)) [٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((مافی هیچ موسوڵمانێك نییە کە شتێکی هەبێت پێویستی بە وەسێت بێت شەوێك یاخود دوو شەو بمێنێتەوە مەگەر وەسێتەکەی نووسرابێت لەلای)).

وە پێشەوا موسلیم ئەمەشی زیاد کردووە:کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) وتویەتی: سوێند بەخوا هیچ شەوێکم بەسەردا نەڕۆشتووە لەو کاتەوەی کە گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە فەرموویەتی جگە لەوەی وەسێتەکەم لەلا نەبوو بێت)).

٢٩١ – عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((جَاءَنِي رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَعُودُنِي عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ بَلَغَ بِي مِنْ الْوَجَعِ مَا تَرَى، وَأَنَا ذُو مَالٍ، وَلا يَرِثُنِي إلاَّ ابْنَةٌ أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: لا، قُلْتُ: فَالشَّطْرُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لا، قُلْتُ: فَالثُّلُثُ قَالَ: الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ ورَثَتَكَ أغنياءَ خيرٌ منْ أنْ تَذرَهمْ عالَةً يَتَكَفَّفونَ النَّاسَ، وإنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللهِ إلاَّ أُجِرْتَ بِهَا، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ. قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أُخَلَّفُ بَعْدَ

---

١ البخاري (٢٧٣٨) مسلم (١٦٢٧)

٢ مسلم (١٦٢٧/٤)

أصْحَابِي؟ قَالَ: إنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ فَتَعْمَلَ عَمَلاً تَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللهِ إلاَّ ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً وَرِفْعَةً، وَلَعَلَّكَ أنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أقْوَامٌ، وَيُضَرُّ بِكَ آخَرُونَ. اللَّهُمَّ أمْضِ لأصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلا تَرُدَّهُمْ عَلَى أعْقَابِهِمْ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ بْنُ خَوْلَةَ يَرْثِي لَهُ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم أنْ مَاتَ بِمَكَّةَ)) [١].

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ:: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـەردانی کـردم سـاڵی حـەجی ماڵئاوایـدا زۆر نـەخۆش بـووم، وتم ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆت دەبینیت چەندە نەخۆشـم وە مـن خـاوەنی مـاڵێکی زۆرم کەسیش نییە میراتم لێبگرێت جگـە لـە کـچێك نـەبێت، ئایـە دەتـوانم دوو لەسـەر سـێی ماڵەکـەم بکـەم بـەخێر؟ (واتـە بیکـات بـە سـێ بەشـەوە دوو بەشـیان بکـات بـە خێـر) فەرمووی: نەخێر، وتم ئەی نیوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: نەخێر، وتم ئـەی سێ یەك (واتە بیکات بە سێ بەشەوە یەك بەشیان بکات بە خێر) فەرمووی: سـێ یـەك سێ یەکیش زۆرە تۆ ئەگەر منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێبێڵیت باشـترە لـەوەی بـە هەژاری بەجێیان بێڵیت دەسـت لەخـەڵك پـان بکەنـەوە وە تـۆ هـیچ خێـر و چاکەیەك ناکەیت مەبەستت ڕەزامەندی خوا بێت مەگەر خوای گـەورە پاداشـتت دەداتـەوە هـەتا ئەوەشـــی دەیکـــەیت بـــە دەمـــی خێزانەکەتـــەوە، دەڵـــێ: وتم ئـــەی پێغەمبـــەری خوا(ﷺ)دوادەکەوم لە هاوەڵەکانم؟ (واتە لە مەککە دەمرم پێی خۆش بوو لە مەدینـە بمرێت چونکە کۆچی بۆ کردبـوو) فـەرمووی: نـەخێر تـۆ بـەجێنامێنیت وە هـەر کارێـك ئـەنجام بـدەیت مەبەسـتت پێـی ڕەزامەنـدی خـوا بێـت ئـەوا پلـە و پایـەت پێـی بـەرز دەبێتـەوە، وە نزیکیـشە کـە تـۆ جێبمێنیـت تـاوەکو سـوودت هـەبێت بـۆ گـەلانێك وە زیانیشت هەبێت بۆ گەلانێکی تر، پەروەردگارا کۆچی هاوەڵانم بـە ئـەنجام بگەیەنـە وە بەرەودوا نەیان گێڕیتەوە (واتە پاشگەز نەبنەوە لـە دینەکـەیان) بـەڵام دامـاو سـەعدی

١ البخاري (١٢٩٥) (٢٧٢٤) (٣٩٣٦) (٤٤٠٩) (٥٦٦٨) (٦٣٧٣) مسلم (١٦٢٨)

كورِى خەولەيە، پێغەمبەرى خوا (ﷺ)بۆى غەمبار بوو چونكە لە مەككە وەفاتى كرد)).

٢٩٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((لَوْ أنَّ النَّاسَ غَضُّوا مِنْ الثُّلُثِ إلَى الرُّبْعِ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ))[1].

واتە: لە عەبدوڵلاى كورِى عەباسەوە (رِەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((خۆزگە خەڵكى لە سێ يەكەوە دايان بەزاندايە بۆ چوار يەك چونكە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرمووى: سێيەك سێيەكيش زۆرە)).

---

١ البخاري (٢٧٤٣) مسلم (١٦٢٩)

## بابُ الفَرائِضِ - بەشى ميرات

٢٩٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ))[1].

وَفِي رِوَايَةٍ: ((اقْسِمُوا الْمَالَ بَيْنَ أَهْلِ الْفَرَائِضِ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ فَمَا تَرَكَتِ الْفَرَائِضُ: فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ))[2].

واته: له عەبدوڵلاّى كوڕى عەباسەوە (ڕەزاى خوايان لێبێ) ئەويش له پێغەمبەرەوە (ﷺ) كە فەرموويەتى: ((ميرات بدەن بە ميرات گرەكان ئەوەى دەمێنێتەوە بۆ نزيكترين نێرينە دەبێت)).

وە لەدەربڕينێكى تردا هاتووە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى: ((ماڵ بەشكەن لە نێوان ميرات گراندا بە گوێرەى كتێبى خواى گەورە (واتە قورئان) ئەوەى لە دواى خاوەن ميراتەكان جێدەمێنێت بۆ نزيكترين نێرينە دەبێت)).

٢٩٤ – عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((قُلْتُ يَا رَسُولَ الله، أَتَنْزِلُ غَداً فِي دَارِكَ بِمَكَّةَ؟ فَقَالَ: وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مِنْ رِبَاعٍ أَوْ دُورٍ؟ ثُمَّ قَالَ: لا يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ وَلا الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ))[3].

واتە: لە ئوسامەى كوڕى زەيدەوە (ڕەزاى خوايان لێبێ) دەڵێ: ((وتم ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) بەيانى دادەبەزيتە ماڵەكەت لە مەككە؟ فەرمووى: جا عەقيل

---

١ البخاري (٦٧٣٢) (٦٧٣٥) (٦٧٣٧) (٦٧٤٦) مسلم (١٦١٥)

٢ مسلم (٤/١٦١٥)

٣ البخاري (١٥٨٨) (٣٠٥٨) (٤٢٨٢) (٦٧٦٤) مسلم (١٣٥١)

هيچ خانوو ماڵی بۆ بەجێهێشتووین؟ پاشان فەرمووی: نە موسوڵمان میرات لە بێباوەڕ دەبات نە بێباوەڕیش میرات لە موسوڵمان دەبات)).

ڕوونکردنەوە: ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوایان لێبێ) لە ئازاد کردنی مەککە دا ئەم پرسیارەی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد پێغەمبەریش (ﷺ) وەلآمی دایەوە بۆی ڕوونکردەوە کە موسوڵمان میرات لە بێباوەڕ نابات بێباوەڕیش میرات لە موسوڵمان نابات عەقیل کوڕی ئەبو طالیب بوو کاتێك کە ئەبو طالیب مرد چوار کوڕی هەبوو (طالیب و عەقیل و جەعفەر و عەلی) جەعفەر و عەلی (ڕەزای خوایان لێبێ) موسوڵمان بوون پێش مردنی کەواتە میراتی لێنابەن وە طالیب و عەقیلیش لەسەر دینی خۆیان مانەوە میراتیان برد لێی وە طالیبیش لە ڕۆژی بەدردا لەناو چوو هەموو ماڵەکە بۆ عەقیل مایەوە ئەویش فرۆشتی.

٢٩٥- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلاءِ وَعَنْ هِبَتِهِ)) [١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) فرۆشتن و بەخشینی ـ وَلاءِ ـ قەدەغەکرد)).

وَلاءِ: واتە ئازاد کردنی بەندەیەك ئەگەر ئەو بەندەیە کەسی نەبوو ئەوا میراتەکەی بۆ ئازاد کەرەکەیەتی بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فرۆشتن و بەخشینەکەی قەدەغەکرد چونکە وەك خزم و کەسی لێدێت وە خزم و کەسیش نافرۆشرێت.

---

١ البخاري (٢٥٣٥) (٦٧٥٦) مسلم (١٥٠٦)

٢٩٦ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَتْ فِي بَرِيرَةَ ثَلاثُ سُنَنٍ: خُيِّرَتْ عَلَى زَوْجِهَا حِينَ عَتَقَتْ، وَأُهْدِيَ لَهَا لَحْمٌ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَالْبُرْمَةُ عَلَى النَّارِ، فَدَعَا بِطَعَامٍ فَأُتِيَ بِخُبْزٍ وَأُدْمٍ مِنْ أُدْمِ الْبَيْتِ فَقَالَ: أَلَمْ أَرَ الْبُرْمَةَ عَلَى النَّارِ فِيهَا لَحْمٌ؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ. ذَلِكَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ فَكَرِهْنَا أَنْ نُطْعِمَكَ مِنْهُ فَقَالَ: هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا مِنْهَا هَدِيَّةٌ، وَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فِيهَا: إِنَّمَا الْوَلاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ)) [١].

واته: له دايكمان عائيشهوه (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((بەهۆى بەريرەوە سێ حوكمى شەرعى جێگير بوو، سەر پشك كرا لەسەر مێردەكەى كاتێك كە ئازاد بوو (چونكە مێردەكەشى بەندە بوو بۆيە سەر پشك كرا كەلاى بمێنێتەوە ياخود لێى جيا ببێتەوە بۆيە لێى جيا بۆوە چونكە ئەم هاوكوفى ئەو نەبوو) وە گۆشتيان بە ديارى بۆ هێنابوو لەو كاتەدا پێغەمبەرى خواش (ﷺ)هاتەوە كە گۆشتەكە لە سەر ئاگر بوو، ئينجا پێغەمبەر (ﷺ)داواى خواردنى كرد نان و پێخۆريان بۆ برد لە پێخۆرى ماڵ (پێخۆر بەو خواردنە دەوترێت كە بەردەوام لە ماڵدا هەيە لەگەڵ ناندا دەخورێت وەك ماست و ڕۆن كەشك و هتد) فەرمووى: ئايە من مەنجەڵەكەم نەدى لەسەر ئاگرەكە گۆشتى تێدا بوو؟ وتيان بەڵێ ئەى پێغەمبەرى خوا(ﷺ) ئەوە گۆشتێك بوو بە ديارى هێنرابوو بۆ بەريرە پێمان ناخۆش بوو لەوە خواردن بە تۆ بەين (چونكە پێغەمبەرى خوا (ﷺ)لە خێرى نەدەخوارد) جا فەرمووى: ئەوە بۆ ئەو خێرە، وە لەويشەوە بۆ ئێمە دياريیە. وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: ـ وَلاءِ ـ بۆ ئەو كەسەيە كە بەندە ئازاد دەكات)).

---

١ البخاري (٥٠٩٧) (٢٥٧٩) (٥٤٣٠) مسلم (١٥٠٤/١٤)

# كتابُ النِّكاحِ - پەرتووكی ژن مارە كردن

٢٩٧- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ الْبَاءَة فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)) [١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((ئەی کۆمەڵەی گەنجان هەر کەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی ئەوا با ژن بێنێت، چونکە چاکترین هۆکارە بۆ چاو پارێزی و داوێن پارێزی، وە هەر کەسێك نەیتوانی ئەوا با بەڕۆژو ببێت چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان)).

٢٩٨ - عَنْ أنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه –: ((أنَّ نَفَراً مِنْ أصْحَابِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم سَألُوا أزْوَاجَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ عَمَلِه فِي السِّرِّ؟ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لا أتَزَوَّجُ النِّسَاءَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لا آكُلُ اللَّحْمَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لا أنَامُ عَلَى فِرَاشٍ. فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم فَحَمِدَ اللَّهَ وَأثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: مَا بَالُ أقْوَامٍ قَالُوا كَذَا؟ وَلَكِنِّي أصَلِّي وَأنَامُ وَأصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأتَزَوَّجُ النِّسَاءَ فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي)) [٢].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)پرسیاریان کرد لە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەی کارە نهێنیەکانیەوە، جا یەکێکیان وتی: ئیتر من ژن ناهێنم، یەکێکی تریان وتی: ئیتر من گۆشت ناخۆم، یەکێکی تریان وتی: ئیتر من لەسەر جێگە ناخەوم. ئەمە گەشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) سوپاس و ستایشی خوای کردوو پاشان فەرمووی: ئایە ئەوە چیە

---

١ البخاري (١٩٠٥) (٥٠٦٥) (٥٠٦٦) مسلم (١٤٠٠)

٢ البخاري (٥٠٦٣) مسلم (١٤٠١)

خەڵكانێك كە واو وايان وتووە؟ بەلاّم من نوێژيش دەكەم و دەشخەوم، بەڕۆژوش دەبمو بەڕۆژوش نابم، ژنيش دەهێنم وە هەركەسێك لە سونەتی من لابدات ئەوە لە من نييە)).

٢٩٩– عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ – رضي الله عنه – قَـالَ: ((رَدَّ رَسُـولُ اللهِ صـلَّى الله عليه وسلم عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لاخْتَصَيْنَا)) [1].

واتە: لە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری كرد لە عوسمانی كوڕی مەظعون (ڕەزای خوای لێبێ) كە واز لە ژن هێنان بێنێت خۆ ئەگەر ڕێگەی پێبدایە ئێمەش خۆمان دەخەساند)).

---

١ البخاري (٥٠٧٣) مسلم (١٤٠٢)

## بابُ المحرمات في النّكاح - بەشی ئەو ئافرەتانەی کە حەرامن

٣٠٠ – عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: ((يَا رَسُولَ اللهِ، انْكِحْ أُخْتِي ابْنَةَ أَبِي سُفْيَانَ قَالَ: أَوَتُحِبِّينَ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَارَكَنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي: فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : إِنَّ ذَلِكَ لا يَحِلُّ لِي. قَالَتْ إِنَّا نُحَدَّثُ أَنَّك تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ؟: قُلْتُ: نَعَمْ فَقَالَ: إِنَّهَا لَوْ لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي، مَا حَلَّتْ لِي إِنَّهَا لابْنَةُ أَخِي مِنْ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ فَلا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلا أَخَوَاتِكُنَّ)) [1].

قَالَ عُرْوَةُ وَثُوَيْبَةُ: مَوْلاةٌ لأَبِي لَهَبٍ كَانَ أَبُو لَهَبٍ أَعْتَقَهَا، فَأَرْضَعَتِ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم فَلَمَّا مَاتَ أَبُو لَهَبٍ رَآهُ بَعْضُ أَهْلِهِ بِشَرِّ حِيبَةٍ فَقَالَ لَهُ: مَاذَا لَقِيتَ؟ قَالَ أَبُو لَهَبٍ لَمْ أَلْقَ بَعْدَكُمْ خَيْراً، غَيْرَ أَنِّي سُقِيتُ فِي هَذِهِ بِعَتَاقَتِي ثُوَيْبَةَ)).

الحِيبَةُ: بكسر الحاء: الحَالَةُ.

واتە: لە دایکمان ئوم و حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) کە وتویەتی ((ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوشکەکەم مارە بکە کە کچی ئەبو سوفیانەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) فەرمووی: ئەوت پێخۆشە؟ وتم، بەڵێ خۆ من بە تەنیا خێزانی تۆ نیم، وە ئەو کەسەی پێم خۆشە کە لە چاکەدا بێتە هاوبەشم خوشکەکەی خۆمە. پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ئەو حەلاڵ نییە بۆ من. وتی ئێمە وامان بیستووە کە تۆ دەتەوێت کچەکەی ئەبی سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: کچی ئوم سەلەمە؟ وتم بەڵێ فەرمووی: ئەگەر خۆشم پەروەردەم نەکردایە هەر حەلاڵ نەبوو بۆ من چونکە ئەو برازای شیریمە، ثُوَيْبَةُ شیری داوە بە من و ئەبو سەلەمە، کچەکانتان و خوشکەکانتان مەخەنە ڕوو بۆ من)).

---

[1] البخاري (٥١٠٧) (٥١٠٦) (٥١٢٣) مسلم (١٤٤٩)

عوروه دهڵێ: ثُوَيْبَـةُ ئـازاد كـراوى ئـهبو لههـهب بـوو ئـهبو لههـهب ئـازادى كردبـوو، ئهويش شيرى دابوو به پێغهمبـهر (ﷺ) جـا كاتێـك كـه ئـهبو لههـهب مـرد ههنـدێك لـه كهس و كارهكهى ديان له خراپترين حاڵدايه پێيـان وت بـه چـى گهشـتيت؟ (واتـه دواى مردنى) ئهبو لههب وتى: دواى ئێوه به خێر نهگهشتم جگه له ئهنـدازهى ئـهوه نـهبێت ئاوم دراوهتێ (دهڵێ: ئاماژهى كردووه بۆ سهرى پهنجهى).

الحِيبَةُ: واته - بار و گوزهران.

٣٠١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ – صلَّى الله عليه وسلم ((لا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا)) [1].

واتـه: لـه ئـهبو هـورهيرهوه (ڕهزاى خـواى لێبـێ) دهڵـێ: پێغهمبـهرى خـوا (ﷺ) فهرمووى: ((ژن و پورهكهى كۆناكرێتهوه جا خوشكى دايكى بێت ياخود باوكى)).

ڕوونكردنهوه: كاتێك ههردووكيان له ژيانـدا بـن كۆكردنـهوهيان حهرامـه بـهڵام پـاش مردنى ژن حهڵاڵه.

[1] البخاري (٥١٠٩) (٥١١٠) مسلم (١٤٠٨)

## بابُ الشروط في النِّكاح - بەشی مەرجەکان لە ژن مارە بڕیندا

٣٠٢ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ: مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ)) [١].

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ڕەوا ترین مەرج کە ئێوە وەفای پێبکەن ئەوەیە کە داوێنی خێزانەکانتان حەڵاڵ کردووە)).

٣٠٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ الشِّغَارِ)) [٢].

وَالشِّغَارُ: أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ ابْنَتَهُ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا الصَّدَاقُ.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژن بە ژنی قەدەغە کرد)).

الشِّغَارُ: واتە: پیاوێك کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێك لە بەرامبەر ئەوەی ئەویش کچەکەی خۆی باتێ، بەبێ مارەیی ئەگەر مارەیشیان لە نێواندا بێت هەر دروست نییە.

٣٠٤– عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ)) [٣].

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی جەنگی خەیبەردا ژن هێنانی کاتی و گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە کرد)).

---

١ البخاري (٥١٥١) مسلم (١٤١٨)

٢ البخاري (٥١١٢) مسلم (١٤١٥)

٣ البخاري (٥١١٥) (٤٢١٦) (٥٥٢٣) (٦٩٦١) مسلم (١٤٠٧/٣٠)

## بابُ ما جاء في الإستئمار والستئذان - بەشی مۆڵەت وەرگرتن لە ئافرەت

٣٠٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَكَيْفَ إِذْنُهَا قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ)) [1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((بێوە ژن مارە ناکرێ هەتا فەرمانی لێوەرنەگیرێت، وە کچیش مارە ناکرێ هەتا مۆڵەتی لێوەرنەگیرێت. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەت لێوەرگرتنی چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بێدەنگ بێت)).

[1] البخاري (٥١٣٦) مسلم (١٤١٩)

## بابُ لا ينكح مطلقته ثلاثاً حتى تنكح زوجاً غيره
## بەشی ئافرەتی سێ بە سێ تەلاق دراو مارە ناکرێت هەتا شوو نەکاتەوە

٣٠٦ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((جَاءَتْ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ إلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَتْ: كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي. فَتَزَوَّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزُّبَيْرِ وَإِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ. فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَقَالَ: أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إلَى رِفَاعَةَ؟ لا، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ، وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ، قَالَتْ: وَأَبُو بَكْرٍ عِنْدَهُ، وَخَالِدُ بْنُ سَعِيدٍ بِالْبَابِ يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْذَنَ لَهُ، فَنَادَى أَبَا بَكْرٍ: أَلا تَسْمَعُ إلَى هَذِهِ: مَا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم))[1].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ژنەکەی ڕیفاعەی قورەظي هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)وتی، من ژنی ڕیفاعەی قورەظي بووم سێ بە سێ تەلاقی دام دوای ئەو شووم بە عەبدولڕەحمانی کوڕی زوبەیر کرد وە ئەو وەك ئەم چمکی کراسە وایە (واتە توانای ژن و مێردایەتی نییە) ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەردەخەنە گرتیو فەرمووی: دەتەوێ بگەڕێتەوە بۆلای ڕیفاعە؟ نەخێر هەتا تۆ چێژ لەو وەرنەگریت ئەویش چێژ لە تۆ وەرنەگرێت. عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێ) لەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو وە خالیدی کوڕی سەعیدیش لە دەم دەرگاکەدا بوو چاوەڕێ بوو کە مۆڵەتی بدرێتێ بانگی کرد ئەی ئەبو بەکر گوێت لەوە نیە بە ئاشکرا چی دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ))).

---

١ البخاري (٢٦٣٩) (٥٢٦٠) (٥٣١٧) (٥٧٩٢) (٥٨٢٥) (٦٠٨٤) مسلم (١٤٣٣)

## بابُ عشرةَ النّساء - بەشی شەو مانەوە لای ژن

٣٠٧ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((مِنْ السُّنَّةِ إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ: أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعاً ثُمَّ قَسَمَ. وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ: أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاثاً ثُمَّ قَسَمَ)). قَالَ أَبُو قِلابَةَ: وَلَوْ شِئْتُ لَقُلْتُ: إِنَّ أَنَساً رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم))[1]. واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((سونەت وایە ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژندا حەوت شەو لای دەمێنێتەوە، پاشان دابەشی دەکات (واتە سەرە بەشەکانیان دابەش دەکات) وە گەر بێوەژنی هێنا سێ شەو لای دەمێنێتەوە پاشان دابەشی دەکات. ئەبو قیلابە دەڵێ: گەر بمەوێت دەڵێم : بێگومان ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) ئەم فەرموودەیەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)گێڕاوەتەوە)).

٣٠٨ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ((لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ: إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ: بِسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ، لَمْ يَضُرَّهُ الشَّيْطَانُ أَبَداً))[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ((ئەگەر یەکێك لە ئێوە کاتێك ویستی بچێتە لای خێزانەکە بڵێت: بەناوی خوا پەروەردگارا شەیتانمان لێ دوور بخەرەوە، وە شەیتان دوور بخەرەوە لەو نەوەیەی کە کردووتە بە ڕزقی ئێمە، ئەوا ئەگەر لەو تێکەڵ بوونەدا خوا منداڵیان پێببەخشێت شەیتان هەرگیز زیانی پێ ناگەیەنێت)).

---

١ البخاري (٥٢١٣) (٥٢١٤) مسلم (١٤١٦)

٢ البخاري (١٤١) (٣٢٧١) (٣٢٨٣) (٥١٦٥) (٦٣٨٨) مسلم (١٤٣٤)

## بابُ النهي عن الخلوة بالأجنبية
## بەشی ڕێگری لە بەتەنها مانەوە لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا

٣٠٩ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ – رضي الله عنه – أنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ ((إيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الأنْصَارِ: يَا رَسُولَ الله، أرَأيْتَ الْحَمْوَ؟ قَالَ: الْحَمْوُ الْمَوْتُ)) [١].

ولِمُسْلِمٍ: عنْ أبي الطَّاهِرِ عن ابنِ وَهْبٍ قالَ: " سَمِعْتُ اللَّيثَ يقولُ: الحَمْوُ: أخو الزَّوْجِ ومَاأشْبَهَهُ منْ أقاربِ الزَّوْجِ، ابنِ العَمّ ونَحْوِهِ " [٢].

واته: له عوقبەی کوڕی عامرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی : ((خۆتان بپارێزن لە تەنیا کەوتن لەگەڵ ئافرەتانی بێگانە، جا پیاوێك لە ئەنصاریەکان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)هەواڵمان بەرێ سەبارەت بە " حَمْوُ "؟ (واتە برای مێرد یاخود کەسی نزیکی) فەرمووی: " حَمْوُ " مردنە (واتە کەسێك بمرێت لەوە باشترە کە بەتەنیا لەگەڵ ئافرەتێکی نا مەحرەمدا بمێنێتەوە))).

وە لای ئیمامی موسلیم: لە ئەبو طاهرەوە ئەویش لە إبن و وەهبەوە کە دەڵێ: گوێم لە لەیث بووە دەیوت: " حَمْوُ " واتە: برای مێرد وە وێنەی ئەو لە خزمە نزیکەکانی مێرد وەك ئامۆزا.

---

١ البخاري (٥٢٣٢) مسلم (٢١٧٢)

٢ مسلم (٢١٧٢/٢١)

## بابُ الصَّدَاقِ - بەشى مارەيى

٣١٠ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم أَعْتَقَ صَفِيَّةَ، وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا)) [1].

واتە: لە ئەنەسى كوڕى مالیكەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) صەفییەی ئازاد كرد وە ئازاد كردنەكەی خستە بری مارەیەكەی)).

٣١١ – عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ – رضي الله عنه – ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: إِنِّي وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ: فَقَامَتْ طَوِيلاً، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَوِّجْنِيهَا، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ. فَقَالَ:هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا؟ فَقَالَ: مَا عِنْدِي إِلا إِزَارِي. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : إِنْ أَعْطَيْتَهَا إِزَارَكَ جَلَسْتَ وَلا إِزَارَ لَكَ، فَالْتَمِسْ شَيْئاً قَالَ: مَا أَجِدْ. قَالَ: الْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ، فَالْتَمَسَ فَلَمْ يَجِدْ شَيْئاً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم هَلْ مَعَكَ شَيْءٌ مِنَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَك مِنَ الْقُرْآنِ)) [2].

واتە: لە سەهلى كوڕى سەعدى ساعدییەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)وتی، من خۆم پێشكەشی تۆ كردووە زۆر بەپێوە وەستا پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە منی مارە بكە ئەگەر تۆ پێویستت نییە، فەرمووی: ئایە شتێكت هەیە بیكەیتە مارەیی؟ وتی هیچم نییە تەنها ئەم پۆشاكە نەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: ئەگەر پۆشاكەكەتی بەیتێ ئەوا بەبێ پۆشاك دادەنیشیت هەوڵی شتێك بدە. وتی هیچم دەست نەكەوت، فەرمووی: هەوڵ

---

١ البخاري (٥٠٨٦) مسلم (١٣٦٥/٨٥)

٢ البخاري (٢٣١٠) (٥٠٢٩) (٥٠٣٠) (٥٠٨٧) (٥١٢١) (٥١٢٦) (٥١٣٢) (٥١٣٥) (٥١٤١) (٥١٤٩) (٥٨٧١) مسلم (١٤٢٥)

بده ئەگەر مستیلەیەکیش بێت لە ئاسن. گەڕا و هەوڵی دا هیچی دەست نەکەوت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئایە هیچ قورئانت لەبەرە؟ وتی بەڵێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوا لەیەکم مارە کردن بەوەی کە لە قورئان لەبەرتە)).

٣١٢ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم رَأَى عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَعَلَيْهِ رَدْعُ زَعْفَرَانٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : مَهْيَمْ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَقَالَ: مَا أَصْدَقْتَهَا؟ قَالَ: وَزْنَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ: فَبَارَكَ اللهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ)) [1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ)عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف دی شوێنەواری زەعفەرانی پێوە بوو، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە چییە؟ وتی ژنم هێناوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). فەرمووی: چیت کرد بەمارەیەکەی؟ وتی گۆیەکی ئاڵتون. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوا لێت پیرۆز بکات چێشت و نانی بۆ بکە ئەگەر مەڕێکیش بێت)).

---

١ البخاري (٢٠٤٩) (٣٧٨١) (٥٠٧٢) (٥١٥٣) (٥١٥٥) (٦٣٨٦) مسلم (١٤٢٧)

# كتابُ الطَّلاقِ - پەرتووكی تەلاق

٣١٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، ((أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلكَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم، فَتَغَيَّظَ مِنْهُ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ثُمَّ قَالَ: لِيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ فَتَطْهُرَ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ، كَمَا أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ)) [1].
وَفِي لَفْظٍ: ((حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً مُسْتَقْبَلَةً، سِوَى حَيْضَتِهَا الَّتِي طَلَّقَهَا فِيهَا)) [2].
وَفِي لَفْظٍ ((فَحُسِبَتْ مِنْ طَلَاقِهَا، وَرَاجَعَهَا عَبْدُ اللهِ كَمَا أَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم)) [3].

واتە: لە عەبدوللای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) ((كە لەكاتی بێنوێژیدا ژنەكەی تەلاق دا عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)باس كرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووڕە بوو پاشان فەرمووی: با بیهێنێتەوە لای خۆی بیهێڵێتەوە هەتا پاك دەبێتەوە پاشان بكەوێتە حەیزەوە و پاكیش بێتەوە، ئەگەر ویستی كە تەلاقی بدات ئەوا با تەلاقی بدات پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەمە ئەو چەند ڕۆژە دیاری كراوەیە كە خوا بالاَ دەست فەرمانی ژن تەلاق دانی تیادا داوە)).

وە لەدەربڕینێكی تردا: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: با بكەوێتە بێنوێژیەكی تر جگە لەو بێنوێژییەی كە تیایدا تەلاقی داوە.

وە لەدەربڕینێكی تردا هاتووە: كە ئەو تەلاقە لەسەری حساب كرا (واتە ئەو تەلاقەی كەوت هەرچەندە لە حەیزیشدا بوو) ئینجا عەبدوللا (ڕەزای خوای لێبێ) هێنایەوە هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێكردبوو.

---

١ البخاري (٤٩٠٨) (٥٢٥١) (٥٢٥٨) (٧١٦٠) مسلم (١٤٧١)

٢ مسلم (١٤٧١/٤)

٣ مسلم (١٤٧١/٤)

٣١٤ – عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ((أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، وَهُوَ غَائِبٌ)).

وَفِي رِوَايَةٍ: ((طَلَّقَهَا ثَلاثاً – فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا وَكِيلَهُ بِشَعِيرٍ، فَسَخِطَتْهُ. فَقَالَ: وَاللهِ مَا لَكِ عَلَيْنَا مِنْ شَيْءٍ: فَجَاءَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لَيْسَ لَكِ عَلَيْهِ نَفَقَةٌ)) وَفِي لَفْظٍ: ((وَلا سُكْنَى – فَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، ثُمَّ قَالَ: تِلْكَ امْرَأَةٌ يَغْشَاهَا أَصْحَابِي، اعْتَدِّي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ. فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى، تَضَعِينَ ثِيَابَكِ عِنْدَهُ، فَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي. قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ ذَكَرْتُ لَهُ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلم : أَمَّا أَبُو جَهْمٍ: فَلا يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ. وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ: فَصُعْلُوكٌ لا مَالَ لَهُ، انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَكَرِهَتْهُ ثُمَّ قَالَ: انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَنَكَحَتْهُ فَجَعَلَ اللهُ فِيهِ خَيْراًوَاغْتَبَطَتُ بِهِ))[1].

واته: له فاطمەی کچی قەیسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) که خێزانی ئەبو عەمری کوڕی حەفص بوو بەیەك جاری تەلاقی دا خۆشی لەوێ نەبوو (واته یەکێکی کرد به وەکیل)

وه لەدەربڕینێکی تردا هاتووه: سێ به سێ تەلاقی دا وەکیلەکەی هەندی جۆی بۆ نارد ئەویش پێی ناخۆش بوو (واته ئەو جۆیەی بەکەم زانی وای زانی بەخێو کردنی لەسەر مێردەکەیەتی تا دوای عیده) ئەبو عەمر وتی: سوێند بەخوا هیچ مەسرەفێکت لەسەر من نییه. ئینجا هات بۆخزمەت پێغەمبەری خواو (ﷺ) ئەمەی بۆ باس کرد، فەرمووی بەخێوکردنت لەسەر ئەو نییە. وه لەدەربڕینێکی تردا: فەرمووی: جێو ڕێشت لەسەر ئەو نییه. فەرمانی پێکرد که بمێنێتەوە له ماڵی ئوم شەریکدا (ڕەزای خوای لێبێ) پاشان فەرمووی: ئەوه ئافرەتێکه هاوەڵەکانم زوو زوو سەردانی دەکەن، لای عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم (ڕەزای خوای لێبێ) بمێنەرەوە (عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم (ڕەزای خوای لێبێ) ئامۆزای بوو)، چونکه ئەو پیاوێکی نا بینایه دەتوانی خۆشت بگۆڕیت و جلەکانت دانێیت، کاتێك عیدەت تەواو بوو ئاگادارم بکە.

١ أخرجه البخاري مختصرا عن عائيشة رقم (٥٣٢٣) مسلم (١٤٨٠)

دەڵێ: کاتێك عیدەکەم تەواو بوو پێم وت موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و ئەبو جەهم (ڕەزای خوایان لێبێ) داوایان کردووم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەبو جەهم بەردەوام دارەکەی لەسەر شانیەتی (واتە زۆر لە ئافرەت دەدا) وە موعاویەش هەژارەو ماڵی نییە، شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوایان لێبێ). دەڵێ: پێم ناخۆش بوو، پاشان فەرمووی: شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوایان لێبێ). دەڵێ: شووم پێکرد خوای گەورە خێرێکی زۆری کردە بەینمانەوە وە خۆش حاڵ بووم پێی)).

## بابُ العِدَّةِ - بەشی چاوەڕوانی ژن

واتە: ئەو ماوەیەی کە ئافرەت تیایدا دادەنیشێت نابێت شوو بکات بە هۆی تەلاق دانی یاخود بە هۆی مردنی مێردەکەیەوە.

٣١٥ - عَنْ سُبَيْعَةَ الأسْلَمِيَّةِ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ سَعْدِ بْنِ خَوْلَةَ - وَهُوَ مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً - فَتُوُفِّيَ عَنْهَا فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَهِيَ حَامِلٌ. فَلَمْ تَنْشَبْ (تَلْبَثْ) أَنْ وَضَعَتْ حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاتِهِ، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا: تَجَمَّلَتْ لِلْخُطَّابِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ - رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ - فَقَالَ لَهَا: مَا لِي أَرَاكِ مُتَجَمِّلَةً لَعَلَّكِ تُرَجِّينَ لِلنِّكَاحِ؟ وَاَللهِ مَا أَنْتِ بِنَاكِحٍ حَتَّى تَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ. قَالَتْ سُبَيْعَةُ: فَلَمَّا قَالَ لِي ذَلِكَ: جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي حِينَ أَمْسَيْتُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ صلَّى الله عليه وسلم فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَفْتَانِي بِأَنِّي قَدْ حَلَلْتُ حِينَ وَضَعْتُ حَمْلِي، وَأَمَرَنِي بِالتَّزْوِيجِ إنْ بَدَا لِي)) [1].

وقالَ ابنُ شِهابٍ: ولاأرى بَأْساً أَنْ تَتَزَوَّجَ حِينَ وضَعَتْ، وإِنْ كَانَتْ فِي دَمِها، غَيْرَ أَنَّهُ لايَقْرَبُها زَوْجُها حتَّى تَطْهُرَ.

واتە: لە سوبەیعەی ئەسلەمیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە خێزانی سەعدی کوڕی خەولە بوو کە لە هۆزی بەنی عامری کوڕی لوئەیە وە یەکێك بوو لەوانەی ئامادەی جەنگی بەدر بوو وەفات دەکات لە حەجیماڵئاواییدا وە سوبەیعە دوو گیان بوو ئەوەندەی پێنەچوو دوای وەفاتی مێردەکەی منداڵەکەی بوو، کاتێك کە پاك بۆوە لە زەیستانێکەی خۆی ڕازاندەوە بۆ خوازبێنی کاران، ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەك چوو بۆلای کە پیاوێکی هۆزی " عَبْدُ الدَّارِ " بوو پێی وت چییە دەتبینم خۆت ڕازاندۆتەوە دەڵێی: بەتەمای شوویت؟ سوێند بەخوا ناتوانیت شوو بکەیت هەتا چوار مانگ و دە

---

١ البخاري (٥٣١٨) مسلم (١٤٨٤)

شەوت بەسەردا نەڕوات. سوبەیعەش وتی: کاتێك ئەمەی پێوتم ئێوارە خۆم کۆکردەوەو چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیارم لێکرد لەو بارەیەوە ئەویش فەتوای بۆدام کە عیدەم تەواو بووە لەو کاتەوەی کە منداڵەکەم بووە وە فەرمانی پێکردم کە شوو بکەم ئەگەر پێم باش بوو)).

إبن شهاب دەڵێ:بە گوناهی نازانم کە کە ئافرەت شوو بکات کاتێ کە منداڵی بوو، با خوێنیشی هەبێت بەڵام نابێت مێردەکەی لێی نزیك بێتەوە هەتا پاك دەبێتەوە.

## بابُ تحريم إحداد المرأة أكثر من ثلاثة إلاَّ على زوج
## بەشی حەرامیەتی تەعزیٚ باری زیاتر لە سیٚ ڕۆژ تەنها بۆ میٚرد نەبیٚت

٣١٦ – عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: ((تُـوُفِّيَ حَمِيمٌ لأُمِّ حَبِيبَـةَ، فَـدَعَتْ بِـصُفْرَةٍ، فَمَسَحَتْ بِذِرَاعَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنَّمَا أَصْنَعُ هَذَا " لأَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: لا يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاَللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَـلاثٍ، إلاَّ عَلَـى زَوْجٍ: أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ وَعَشْراً)) [١].

الحميمُ: القرابةُ.

واتە: لە زەینەبی کچی ئەم سەلەمەوە (ڕەزای خوای لیٚبیٚ) دەڵیٚ: کەسیٚکی نزیکی ئوم حەبیبە مرد داوای بۆنی خۆشی کرد بە دەستی هیٚنای بە دەموو چاویدا ئینجا وتی بۆیە ئەمە دەکەم چونکە من گویٚم لە پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) بووە فەرموویەتی: ((حەڵاڵ و ڕەوا نییە بۆ هیچ ژنیٚك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبیٚت لەسەرو سیٚ ڕۆژەوە تەعزیٚ بگریٚت، مەگەر بۆ میٚردەکەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە)).

---

١ البخاري (١٢٨١) (٥٣٣٤) مسلم (١٤٨٦/٥٩)

## بابُ ما تجتنبه الحادّ - بەشی ئەوەی ژنی تەعزێ بار خۆی لێدە پارێزێت

٣١٧ – عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لا تُحِدُّ امْرَأَةٌ عَلَى الْمَيِّتِ فَوْقَ ثَلاثٍ، إلا عَلَى زَوْجٍ: أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، وَلا تَلْبِسُ ثَوْباً مَصْبُوغاً إلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ. وَلا تَكْتَحِلُ. وَلا تَمَسُّ طِيباً، وَلا شَيْئاً إلاَّ إذَا طَهُرَتْ: نُبْذَةً مِنْ قُسْطٍ أَوْ أَظْفَارٍ)) [١].

العَصبُ: ثيابٌ منَ اليَمَنِ فيها بياضٌ وسوادٌ " [٢].

والنُبْذَةُ: [٣]: الشيءُ اليسيرُ. والقُسْطُ: العُودُ أَوْنوعٌ منَ الطيبِ تُبْخَرُ بِهِ النُّفَساءُ [٤]. والأظْفارُ: جِنْسٌ منَ الطيبِ لاواحِدَ لَهُ منْ لَفظِهِ. وقيلَ: هوَ عِطْرٌ أسودُ، القِطْعَةُ منه تُشْبِهُ الظُفُرَ" [٥].

واته: له ئوم عەطیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((هیچ ژنێك بۆی نییە لە سێ ڕۆژ زیاتر تەعزێ بۆ مردوو بگرێت مەگەر بۆ مێرد كە چوار مانگ و دە ڕۆژە وە نابێت پۆشاكی ڕەنگ كراو لەبەر بكات جگە لە پۆشاكی (عَصْب نەبێت پۆشاكێكی یەمەنییە ڕەنگی ڕەش و سپی تێدایە) بۆشی نییە چاو برژێت و بۆنی خۆشیش لەخۆی بدات مەگەر دوای پاك بوونەوە ئەویش كەمێك لە " قُسْطُ " یاخود " أَظْفارُ " كە دوو جۆر بۆنی خۆشی ئەو سەردەمە بوون)).

العَصْبُ: جۆرە پۆشاكێكی یەمەنییە ڕەنگی ڕەش و سپی تێدایە.

النُبْذَةُ: بەشێكی كەم.

القُسْطُ، الأظْفارُ: دوو جۆر بۆنی خۆشین.

---

١ البخاري (٥٣٤١) مسلم (٩٣٨/٦٦)
٢ النهاية (٢٤٥/٣)
٣ النهاية (٧/٥)
٤ النهاية (٦٠/٤)
٥ النهاية (١٥٨/٣)

٣١٨ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((جَاءَتْ امْرَأَةٌ إلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، وَقَدْ اشْتَكَتْ عَيْنُهَا أَفَنُكحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : لا – مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلاثاً – ثُمَّ قَالَ: إنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ. وَقَدْ كَانَتْ إحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ)).

فَقَالَتْ زَيْنَبُ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا: دَخَلَتْ حِفْشاً، وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيباً وَلا شَيْئاً حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ – حِمَارٍ أَوْ طَيْرٍ أَوْ شَاةٍ – فَتَفْتَضُّ بِهِ. فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إلاَّ مَاتَ. ثُمَّ تَخْرُجُ فَتُعْطَى بَعْرَةً، فَتَرْمِي بِهَا ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ)) [1].

واته: له ئوم سهلهمهوه (ڕهزای خوای لێبێ) دهڵێ:ئافرهتێك هات بۆ خزمهت پێغهمبهری خوا (ﷺ)وتی، ئهی پێغهمبهری خوا(ﷺ)مێردی كچهكهم مردووه وه تووشی چاو ئێشه بووه ئایه چاوی بۆ برژێن؟ فهرمووی ((نهخێر دوو جار یاخود سێ جار ههر فهرمووی نهخێر. پاشان فهرمووی: ماوهكهی چوار مانگ و ده ڕۆژه، ههر یهكێك له ئێوه لهسهردهمی نهفامیدا پاش تهواو بوونی ساڵێك پشقلهكهی فڕێدهدا)).

زهینهبی كچی ئوم سهلهمه (ڕهزای خوایان لێبێ) دهڵێ:لهسهردهمی نهفامیدا ئافرهتێك ئهگهر مێردهكهی بمردایه دهچووه ماڵێكی بچووكی پیس و چهپهڵهوه وه خراپترین جلی لهبهر دهكرد دهستی لههیچ بۆنێكی خۆشیش نهدهدا ههتا یهك ساڵی بهسهردا دهڕۆی، پاشان ئاژهڵێكیان دههێنا ئیتر گوێدرێژ بێت یاخود باڵندهیهك یاخود مهڕێك ئهو پیسییهی گیانی پێدا ههڵدهسوو، كهم جار ههبوو ئهو شتهی ئهو خۆی پێدهسڕی نهمرێت ، پاشان دهردهچوو پشقلێكی دهدرایه فڕێی دهدا، پاشان دوای ئهوه دهگهڕایهوه به ئارهزووی خۆی خۆی دهشۆرد و بۆنی خۆشی لهخۆی دهدا.

[1] البخاري (٥٣٣٦) (٥٣٣٧) مسلم (١٤٨٨) (١٤٨٩)

# كتابُ اللِّعانِ - پەرتووكی نەفرین كردن

٣١٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أَنَّ فُلانَ بْنَ فُلانٍ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ وَجَدَ أَحَدُنَا امْرَأَتَهُ عَلَى فَاحِشَةٍ، كَيْفَ يَصْنَعُ؟ إنْ تَكَلَّمَ تَكَلَّمَ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، وَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم فَلَمْ يُجِبْهُ. فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَتَاهُ فَقَالَ: إنَّ الَّذِي سَأَلْتُكَ عَنْهُ قَدْ ابْتُلِيتُ بِهِ. فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ هَؤُلاءِ الآيَاتِ فِي سُورَةِ النُّورِ ((وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ)) فَتَلاهُنَّ عَلَيْهِ وَوَعَظَهُ وَذَكَّرَهُ. وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ. فَقَالَ: لا، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا. ثُمَّ دَعَاهَا، فَوَعَظَهَا، وَأَخْبَرَهَا: أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ فَقَالَتْ: لا، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، إنَّهُ لَكَاذِبٌ. فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ: إنَّهُ لَمِنْ الصَّادِقِينَ. وَالْخَامِسَةَ: أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إنْ كَانَ مِنْ الْكَاذِبِينَ. ثُمَّ ثَنَّى بِالْمَرْأَةِ. فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ: إنَّهُ لَمِنْ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ: أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ. ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا. ثُمَّ قَالَ: اللهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟)) ثَلاثاً [1].

وَفِي لَفْظٍ ((لا سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَالِي؟ قَالَ: لا مَالَ لَكَ. إنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ فَهُوَ أَبْعَدُ لَكَ مِنْهَا)) [2].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: فلآنی كوڕی فلآن وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)تۆ چی دەفەرموویت گەر یەكێكمان خێزانەكەی دی بەسەر داوێن پیسییەوە چی بكات؟ ئەگەر قسە بكات ئەوە قسە لە شتێكی گەورە دەكات وە ئەگەر بێدەنگ بێت ئەوا لە شتێكی گەورە بێدەنگ بووە؟ دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو وەلآمی نەدایەوە، دوای ئەوە پرسیار كەرەكە هاتەوە خزمەت پێغەمبەرو (ﷺ) وتی، ئەو پرسیارەی كە لێم كردیت تووشی بووم، ئینجا خوای گەورە

---

١ البخاري (٥٣١١) (٥٣١٢) (٥٣٤٩) مسلم (١٤٩٣/٧،٦،٥،٤)

٢ مسلم (١٤٩٣/٥)

ئەم چەند ئایەتەی لە سورەتی " النُّورِ " ناردە خـوارەوە ((وَٱلَّذِينَ يَرْمُـونَ أَزْوَاجَهُـمْ)) پێغەمبەر (ﷺ) ئایەتەكانی بەسـەردا خوێنـدەوە و ئامۆژگـاری كـرد و ڕۆژی دوایـی بـە بیردا هێنایەوە و هەواڵی پێدا كە ئەشكەنجەی دنیا سووكترە لـە ئەشـكەنجەی دوا ڕۆژ. وتی، نەخێر سوێند بەو كەسەی كـە تـۆی نـاردووە بـە پێغەمبـەر بوختـانی بەسـەرەوە ناكەم، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) خێزانەكەی بانگ كرد ئامۆژگاری كرد و هەواڵی پێدا كـە ئەشكەنجەی دنیا سووكترە لە ئەشكەنجەی دوا ڕۆژ. وتی، نەخێر سـوێند بـەو كەسـەی كە تۆی ناردووە بە حەق ئەو درۆ دەكات، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە پیاوەكەوە دەستی پێكرد ئەویش چوار جار شایەتی داو سوێندی خوارد كە لە ڕاستگۆیانە وە لـە پێنجـەم جاریشدا وتی نەفرەتی خوام لێبێت ئەگـەر لـە درۆزنـان بم. پاشـان بـە ژنەكـە دەسـتی پێكرد ئەویش چوار جار شایەتی داو سوێندی خوارد كە مێردەكەی لە درۆزنانـە وە لـە پێنجەم جاریشدا وتی خەشم و قینی خوام لەسەر بیچت ئەگەر ئەو لە ڕاستگۆیان بێـت. پاشان لەیەكی جیاكردنەوە. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار فـەرمووی: خـوا دەزانێـت كە یەكێكتان درۆزنن ئایە كەستان تەوبە دەكەن)).

وە لەدەربڕینێكی تردا: پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی: مافـت بەسـەریەوە نـەماوە وتـی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماڵەكەم؟ فەرمووی: ماڵت بۆ نییە ئەگەر تـۆ ڕاسـتگۆ بیـت لەوەی وتوتە لەسەری ئەوە ماڵەكەت لە بەرامبەر ئەوەیە كە داوێنی بۆتۆ حـەڵاڵ بـووە وە ئەگەر تۆ بوختانت بۆ كردبێت ئەوە بۆ تۆ دوور ترە.

٣٢٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أَنَّ رَجُلاً رَمَى امْرَأَتَهُ، وَانْتَفَى مِنْ وَلَـدِهَا فِي زَمَنِ رَسُـولِ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسـلم فَأَمَرَهُمَـا رَسُـولُ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسـلم فَتَلاعَنَا، كَمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى، ثُمَّ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْمَرْأَةِ، وَفَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاعِنَيْنِ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبـێ) دەڵـێ:((لـە سـەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پیاوێك خێزانەكەی تۆمەت بار كرد وە وتی ئەو منداڵـە لـە مـن

١ البخاري (٥٣١٥) مسلم (١٤٩٤)

نييه، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردن نەفرينی يەكتريان كرد، پاشان فـەرمانی كرد منداڵەكە بۆ ئافرەتەكە بێت وە دوو نەفرين كەرەكەی لەيەك جياكردەوە)).

٣٢١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ ((جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَـزَارَةَ إِلَـى النَّبِـيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: إنَّ إمْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاماً أَسْوَدَ. فَقَـالَ النَّبِـيُّ صـلَّى الله عليـه وسلم هَلْ لَكَ إبِلٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَمَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ. قَـالَ: فَهَـلْ يَكُـونُ فِيهَـا مِـنْ أَوْرَقَ؟ قَالَ: إنَّ فِيهَا لَوُرْقاً. قَالَ: فَأَنَّى أَتَاهَا ذَلِكَ؟ قَالَ: عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ. قَـالَ: وَهَذَا عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ)) [1].

واتە: لە ئەبوهورەيرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پياوێك لـە نـەوەی فـەزارە هـات بـۆ خزمـەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وتـی ژنەكـەم كـوڕێكی ڕەشـی بـووە، پێغەمبـەر (ﷺ)فـەرمووی: ئايـە وشـترت هەيـە؟ وتـی بـەڵێ، فـەرمووی: ڕەنگيـان چۆنە؟ وتـی، سـوورن فـەرمووی: ئايـە ڕەنـگ خۆڵـە مێشييان تيايـە؟ وتـی تيايانايـە ڕەنـگ خۆڵـە مێشييە، فەرمووی: ئەوە لە كوێـوە هـاتووە؟ وتـی لەوانەيـە لـە لـە باوانيـەوە هـاتبێ. فەرمووی: ئەمەش لەوانەيە لە لە باوانيەوە هاتبێ)).

---

[1] البخاري (٥٣٠٥) (٦٨٤٧) (٧٣١٤) مسلم (١٥٠٠)

## بابُ إلحاق النسب - بەشی ڕەچەڵەك گەیاندن

٣٢٢ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلامٍ. فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، أُنْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ. وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللهِ، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم إِلَى شَبَهِهِ، فَرَأَى شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ فَقَالَ: هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ. وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ، فَلَمْ يَرَ سَوْدَةَ قَطُّ))[1].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدی کوڕی زەمعە (ڕەزای خوایان لێبێ) بوو بە ناکۆکیان لە بارەی منداڵێکەوە سەعد وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەمە برازامە کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاصە، وەسیەتی بۆ کردووم کە کوڕیەتی سەیری شێوەی بکە عەبدی کوڕی زەمعەش وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە برامە لەسەر جێی باوکی من لە دایك بووە لە کەنیزەکەی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیری کرد بینی بە ئاشکرا لە عوتبە دەچێت، فەرمووی: ئەی عەبدی کوڕی زەمعە ئەوە هی تۆیە، چونکە منداڵ هی سەر جێیە (واتە هی پیاوی ئافرەتەکەیە یاخود هی سەیدەکەیەتی) وە بۆ داوێن پیسیش سەر شۆڕی و پەشیمانی هەیە، وە فەرمووی: خۆتی لێ داپۆشە ئەی سەودە (چونکە نامەحرەم بوو لێی) ئیتر ئەو کوڕە هەرگیز سەودەی نەبینی)).

---

١ البخاري (٦٨١٧) (٦٧٤٩) مسلم (١٤٥٧)

٣٢٣ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: ((إِنَّ رَسُولَ الله صلَّى الله عليه وسلم دَخَلَ عَلَيَّ مَسْرُوراً، تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ. فَقَالَ: أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزاً نَظَرَ آنِفاً إِلَى زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، فَقَالَ: إِنَّ بَعْضَ هَذِهِ الأَقْدَامِ لَمِنْ بَعْضٍ)) [1].

وَفِي لَفْظٍ: ((كَانَ مُجَزِّزٌ قَائِفاً)) [2].

واته: له دایكمان عائیشه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ: ((پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) به دڵ خۆشیه‌وه هات بۆلام ناوچه‌وانی ده‌دره‌وشایه‌وه، فه‌رمووی: ئه‌ی عائیشه نه‌تبینی موجه‌زیز ئێستا سه‌یری زه‌یدی كوڕی حارثه و ئوسامه‌ی كوڕی زه‌یدی كرد، وتی ئه‌م قاچانه له‌یه‌ك ده‌چن)).

وه له‌ده‌ربڕینێكی تردا هاتووه كه عائیشه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) وتویه‌تی ((موجه‌زیز ڕه‌گه‌ز ناس بوو)).

ڕوونكردنه‌وه: زه‌یدی كوڕی حارثه سپی بوو وه ئوسامه‌ی كوڕیشی ڕه‌ش بوو بۆیه خه‌ڵكی گومانی خراپی پێده‌بردن پێغه‌مبه‌ریش(ﷺ) به‌مه بێتاقه‌ت ده‌بوو بۆیه به‌تانیه‌كیان دا به‌سه‌ر زه‌یدی كوڕی حارثه و ئوسامه‌ی كوڕیدا ئینجا موجه‌زیزی ڕه‌گه‌ز ناسیان هێنا سه‌یری كردن وتی ئه‌م قاچانه له‌یه‌ك ده‌چن واته له‌یه‌كن هۆكاری ئه‌و دڵخۆشییه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ)ئه‌وه بوو.

٣٢٤ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: ((ذُكِرَ الْعَزْلُ لِرَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم. فَقَالَ: وَلِمَ يَفْعَلُ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ؟ – وَلَمْ يَقُلْ: فَلا يَفْعَلْ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ، فَإِنَّهُ لَيْسَتْ نَفْسٌ مَخْلُوقَةٌ إِلاَّ اللهُ خَالِقُهَا)) [3].

واته: له ئه‌بو سه‌عیدی خودریه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ: ((باسی عه‌زل كرا بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی: بۆچی ئێوه واده‌كه‌ن؟ نه‌ی فه‌رموو: با هیچ كه‌سێك

---

١ البخاري (٣٧٣١) (٦٧٧٠) مسلم (١٤٥٩)

٢ مسلم (١٤٩٥/٤٠)

٣ البخاري (٧٤٠٩) مسلم (١٤٣٨/١٣٢)

له ئێوه وانەكات، چونكه هیچ نەفسێك نییه كه خوا بیەوێت دروستی بكات هەر دروستی دەكات)).

الْعَزْلُ: واته دەرهێنانەوەی زەكەر له پێشی ئافرەت لەكاتی ئاو هاتنەوەدا بۆ ئەوەی ئاوەكەی تێنەكات.

٣٢٥ عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: ((كُنَّا نَعْزِلُ وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ، لَوْ كَانَ شَيْئاً يُنْهَى عَنْهُ لَنَهَانَا عَنْهُ الْقُرْآنُ)) [١].

واته: له جابرەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئێمه عەزلمان دەكرد قورئانیش دادەبەزی ئەگەر عەزل كردن شتێكی قەدەغه كراو بوایه ئەوا قورئان لێی قەدەغه دەكردین)).

٣٢٦ عَنْ أَبِي ذَرٍّ – رضي الله عنه –: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ – صلَّى الله عليه وسلم ـ يَقُولُ ((لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ – وَهُوَ يَعْلَمُهُ – إلاَّ كَفَرَ. وَمَنْ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ: فَلَيْسَ مِنَّا، وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ وَمَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْرِ، أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللهِ، وَلَيْسَ كَذَلِكَ، إلاَّ حَارَ عَلَيْهِ)) [٢].

واته: له ئەبی ذەڕەوه (ڕەزای خوای لێبێ) كه گوێی له پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووه فەرموویەتی: ((هەر كەسێك خۆی بداته پاڵ كەسێك جگه له باوكی بشزانێت ئەو كەسه باوكی نییه ئەوا كافر و بێ دینه، وه هەر كەسێك بانگەشەی شتێك بكات كه هی ئەو نەبێت ئەوا له ئێمه نییه، وه جێگەی خۆی دیاری بكات له ئاگری دۆزەخدا وه هەر كەسێك كەسێك بانگ بكات به كافر یاخود بڵێت ئەی دوژمنی خوا وه واش نەبێت ئەوا دەگەڕێتەوه بۆ سەر خۆی)).

---

١ البخاري (٥٢٠٨) مسلم (١٤٤٠)

٢ مسلم (٦١) كذا عند مسلم و للبخاري نحوه رقم (٦٠٤٥)

# كتابُ الرَّضاعِ - پەرتووكی شیرخواردنی منداڵ

٣٢٧ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم في بِنْتِ حَمْزَةَ: لاتَحِلُّ لِي، يَحْرُمُ مِنْ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنْ النَّسَبِ، وَهِيَ ابْنَةُ أَخِي مِنْ الرَّضَاعَةِ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دەربارەی كچەكەی حەمزە (ڕەزای خوایان لێبێ) حەلاڵ نییە بۆ من، ئەوەی بەهۆی بنەماڵەوە حەرام ببێت و ببێتە مەحرەم، ئەوا بەهۆی شیر خواردنیشەوە حەرام دەبێت و دەبێتە مەحرەم، ئەو كچە برازای شیریمە)).

ڕوونكردنەوە: عەلی كوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خوایان لێبێ) پێی خۆش بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ)كچەكەی حەمزە (ڕەزای خوایان لێبێ) بهێنێت بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: حەلاڵ نییە بۆ من چونكە حەمزە (ڕەزای خوای لێبێ) لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ثوەیبە شیری دابوو پێیان بوو بوون بە برای شیری.

٣٢٨ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((إنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا يَحْرُمُ مِنْ الْوِلادَةِ)) [2].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((ئەوەی بەهۆی لەدایك بوونەوە حەرام ببێت و ببێتە مەحرەم، ئەوا شیر خواردنیش حەرامی دەكات و دەیكاتە مەحرەم)).

---

١ البخاري (٢٦٤٥) (٥١٠٠) مسلم (١٤٤٧/١٣)

٢ البخاري (٢٦٤٦) (٥٠٩٩) مسلم (١٤٤٤)

٣٢٩ – وَعَنْهَا قَالَتْ: ((إنَّ أفْلَحَ – أخَا أبِي الْقُعَيْسِ – اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ بَعْدَمَا أُنْزِلَ الْحِجَابُ؟ فَقُلْت: وَاللهِ لا آذَنُ لَهُ، حَتَّى أسْتَأْذِنَ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم فَإِنَّ أخَا أبِي الْقُعَيْسِ: لَيْسَ هُوَ أرْضَعَنِي، وَلَكِنْ أرْضَعَتْنِي امْرَأةُ أبِي الْقُعَيْسِ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقُلْت: يَا رَسُولَ اللهِ: إنَّ الرَّجُلَ لَيْسَ هُوَ أرْضَعَنِي، وَلَكِنْ أرْضَعَتْنِي امْرَأتُهُ. فَقَالَ: ائْذَنِي لَهُ، فَإِنَّهُ عَمُّك، تَرِبَتْ يَمِينُك)) [1].

قَالَ عُرْوَةُ " فَبِذَلِكَ كَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: " حَرِّمُوا مِنْ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنْ النَّسَبِ " وَفِي لَفْظٍ ((اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ أفْلَحُ، فَلَمْ آذَنْ لَهُ. فَقَالَ: أتَحْتَجِبِينَ مِنِّي، وَأنَا عَمُّك؟ فَقُلْت: كَيْفَ ذَلِكَ؟ قَالَ: أرْضَعَتْكِ امْرَأةُ أخِي بِلَبَنِ أخِي، قَالَتْ: فَسَألْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: صَدَقَ أفْلَحُ، ائْذَنِي لَهُ، تَرِبَتْ يَمِينُك)) [2].

تَرِبَتْ: أيْ افْتَقَرَتْ، وَالْعَرَبُ تَدْعُو عَلَى الرَّجُلِ، وَلا تُرِيدُ وُقُوعَ الأمْرِ بِهِ.

واته: هەر لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئەفلەحی برای ئەبو قوعەیس مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست دوای دابەزینی ئایەتی حیجاب، وتم سوێند بەخوا مۆڵەتی نادەمێ هەتا مۆڵەت لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرنەگرم چونکە برای ئەبو قوعەیس شیری نەداوە بەمن بەڵکو خێزانی ئەبو قوعەیس شیری داوە بەمن جا پێغەمبەری خوا (ﷺ)هاتەوە وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆ ئەم پیاوە شیری نەداوە بەمن بەڵکو ژنەکەی شیری داوە بەمن، فەرمووی: مۆڵەتی بدە چونکە ئەوە مامتە دەستت بچێت بەخۆڵدا)).

عوروە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:هەر لەبەر ئەمە بوو دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەیوت: بەهۆی شیر دانەوە حەرامی بکەن ئەوەی بەهۆی بنەماڵە و ڕەچەڵەکەوە حەرامە.

---

١ البخاري (٤٧٩٦) (٥٢٣٩) (٦١٥٦) مسلم (١٤٤٥/٥)

٢ البخاري (٢٦٤٤)

وه لەدەربڕینێکی تردا: دایکمان عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئەفلەح داوای مۆڵەتی لێکردم مۆڵەتم نەدایە، وتی خۆت لەمن دەشاریتەوە وە من مامەتم؟ وتم چۆن تۆ مامەمی؟ وتی: برازنەکەم شیری براکەمی داوە بە تۆ. دەڵێ:پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەفلەح ڕاست دەکات مۆڵەتی بدە دەستت بچێت بەخۆڵدا))

تَرِبَتْ: أيْ افْتَقَرَتْ، واتە هەژار بیت – دەستت بچێت بەخۆڵدا بەڵام هەروەك نووسەری کتێب دەڵێ:عەرەب دۆعا لە خەڵك دەکات بەڵام مەبەستیان هاتنە دی نییە.

٣٣٠– وَعَنْهَا رضـي الله عنهـا قَالَـتْ: ((دَخَـلَ عَلَـيَّ رَسُـولُ اللهِ صـلَّى الله عليـه وسـلم وَعِنْدِي رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، مَنْ هَذَا؟ قُلْت: أَخِي مِنْ الرَّضَاعَةِ. فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ: انْظُرْنَ مَنْ إخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنْ الْمَجَاعَةِ)) [1].

واتە: هەر لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لام پیاوێکم لەلا بوو، فەرمووی: ئەی عائیشە ئەوە کێیە؟ وتم برای شیریمە. فەرمووی: ئەی عائیشە بڕوانن کە کێ براتانن چونکە شیردان لە برسێتیدا دەبێت (واتە ئەو منداڵە برسی بێت وە تەمەنی لە دوو ساڵ کەمتر بێت و پێنج جار شیری باتێ))).

٣٣١ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ – رضي الله عنه – ((أَنَّهُ تَزَوَّجَ أُمَّ يَحْيَى بِنْتَ أَبِي إهَابٍ، فَجَاءَتْ أَمَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: فَأَعْرَضَ عَنِّي. قَالَ: فَتَنَحَّيْتُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ. قَالَ: وَ كَيْفَ؟ وَقَدْ زَعَمَتْ أَنْ قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا)) [2].

واتە: لە عوقبەی کوڕی حارثەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ((کە ئوم یەحیای کچی ئەبو ئیهابی هێناوە جا کەنیزەیەکی ڕەش هات وتی: من شیرم داوە بەهەر دووکتان، منیش

١ البخاري (٢٦٤٧) (٥١٠٢) مسلم (١٤٥٥)

٢ البخاري (٨٨) (٢٦٤٠) (٢٦٥٩) (٥١٠٤) و لم يخرجه مسلم .

ئەمەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد. دەڵێ: پشتی تێکردم، دوور کەوتمەوە دووبارە بۆم باس کردەوە، فەرمووی: چۆن لەگەڵیا دەمێنیت کە ئەو دەڵێ: شیرم داوە پێتان (واتە دەبێت تەلاقی بدەیت و وازی لێبهێنیت))).

٣٣٢ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم – يَعْنِي مِنْ مَكَّةَ – فَتَبِعَتْهُمْ ابْنَةُ حَمْزَةَ، تُنَادِي: يَا عَمُّ، فَتَنَاوَلَهَا عَلِيٌّ فَأَخَذَ بِيَدِهَا، وَقَالَ لِفَاطِمَةَ: دُونَكِ ابْنَةَ عَمِّكِ، فَاحْتَمَلَتْهَا. فَاخْتَصَمَ فِيهَا عَلِيٌّ وَجَعْفَرٌ وَزَيْدٌ فَقَالَ عَلِيٌّ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا، وَهِيَ ابْنَةُ عَمِّي وَقَالَ جَعْفَرٌ: ابْنَةُ عَمِّي، وَخَالَتُهَا تَحْتِي. وَقَالَ زَيْدٌ: ابْنَةُ أَخِي. فَقَضَى بِهَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم لِخَالَتِهَا، وَقَالَ: الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ. وَقَالَ لِعَلِيٍّ: أَنْتَ مِنِّي، وَأَنَا مِنْك. وَقَالَ لِجَعْفَرٍ: أَشْبَهْتَ خَلْقِي وَخُلُقِي وَقَالَ لِزَيْدٍ: أَنْتَ أَخُونَا وَمَوْلانَا))[1].

واتە: لە بەڕائی کوڕی عازبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو (واتە لە مەککە) کچەکەی حەمزە (ڕەزای خوایان لێبێ) دوایان کەوت بانگی دەکرد ئەی مامە جا عەلیش (ڕەزای خوای لێبێ) دەستی دایەو دەستی گرت و بە فاطمەی وت بیگرە ئەمەکچی مامەتە ئەویش هەڵی گرت، ئیتر عەلی و جەعفەر و زەید (ڕەزای خوایان لێبێ) بوو بەناکۆکیان لە بارەیەوە ، عەلی (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: من ڕەوا ترم پێی ئەوە کچی ماممە، وە جەعفەر (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: کچی مامی منیشە وە خوشکی دایکیشی خێزانمە، زەیدیش (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: برازامە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بۆ پوری (واتە دای بە جەعفەر (ڕەزای خوای لێبێ)) ئینجا فەرمووی: پور لەجێی دایکە. وە بە عەلی فەرموو: تۆ لەمنی وە منیش لە تۆم. وە بە جەعفەریشی فەرموو: تۆ لە ڕوخسار و ڕوەشتدا لە من دەچیت. وە بە زەیدی فەرموو: تۆ برا و ئازاد کراومانیت)).

---

١ البخاري (٢٦٩٩) (٤٢٥١) و لم يخرجه مسلم .

# كتابُ القصاص - تۆڵەسەندنەوە

٣٣٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ((لا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ))[1].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((حەلاڵ نییە خوێنی هیچ کەسێکی موسوڵمان کە شایەتی بدات هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بێت بەهەق جگە لە الله نەبێت وە شایەتی بدات کە من نێردراوی خودام تەنها بە یەکێك لەم سیانە نەبێت، پیاوێك یاخود ئافرەتێك زینا بکات، کەسێك کەسێکی موسوڵمان بەستەم و هەوەست بکوژێت، وە کەسێکیش پاشگەز بێتەوە لە ئاینی خۆی و جیا بێتەوە لە کۆمەڵی موسوڵمانان)).

٣٣٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ))[2].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((یەکەم شت دادوەری لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی دوایدا لە نێوان خەڵکیدا خوێنە)).

---

١ البخاري (٦٨٧٨) مسلم (١٦٧٦)

٢ البخاري (٦٥٣٣) (٦٨٦٤) مسلم (١٦٧٨)

٣٣٥ – عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((انْطَلَقَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودٍ إِلَى خَيْبَرَ، وَهِيَ يَوْمَئِذٍ صُلْحٌ، فَتَفَرَّقَا، فَأَتَى مُحَيِّصَةُ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ سَهْلٍ – وَهُوَ يَتَشَحَّطُ فِي دَمِهِ قَتِيلاً – فَدَفَنَه، ثُمَّ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَانْطَلَقَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةُ وَحُوَيِّصَةُ ابْنَا مَسْعُودٍ إِلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكَلَّمُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : كَبِّرْ، كَبِّرْ – وَهُوَ أَحْدَثُ الْقَوْمِ – فَسَكَتَ، فَتَكَلَّمَا، فَقَالَ: أَتَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ قَاتِلَكُمْ، أَوْ صَاحِبَكُمْ؟ قَالُوا: وَكَيْفَ نَحْلِفُ، وَلَمْ نَرَ؟ قَالَ: فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَمِيناً قَالُوا: وَكَيْفَ بِأَيْمَانِ قَوْمٍ كُفَّارٍ؟ فَعَقَلَهُ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم مِنْ عِنْدِهِ)) [١].

واته: له سەهلی کوڕی ئەبی حەثمة (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەیصەی کوڕی مەسعود دەرچوون بۆ خەیبەر ئەو ڕۆژە ئاشتەوایی بوو (واته دوای گرتنی خەیبەر) لەیەك جیابوونەوە جا موحەیصە هاتەوە بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی سەهل دی له خوێندا دەگەوزا کوژرابوو ئیتر ناشتی پاشان چووەوە بۆ مەدینە عەبدولڕەحمانی کوڕی سەهل و (واته برای کوژراوەکە) حوەیصە و موحەیصەی کوڕی مەسعود (واته ئامۆزای کوژراوەکە) چوون بۆخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) عەبدولڕەحمان چوو قسە بکات. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: گەورە تر گەورە تر (واته با لەتۆ بەتەمەنتر قسە بکات) ئەو لە هەموویان مندالتر بوو بێدەنگ بوو ئینجا حوەیصە و موحەیصە قسەیان کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئایە سوێند دەخۆن بکوژەکە یاخود هاوەڵەکەتان مسۆگەر بکەن؟ (واتە خوێنەکەی) وتیان چۆن سوێند بخۆین نەشمان دیوە؟ فەرمووی: ئایە جوولەکەکان پەنجا سوێنتان بۆ بخۆن کە ئەوان نەیان کوشتووە؟ وتیان چۆن سوێندی گەلێکی بێباوەڕ؟ (واته باوەڕ بە سوێندەکەیان ناکەین) ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) خۆی خوێنەکەی دا)).

---

١ البخاري (٣١٧٣) مسلم (١٦٦٩/٢،١)

وَفِي حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ: ((فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى الله عليه وسلم : يُقْسِمُ خَمْسُونَ مِنْكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَيُدْفَعُ بِرُمَّتِهِ، قَالُوا: أَمْرٌ لَمْ نَشْهَدْهُ كَيْفَ نَحْلِفُ؟ قَالُوا: فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، قَوْمٌ كُفَّارٌ)) [١] .

وه له فهرموودهى حهمادى كوڕى زهيد دا (ڕهزاى خواى ليّبىّ) ((پيّغهمبهرى خوا (ﷺ) فهرمووى: پهنجا له ئيّوه سويّند بخوات لهسهر پياويّك لهوان ئهوه ئهو پياوه بهبهند كراوى دهدريّته دهستان. وتيان كاريّكه نهمان ديوه چۆن سويّند بخۆين؟ فهرمووى: جوولهكهكان پهنجا سويّنتان بۆ بخۆن كه ئهوان نهيان كوشتووه؟ وتيان گهليّكى بيّباوهڕن؟ (واته باوهڕ به سويّندهكهيان ناكهين).

وَفِي حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ عُبَيْدٍ: ((فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ يُبْطِلَ دَمَهُ فَوَدَاهُ بِمِائَةٍ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ)) [٢] .

وه له فهرموودهى سهعدى كوڕى عوبهيد دا (ڕهزاى خواى ليّبىّ) هاتووه كه ((پيّغهمبهرى خوا (ﷺ) پيّى ناخۆش بوو خويّنهكهى بهفيڕۆ بڕوات بۆيه خۆى خويّنهكهى دا كه سهد وشترى زهكات بوو)).

٣٣٦ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه –: ((أَنَّ جَارِيَةً وُجِدَ رَأْسُهَا مَرْضُوضاً بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَقِيلَ مَنْ فَعَلَ هَذَا بِكِ: فُلانٌ، فُلانٌ؟ حَتَّى ذُكِرَ يَهُودِيٌّ، فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ فَاعْتَرَفَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم أَنْ يُرَضَّ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ)) [٣] .

واته: له ئهنهسى كوڕى ماليكهوه (ڕهزاى خواى ليّبىّ) دهلّىّ: ((كهنيزهكيّك بينرا سهرى له نيّوان دوو بهردا دانرابوو ((تيّكشكيّنرابوو))، پيّى وترا كىّ واى ليّكردوى؟ فلاّن كهس، فلاّن كهس؟ ههتا ناوى جوولهكهيهكيان هيّنا به سهرى ئاماژهى كرد، جا

١ مسلم (١٦٦٩/٢)

٢ مسلم (١٦٦٩/٥)

٣ البخاري (٢٤١٣) (٢٧٤٦) (٥٢٩٥) (٦٨٧٦) (٦٨٧٧) (٦٨٨٤) مسلم (١٦٧٢/١٧)

جوولەکەکە گیرا دانی بە تاوانەکەدا نا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کە سەری لە نێوان دوو بەردا پان بکەنەوە)).

٣٣٧ – وَلِمُسْلِمٍ وَالنَّسَائِيِّ عَنْ أَنَسٍ – رضي الله عنه – ((أَنَّ يَهُودِيّاً قَتَلَ جَارِيَةً عَلَى أَوْضَاحٍ، فَأَقَادَهُ بِهَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم)) [١].

وە لەلای پێشەوا موسلیم و نەسائی لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((جوولەکەیەك کەنیزەکێکی کوشت لەسەر ملوانکەیەکی زیو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوشتیەوە لە تۆڵەیدا)).

٣٣٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((لَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ صلَّى الله عليه وسلم مَكَّةَ قَتَلَتْ هُذَيْلٌ رَجُلاً مِنْ بَنِي لَيْثٍ بِقَتِيلٍ كَانَ لَهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: إنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ، وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ كَانَ قَبْلِي، وَلا تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِي، وَإِنَّمَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ: حَرَامٌ، لا يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلا يُخْتَلَى خَلاهَا، وَلا يُعْضَدُ شَوْكُهَا، وَلا تُلْتَقَطُ سَاقِطَتُهَا إلاَّ لِمُنْشِدٍ. وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ: فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إمَّا أَنْ يَقْتُلَ، وَإِمَّا أَنْ يُفْدَى، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ – يُقَالُ لَهُ: أَبُو شَاهٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، اُكْتُبُوا لِي فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : اُكْتُبُوا لأَبِي شَاهٍ، ثُمَّ قَامَ الْعَبَّاسُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إلاَّ الأَذْخِرَ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: إلاَّ الإِذْخِرَ)) [٢].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: کاتێك کە خوای گەورە مەککەی ڕزگار کرد بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بنەماڵەی " هُذَيْل " پیاوێکیان کوشت لە نەوەی "لَيْث " لە بەرامبەر کوژراوێکی سەردەمی نەفامیدا، پێغەمبەر (ﷺ) هەستایە سەرپێ و فەرمووی: خوای باڵا دەست فیلەکانی لە مەککە گرتەوە (واتە ئەو پاشا

١ البخاري (٦٨٧٩) واللفظ له و مسلم (١٦٧٢) و النسائي (٢٢/٨)

٢ البخاري (١١٢) (٢٤٣٤) (٦٨٨٠) مسلم (١٣٥٥/٤٤٨،٤٤٧)

ستەم کارەی کە هات مەککە بروخێنێت خوای گەورە رێگری لێکردن هەروەك لە سورەتی فیلدا ئاماژەی پێداوە) وە پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانی دەسەلاّت دار کرد بەسەریدا، وە مەککە حەلاّڵ نە بووە بۆ هیچ کەسێك پێش من کە بجەنگێت تیایدا وە بۆ هیچ کەسێك دوای من بەلاّم لەساتێکی رۆژدا جەنگ کردن بۆ من حەلاّڵ بوو وە ئەویش ئەم سەعاتەیە وە لەمەودوا حەرامە، وە نابێت داری ببڕێت وە پووشوو پەلاّشی هەڵبکەندرێت وە نابێت وون بوی هەڵبگیرێتەوە جگە لە کەسێك نەبێت کە بیناسێنێت وە هەر کەسێك کەسێکی کوژرا ئەوە دوو رێگەی لەبەردەمدایە یان کابرا بکوژرێتەوە یاخود خوێنەکەی وەر بگرێتەوە. جا پیاوێك هەستا لەخەڵکی یەمەن پێی دەوترا ئەبو شاە وتی، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆم بنووسن (واتە ئەو وتارەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوێندیەوە). پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بۆ ئەبو شاهی بنووسن. پاشان عەباس (رەزای خوای لێبێ) هەستا و وتی، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جگە لە " إذخر " نەبێت (کە گیایەکی بۆن خۆشە) چونکە ئێمە بەکاری دەهێنین بۆ خانو قەبرەکانمان

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: جگە لە " إذخر ")).

٣٣٩ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – أَنَّهُ اسْتَشَارَ النَّاسَ فِي إمْلاصِ الْمَرْأَةِ، فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: ((شَهِدْتُ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَضَى فِيهِ بِغُرَّةٍ – عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ – فَقَالَ: لَتَأْتِيَنَّ بِمَنْ يَشْهَدُ مَعَك، فَشَهِدَ مَعَهُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ)) [١].

واتە: لە عومەری کوڕی خەطابەوە (رەزای خوای لێبێ) کە پرس و رای بەخەڵك کرد لەبارەی لەبارچونی منداڵەوە بەهۆی لێدانی ئەو ئافرەتەوە یاخود بە هۆی ئازار دان و دەست درێژی کردنە سەری جا موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خوای لێبێ)

---

١ البخاري (٧٣١٧) مسلم (١٦٨٣)

وتی ((ئاماده بووم له خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) فەرمانی تیادا کرد بـه کۆیلەیـەك جا بەندەیەك بێت یاخود کەنیزەکێك (کە نرخی پێنج وشتر بێت واتە نیوەی دە یەکی خوێنێکی تەواو) عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) بە موغیرەی فەرموو: دەبێت کەسێك بێنیت کە شایەتیت لەگەڵدا بدات، ئیتر موحەمەدی کوڕی مەسلەمە (ڕەزای خوای لێبێ) شایەتی لەگەڵدا دا))

٣٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه - قَالَ: ((اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ. فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ، فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم فَقَضَى النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ - عَبْدٌ، أَوْ وَلِيدَةٌ - وَقَضَى بِدِيَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا، وَوَرَّثَهَا وَلَدَهَا وَمَنْ مَعَهُمْ، فَقَامَ حَمَلُ بْنُ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ أَغْرَمُ مَنْ لاشَرِبَ وَلا أَكَلَ، وَلا نَطَقَ وَلا اسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : إِنَّمَا هُوَ مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ))[1]. مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ الَّذِي سَجَعَ.

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:دوو ژن لە هۆزی " هُذَيْل " بوو بەشەڕیان یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریان کوشتی و ئەو منداڵەشی کە لە ناو سکیدا بوو، جا ئاژاوە و ناکۆکیەکەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کە خوێنی کۆرپەکەی بەندەیەك بێت یاخود کەنیزەکێك وە فەرمانی کرد کە خوێنی ژنە کوژراوەکە لەسەر کەس و کاری ژنە بکوژەکەیە وە خوێنەکەی کرد بە میراتی کوڕەکەی و ئەوانەی لەگەڵیدان. جا حَمَلُ بْنُ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيّ هەستا و وتی، ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن من خوێنی کەسێك بدەم کە نە ئاوی خواردووە و نە نان وە نە قسەی کردووە و نە هاواری لێبیستراوە، خوێنی کەسێکی لەو شێوەیە بەفیڕۆچووە و حسابی بۆناکرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوە لە

---

١ البخاري (٥٧٥٨) (٦٩١٠) مسلم (١٦٨١/٣٦)

برای جادو كەرەكانـە)). لەبـەر ئـەو قـسانەی كـە ڕێكـی خـست و وەلاّمـی پێغەمبـەری خوا(ﷺ) پیّ دایەوە بۆیە وای پیّ فەرموو.

٣٤١ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ – رضي الله عنـه – ((أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ، فَنَـزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ، فَوَقَعَتْ ثَنِيَّتَاهُ، فَاخْتَصَمَا إلَى النَّبِيِّ صلَّى الله عليـه وسـلم فَقَالَ: يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ؟ إذْهَبْ لا دِيَةَ لَكَ)) [١].

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصـەینەوە (ڕەزای خـوای لێبـیّ) دەڵـیّ:((پیاوێك گـازی گرد لە دەسـتی پیـاوێكی تـر ئـەویش دەسـتی دەرهێنـا لـەدەمی دوو دانـی سـەرەوەی كەوت ئاژاوەكەیان برد بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئـەویش فـەرمووی: ئـەوە بـۆ یـەكێك لـە ئێوە هەر وەك وشتری نێرە گاز لە براكەی دەگرێت؟ بڕۆ هیچ خوێنت بۆ نییە)).

٣٤٢ – عَنْ الْحَسَنِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ – رحمه الله تعالى – قَالَ: حَدَّثَنَا جُنْدُبٌ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ، وَمَا نَسِينَا مِنْهُ حَدِيثاً، وَمَا نَخْشَى أَنْ يَكُونَ جُنْدُبٌ كَذَبَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليـه وسـلم : ((كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ، فَأَخَذَ سِكِّيناً فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ، فَمَا رَقَأَ الدَّمُ حَتَّى مَاتَ. قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: عَبْدِي بَادَرَنِي بِنَفْسِهِ، حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)) [٢].

واتە: لە حەسەنی كوڕی ئەبی حەسەنەوە (ڕەحمەتی خـوای لێبـیّ) دەڵـیّ:جونـدوب (ڕەزای خوای لێبیّ) قسەی بۆ كردین ئا لـەم مزگەوتـەدا، وە هـیچ لـەو فەرموودانـەمان لەبیر نەچووە كە بۆی گێڕاوینەتەوە، وە ناشترسین كـە جونـدوب (ڕەزای خـوای لێبـیّ) درۆ بە دەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بكـات، وتـی، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی ((لە گەلەكانی پێش ئێوە پیاوێك هەبوو برینێكی پێوە بـوو، ناڕحـەت و بێتاقـەن بـوو،

---

١ البخاري (٦٨٩٢) واللفظ له و مسلم (١٦٧٣)

٢البخاري (٣٤٦٣) مسلم (١٨٠،١٨١/١١٣)

چەقۆیەكی هەڵگرت دەستی خۆی پێ بریندار كرد خوێنەكەی نەگیرسایەوە هەتا مرد خوای بالاّ دەست فەرمووی: بەندەكەم پەلەی لێكردم بە نەفسی خۆی (واتە پەلەی كرد كە كاتی مردنی بێت ئارامی نەگرت لەسەر تاقی كردنەوەی من) بۆیە منیش بەهەشتم لەسەری حەرام كرد))

## كتابُ الحُدودِ - پەرتووكى سنوورى تاوانەكان

٣٤٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((قَدِمَ نَاسٌ مِنْ عُكْلٍ – أَوْ عُرَيْنَةَ – فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَ لَهُمْ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم بِلِقَاحٍ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا فَانْطَلَقُوا. فَلَمَّا صَحُّوا قَتَلُوا رَاعِيَ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ، فَجَاءَ الْخَبَرُ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ. فَلَمَّا ارْتَفَعَ النَّهَارُ جِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ بِهِمْ: فَقُطِّعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ، وَسُمِّرَتْ أَعْيُنُهُمْ، وَتُرِكُوا فِي الْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ، فَلا يُسْقَوْنَ. قَالَ أَبُو قِلابَةَ: فَهَؤُلاءِ سَرَقُوا وَقَتَلُوا وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ، وَحَارَبُوا اللهَ وَرَسُولَهُ)) [1].

اجْتَوَيْتَ البِلادَ إذا كرهْتَها وإنْ كانتْ مُوافِقَةً. واسْتَوْبَأْتَها إذا لم تُوافِقْكَ.

واتە: لە ئەنەسى كوڕى مالیكەوە (ڕەزاى خواى لێبێ) دەڵێ: ((خەڵكانێك لە هۆزی " عُكْل " یاخود " عُرَيْنَة " هاتن بۆ مەدینە كەش و هەواى مەدینەیان پێنەكەوت نەخۆش كەوتن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێكردن كە بچن بۆلاى وشترە شیر دەرەكان وە فەرمانی پێكردن كە لە شیر و میزی وشترەكان بخۆن ئەوانیش ڕۆیشتن، كاتێك كە چاك بوونەوە شوانەكەی پێغەمبەریان (ﷺ) كوشت و وشترەكانیشیان برد لەگەڵ خۆیاندا، جا لەسەرەتای ڕۆژدا هەواڵ هات، پێغەمبەر (ﷺ) چەند كەسێكی نارد بۆ گرتنیان كاتێك كە ڕۆژ بەرز بۆوە هێنایانن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كرد دەست و قاچیان بڕن بە پێچەوانەوە (واتە دەستی ڕاستیان و قاچی چەپیان) دەست و قاچیان بڕدرا وە چاویشیان كوێر كرا و لە حەڕڕە وازیان لێهێنان (كە حەڕڕە ناوچەیەكە لە دەرەوەی مەدینە زەویەكەی بەردی ڕەشی بەسەرەوەیە) داوای ئاویان دەكرد ئاویان نەدەدرایە))

---

١ أخرجه الجماعة : البخاري (٢٣٣) (١٥٠١) (٣٠١٨) (٤١٩٢) (٥٧٢٧) (٦٨٠٤) مسلم (١٦٧١/١١،١٠،٩)

ئەبو قیلابە (ڕەحمەتی خـوای لێبـێ) دەڵـێ:ئـەو کۆمەڵـە دزییـان کـرد وە پیاویـان کوشـت وە بێبـاوەڕیش بـوون دوای بـاوەڕ هێنـان وە شەڕیشیان کـرد لەگـەڵ خـوادا و پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) بۆیە وایان لێکرا.

٣٤٤ – عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنهما، قَالا: ((إنَّ رَجُلاً مِنَ الأعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْشُدُك اللهَ إلاَّ قَضَيْتَ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ. فَقَالَ الْخَصْمُ الآخَرُ – وَهُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ – نَعَمْ، فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ، وَأْذَنْ لِي. فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : قُلْ، فَقَالَ: إنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفاً عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْت مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ، الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ عَلَيْك وَعَلَى ابْنِك جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ. وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ – لِرَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ – عَلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنْ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا، فَغَدَا عَلَيْهَا، فَاعْتَرَفَتْ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَرُجِمَتْ)) [1].

العَسيفُ: الأجيرُ.

واتـە: لـە عوبەیـدەڵڵای کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی عوتبـەی کـوڕی مەسـعودەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەویش لە لە ئەبوهورەیرە وزەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیـەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) وتویانە: پیاوێك لە دەشتەکیەکان هات بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خوا (ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوات لێدەکەم بە خوا کە حوکم بکەیت لە نێوانماندا بە کتێبی خوا. کەسی دوەمیش وتی کە لەم هۆشمەنـد تـر بـوو بـەڵێ حـوکم بکە لە نێوانماندا بە کتێبی خوا وە مۆڵەتیـشم بـدە. پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: بڵـێ،

---

١ البخاري (٢٦٩٥) (٢٦٩٦) (٢٧٢٤) (٢٧٢٥) (٧١٩٣) (٧١٩٤) (٧٢٦٠) مسلم (١٦٩٧) (١٦٩٨)

وتى: كوڕەكەی من كرێكاری ئەمە بوو زینای كردووە لەگەڵ ژنەكەیدا، وە منیش هەواڵم پێدراوە كە كوڕەكەم بەرد بارانی لەسەرە منیش كوڕەكەم ئازاد كرد بە سەد سەر مەڕو كەنیزەكێك ئینجا پرسیارم كرد لە زانایان هەواڵیان پێدام كە كوڕەكەم دەبێت سەد داری لێبدرێت و ساڵێكیش دوور بخرێتەوە، وە ژنەكەی ئەویش دەبێت بەرد باران بكرێت. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە بە كتێبی خوا حوكمی نێوانتان دەكەم، كەنیزەكەكەو مەڕەكان دەگەڕێتەوە بۆ تۆ وە لەسەر كوڕەكەتە سەد دار و دوور خستنەوەی ساڵێك، وە ژنەكەی ئەویش بەرد بارانی لەسەرە، تۆش ئەی ئونەیس (كە پیاوێك بوو لە هۆزی ئەسلەم) بڕۆ بۆلای ژنی ئەمە، ئەگەر دانی پیادانا ئەوا بەرد بارانی بكە)).

ئونەیسیش هات بۆلای و ژنەكەش دانی نا بەتاوانەكەیدا، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی كردو بەردباران كرا.

العَسيفُ: واتە كرێكار.

٣٤٥ – عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنهما قَالا: ((سُئِلَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم عَنِ الأَمَةِ إِذَا زَنَتْ وَلَمْ تُحْصَنْ؟ قَالَ: إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ بِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ)) [١].

قالَ ابنُ شِهابٍ: " ولاأدري، أَبَعْدَ الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعةِ ". والضَّفيرُ: الحَبْلُ.

واتە: لە عوبەیدەڵڵای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عوتبەی كوڕی مەسعودەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەویش لە ئەبوهورەیرە وزەیدی كوڕی خالیدی جوهەنیەوە

١ البخاري (٢١٥٣) (٢١٥٤) (٢٢٣٢) (٢٢٣٣) (٢٥٥٥) (٢٥٥٦) (٦٨٣٧) (٦٨٣٨) مسلم (١٧٠٣/٣٢) (١٧٠٤/٣٣)

(ڕەزای خوایان لێبێ) وتویانە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە کەنیزەکێك ئەگەر زینا بکات بەلام شووی نەکردبێت؟ فەرمووی: ئەگەر زینای کرد ئەوا داری حەدی لێبدەن، بەس نیوەی کەسی ئازاد چونکە ئەو کەنیزەکە ـ وەرگێڕ) پاشان ئەگەر زینای کرد ئەوا داری حەدی لێبدەن، پاشان ئەگەر زینای کرد ئەوا داری حەدی لێبدەن وە بیفرۆشن گەر بە گوریسێکیش بووە)). الضَّفيرُ: واتە: گوریس.

ابنُ شِهابٍ: دەڵێ:، نازانم لەدوای سێیەم جار یاخود چوارەم جار فەرمووی بیفرۆشن.

٣٤٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: ((أَتَى رَجُلٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ – فَنَادَاهُ: فَقَالَ يَا رَسُولَ اللهِ، إنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ. فَتَنَحَّى تِلْقَاءَ وَجْهِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، حَتَّى ثَنَّى ذَلِكَ عَلَيْهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ. فَلَمَّا شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ: دَعَاهُ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم، فَقَالَ: أَبِكَ جُنُونٌ؟ قَالَ: لا. قَالَ: فَهَلْ أُحْصِنْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ))[1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مزگەوتدا بوو پیاوێك لە موسوڵمانان هات بۆ خزمەتی، بانگی کرد وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من زینام کردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتی تێکرد ((ڕووی لێوەگێڕا))، ڕووی کردە ڕووی پێغەمبەرو (ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من زینام کردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتی تێکرد، هەتا چوار جار پێی دووبارە کردەوە، کاتێك کە چوار جار شایەتی لەسەر خۆی دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کرد و فەرمووی: ئایە تۆ شێت نیت؟ وتی نەخێر، فەرمووی: ئایە ژنت هەیە؟ وتی بەڵێ، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بیبەن بەرد بارانی بکەن)).

[1] البخاري (٥٢٧١) (٦٨١٥) (٦٨٢٥) مسلم (١٦٩١/١٦)

٣٤٧ ـ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ. أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يَقُولُ " كُنْتُ فِيمَنْ رجَمَهُ، فَرَجَمْنَاهُ بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ هَرَبَ، فَأَدْرَكْنَاهُ بِالْحَرَّةِ، فَرَجَمْنَاهُ"[1].

الرَّجُلُ هو ماعزُ بنُ مالكٍ. وروَى قِصَّتَهُ جابرُ بنُ سَمُرَةَ وعَبْدُ اللهِ بنُ عَباسٍ وأبو سعيدٍ الخُدْرِيُّ وبُرَيْدَةُ بنُ الحُصَيْبِ الأسْلَمِيُّ.

واته: ابْنُ شِهَاب: (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ:سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان (ڕەحمەتی خوای لێبێ) هەواڵی پێدام کە گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵلا بووە (ڕەزای خوای لێبێ) وتویەتی من یەکێك بووم لەوانەی کە بەرد بارانم دەکرد لە " الْمُصَلَّى ـ کە شوێنی نوێژی جەژن و نوێژەبارانەو ئەم جۆرە شتانەیە " بەرد بارانمان کرد کاتێك کە بەردەکانی بەر کەوت و ئازاری پێگەشت ڕای کرد لە حەڕڕە پێی گەشتینەوە بەرد بارانمان کردەوە

جا ئەو پیاوە " ماعزی کوڕی مالیکە (ڕەزای خوای لێبێ) " چیرۆکەکەشی ئەم هاوەڵانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گێڕاویانەتەوە "جابرُ بنُ سَمُرَةَ وعَبْدُ اللهِ بنُ عَباسٍ وأبو سعيدٍ الخُدْرِيُّ وبُرَيْدَةُ بنُ الحُصَيْبِ الأسْلَمِيُّ. رضي الله عنهم "

٣٤٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّهُ قَالَ: ((إنَّ الْيَهُودَ جَاءُوا إلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَذَكَرُوا لَهُ: أَنَّ امْرَأَةً مِنْهُمْ وَرَجُلاً زَنَيَا. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ، فِي شَأْنِ الرَّجْمِ؟ فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ. قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلامٍ: كَذَبْتُمْ، إنَّ فِيهَا آيَةَ الرَّجْمِ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا، فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ فَقَرَأَ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا. فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلامٍ: ارْفَعْ يَدَكَ. فَرَفَعَ يَدَهُ، فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَالَ: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ، فَأَمَرَ بِهِمَا النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فَرُجِمَا. قَالَ: فَرَأَيْت الرَّجُلَ: يَجْنَأُ عَلَى الْمَرْأَةِ يَقِيهَا الْحِجَارَةَ))[2].

---

١ انظر الحديث السابق .

٢ البخاري (٤٥٥٦) (٦٨٤١) مسلم (١٦٩٩)

قَالَ رضي الله عنه: الذي وضع يدَهُ على آيةِ الرَّجْمِ عبدُ اللهِ بنُ صُوريا.

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((جوولەکەکان هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان وت کە پیاو و ژنێك لەوان زینایان کردووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: چی شك دەبەن دەربارەی بەرد باران لە تەوراتدا؟ وتیان، ئابڕوویان دەبەین و دار کاری دەکرێن. عەبدوڵلای کوڕی سەلام (ڕەزای خوای لێبێ) وتی، درۆتان کرد لە تەوراتدا ئایەتی بەرد باران کردنی تێدایە ئینجا تەوراتیان هێناو کردیانەوە، یەکێکیان دەستی خستە سەر ئایەتی بەرد باران کردنەکە وە ئەم سەرو ئەو سەری ئایەتەکەی خوێندەوە، عەبدوڵلای کوڕی سەلام (ڕەزای خوای لێبێ) پێی وت، دەستت بەرز کەرەوە، دەستی بەرز کردەوە ئایەتی بەرد باران کردنی تیادا بوو، کابرای جوولەکە وتی: عەبدوڵلای کوڕی سەلام (ڕەزای خوای لێبێ) ڕاستی کرد ئەی موحەمەد (ﷺ) ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردن بەرد باران کران. عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پیاوەکەم دی خۆی دەدایە بەر بەردەکان ئافرەتەکەی دەپاراست لەبەردەکان)).

عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئەو کەسەی دەستی دانا لەسەر ئایەتی بەرد باران کردنەکە عبدُ اللهِ بنُ صُوريا بوو.

٣٤٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه –: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لَوْ أَنَّ رَجُلاً – أَوْ قَالَ: امْرَأً – اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنِكَ، فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ: مَا كَانَ عَلَيْك جُنَاحٌ)) [1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((ئەگەر پیاوێك یاخود فەرمووی: ئەگەر کەسێك سەیرت بکات بەبێ مۆڵەتی خۆت (واتە لەسەر دەرگاوە یاخود لە ژێریەوە یاخود لەکونی دەرگاوە) جا تۆ بەردێکی پێوە بنێیت چاوی دەربێنیت هیچ تاوان و خوێنت لەسەر نییە)).

---

١ البخاري (٦٨٨٨) (٦٩٠٢) مسلم (٢١٥٨/٤٤)

## بابُ حَدِّ السَّرِقَةِ - بەشی سزای دزی کردن

٣٥٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله تعالى عنهما: ((أَنَّ النَّبِيَّ – صلَّى الله عليه وسلم قَطَعَ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلاثَةُ دَرَاهِمَ)) [1]. وَفِي لَفْظٍ: ((ثَمَنُهُ – ثَلاثَةُ دَرَاهِمَ)).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (( پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی یەکێك لەسەر قەڵغانێك کە بەهاکەی سێ درهەمە)).

وە لەدەربڕینێکی تردا: هاتووە کە نرخەکەی سێ درهەم بوو.

٣٥١ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((تُقْطَعُ الْيَدُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً)) [2].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە فەرموویەتی: ((دەست دەبڕدرێت لە چوار یەکی دینارێك بەرەو سەر)).

ڕوونکردنەوە: لە چوار یەکی دینارێکی ئاڵتونی و بەرەو سەر وە سێ درهەمی زیوی لەو سەردەمەدا بەرامبەر چوار یەکی دینارێکی ئاڵتونی بووە.

---

١ البخاري (٦٧٩٥) (٦٧٩٦) (٦٧٩٧) (٦٧٩٨) مسلم (١٦٨٦)

٢ البخاري (٦٧٩١) مسلم (١٦٨٤)

## بابُ في إنكار الشفاعة في الحدود والنهي عنها
## بەشی ڕێگری کردن لە تکاکردن لە سزای سنورەکان و قەدەغەکردن لێی

٣٥٢ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ((أَنَّ قُرَيْشاً أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم؟ فَقَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ: أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ؟ ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إذَا سَرَقَ فِيهِمْ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَأَيْمُ اللهِ: لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)) [١].

وَفِي لَفْظٍ ((كَانَتْ امْرَأَةٌ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ وَتَجْحَدُهُ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم بِقَطْعِ يَدِهَا)) [٢].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((هۆزی قورەیش نیگەرانی کردن حاڵی ئەو ئافرەتە مەخزومییەی کە دزی کردبوو، وتیان کێبێت قسەی تیادا بکات لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ)؟ وتیان، جا کێ دەوێرێت قسەی لەسەر بکات جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید نەبێت (ڕەزای خوایان لێبێ)؟ خۆشەویستی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئوسامەش قسەی لەسەر کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: تکا دەکەیت بۆ لابردنی سزایەك لە سزاکانی خوا؟ پاشان هەستا و وتاری خوێندەوە و فەرمووی: بێگومان ئەو گەلانەی پێش ئێوە تەنها بەوە لەناو چوون، ئەگەر کەسێکی ناودار و پایە دار دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا، بەڵام گەر کەسێکی لاواز و هەژار دزی

---

١ البخاري (٣٧٣٢) (٣٧٣٣) (٦٧٨٧) (٦٧٨٨) مسلم (١٦٨٨)

٢ مسلم (١٦٨٨/١٠)

بكردایه ئەوا سزایان لەسەر بەجێ دەكرد. سوێند بەخوا ئەگەر فاطمەی كچی موحەمەد دزی بكات دەستی دەبڕم)).

وه لەدەربڕینێكی تردا: دایكمان عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئافرەتێك شتی لە خەڵك دەخواست پاشان نوكوڵی لێدەكرد بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی كرد بەبڕینی دەستی)).

## بَابُ حَدِّ الْخَمْرِ - بەشی سزای مەی ( ئـارەق خواردنەوە )

٣٥٣ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم أُتِـيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الْخَمْرَ، فَجَلَدَهُ بِجَرِيدَةٍ نَحوَ أَرْبَعِينَ)) [١].

قَالَ: وَفَعَلَهُ أَبُو بَكْرٍ، فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ، إِسْتَشَارَ النَّاسَ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوفٍ رضي الله عنه ((أَخَفُّ الحُدُودِ، ثَمَانُونَ)). فَأَمَرَ بِهِ عُمَرُ " رضي الله عنه ".

واتە: لە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ:((پیاوێکیـان هێنـا بـۆلای پێغەمبـەر (ﷺ) عـارەقی خواردبـوو بـە پـەلکی دار خورمـا چـل شـۆڕکە داری لێدا)).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئیمامی ئەبو بەکریش (ڕەزای خـوای لێبـێ) هـەر وای کرد بەلاَم لەسەردەمی عومـەردا (ڕەزای خـوای لێبـێ) پـرس و ڕای کـرد بەخـەڵکی (واتە لەسەر لێدانی عارەق خۆر) عەبـدولڕەحمانی کـوڕی عـەوف (ڕەزای خـوای لێبـێ) وتی: سووکترینی سزاکان هەشتا دارە، (واتە لە قورئاندا لە تۆڵـەی سـزا لـە هەشـتا دار کەمتری تیادا نییە) جا عومەریش (ڕەزای خوای لێبێ) فەرمانی پێکرد.

---

١ البخاري (٦٧٧٣) (٦٧٧٦) مسلم (١٧٠٦) واللفظ لمسلم

# بَابُ التعزير - بەشی تەمێكردن

ئەم بەشە باس لەوە دەكات ئەگەر كەسێك كارێكی ناپەسەندی كرد وە سزاكەشی دیاری نەكرا بوو ئەوا ئیمام بەگوێرەی مەصڵەحەت و چاك بوونی ئەو كەسە سزای دەدات.

٣٥٤ – عَنْ أَبِي بُرْدَةَ هَانِئِ بْنِ نِيَارِ الْبَلَوِيِّ – رضي الله عنه –: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((لا يُجْلَدُ فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ إلاَّ فِي حَدّ مِنْ حُدُودِ اللهِ))[١].

واتە: لە ئەبو بوردەوە (ڕەزای خوای لێبێ) كە ناوی هانیئی كوڕی نیاری بەلەوییە: گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە(ﷺ) فەرموویەتی ((لەسەرو دە قامچیەوە لە كەس نادرێت مەگەر لە سنورێك لە سنورەكانی خوادا نەبێت (واتە لەسەرو دە دارەوە لەكەس نادرێت جگە لەو كەسە نەبێت كە سنورێكی شەرع دەبەزێنێت ئەویش بە گوێرەی سەر پێچێكە لێی دەدرێت))).

---

١ البخاري (٦٨٤٨) (٦٨٥٠) مسلم (١٧٠٨)

# كِتَابُ الأَيْمَانِ وَالنُّذُورِ- پەرتووكی سوێند خواردن و نەزرەكان

## بَابُ الأَيْمان - بەشی سوێندەكان

٣٥٥ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ، لا تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ، وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ)) [1].

واتە: لە عەبدولڕەحمانی كوڕی سەمورەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی عەبدولڕەحمانی كوڕی سەموره داوای دەسەڵات و بەرپرسیاریەتی مەكە، چونكە ئەگەر بە داوا كردن پێت ببەخشرێت ئەوا پێت دەسپێردرێت (واتە خوای گەورە یارمەتیت نادات) وە ئەگەر پێت ببەخشرێت بەبێ داوا كردن ئەوا یارمەتی دەدرێیت لەسەری وە ئەگەر سوێندد خوارد لەسەر شتێك وە شتێكت دیت لەو چاكتر، ئەوا كەفارەتی سوێندەكەت بدە و ئەوە بكە كە چاكترە)).

٣٥٦ – عَنْ أَبِي مُوسَى – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: ((إِنِّي وَاللهِ – إِنْ شَاءَ اللهُ – لا أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ، فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَتَحَلَّلْتُهَا)) [2].

واتە: لە ئەبی موساوە: (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سوێند بەخوا من ئەگەر خوا بیەوێت سوێند لەسەر شتێك ناخۆم پاشان باشتر لەو ببینم ئەوا دەچم كارە باشەكە دەكەم و كەفارەتی سوێندەكەم دەدەم)).

---

١ البخاري (٦٦٢٢) (٦٧٢٢) (٧١٤٦) (٧١٤٧) مسلم (١٦٥٢)

٢ البخاري (٣١٣٣) (٥٥١٨) (٦٦٢٣) (٦٦٤٩) (٦٦٨٠) (٦٧١٨) (٦٧٢١) مسلم (١٦٤٩/٩،٧)

٣٥٧ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ))[١].

وَلِمُسْلِمٍ: ((فَمَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بالله أَوْ لِيَصْمُتْ))[٢].

وَفِي رِوَايَةٍ قَالَ عُمَرُ " فَوَاللهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَنْهَى عَنْهَا، ذَاكِراً وَلا آثِراً "

(يعني: حاكياً عن غيري أنه حلفَ بها) [٣].

واته: له عومەری کوڕی خەطابـەوه: (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: ((خوای گەوره ڕێگریتان لێدەکات که سوێند به باوباپیرتان بخۆن)).

وه لەدەربڕینێکی تردا لەلای ئیمـامی موسـلیم: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((هەر کەسێك سوێندی خوارد ئەوا با سوێند به خوا بخوات یاخود بێدەنگ بێت)).

وه لـەدەربڕینێکی تـردا: عومـەر (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ:سـوێند بـەخوا لـەو کاتـەوەی کـه گـوێم لێبـووه پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) قەدەغـەی کـردووه سـوێندم پـێ نەخواردووه نه خۆم وه نه له زمانی خەڵکیشەوه (واته له خەڵکیشەوه نەم گێڕاوەتەوه که فلانەکەس ئاوا سوێندی خوارد))).

٣٥٨– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضـي الله عنـه – عَـنْ النَّبِـيِّ صلَّى الله عليـه وسـلم قَـالَ: ((قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُد عليهما السلام: لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى تِسْعِينَ امْـرَأَةً، تَلِـدُ كُـلُّ امْـرَأَةٍ مِنْهُنَّ غُلامًا يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقِيلَ لَهُ: قُلْ: إِنْ شَاءَ اللهُ، فَلَمْ يَقُـلْ، فَطَـافَ بِهِـنَّ، فَلَـمْ تَلِدْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ: نِصْفَ إِنْسَانٍ. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : لَـوْ

١ البخاري (٦٦٤٦) مسلم (١٦٤٦/١)

٢ البخاري (٦٦٤٦) مسلم (١٦٤٦/٣)

٣ البخاري (٦٦٤٧) مسلم (١٦٤٦/١)

قَالَ إنْ شَاءَ اللهُ لَمْ يَحْنَثْ، وَكَانَ دَركاً لِحَاجَتِـهِ))[١] . قولُـهُ: (فَقِيـلَ لَـهُ: قُـلْ: إنْ شَـاءَ اللهُ) يعني قالَ له المَلَكُ.

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە: (ڕەزای خوای لێبێ) ئەویش لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی ((سولەیمانی کوڕی داود (سەلامی خوایان لەسەر بێت) فـەرمووی: سـوێند بەخوا ئەم شەو دەبێت بچمە لای نەوەت لە خێزانەکانم، هەر یـەکێکیان کـوڕێکی ببێـت بجەنگێت لە پێناوی خوادا، جـا پێـی وتـرا بڵـێ " إنْ شَـاءَ اللهُ " نـەیوت، چـووە لایـان هیچیان منداڵی نەبوو جگە لە لەیەك ئافرەتیـان نـەبێت ئـەویش نیـوەی مرۆڤێکـی بـوو ئەبوهورەیرەوە: (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ئەگـەر بیوتایە " إنْ شَاءَ اللهُ " سوێندەکەی نەدەکەوت وە دەگەشت بە پێویستێکەشی)).

ئەو وتەیەی کە پێی وترا بڵێ " إنْ شَاءَ اللهُ " واتە: فریشتە وای پێ وت.

٣٥٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ – رضي الله عنـه – قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ صـلَّى الله عليه وسلم : ((مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، هُوَ فِيهَا فَاجِرٌ، لَقِيَ اللهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَـضْبَانُ)). وَنَزَلَـتْ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ آل عمران: ٧٧ إِلَى آخِرِ الآيَةِ "[٢] .

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((هەر کەسێك سـوێندێکی درۆ بخـوات بـۆ ئـەوەی مـاڵی موسـوڵمانێك بپچڕێت و بەدەستی بێنێت، وە لە سوێندەکەشیا درۆ بکات، کاتێك کە بـەخوای گـەورە دەگات لێی توڕەیە. وە ئـەم ئایەتـە دابـەزی ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ واتە: (بێگومان ئەو کەسانەی پەیمانی خۆیان لەگەڵ خواو، وە سـوێندەکانیان بەبەهایەکی کەم دەفرۆشن). جا لەو ئایەتەدا خوای گـەورە پێـنج جـۆر ئەشـکەنجەیان

---

١ البخاري (٣٤٢٤) مسلم (١٦٥٤/٢٤،٢٣،٢٢)

٢ البخاري (٦٦٧٦) مسلم (١٣٨)

دەدات. ١ـ ئەوانە هیچ بەشێکیان نییە لە دوارۆژدا، ٢ـ وە خوای گەورە گوفتاریان لەگەڵدا ناکات، ٣ـ بە چاوی سۆز و بەزەیش سەیریان ناکات، ٤ـ لە تاوانەکانیشیان پاکیان ناکاتەوە، واتە: فەرمانیان پێدەکات کە بچنە ئاگرەوە، ٥ـ وە سزایەکی زۆر بەئێشیشیان بۆهەیە.

٣٦٠ – عَنْ الأشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ خُصُومَةٌ فِي بِئْرٍ فَاخْتَصَمْنَا إلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ، قُلْتُ: إذاً يَحْلِفُ وَلا يُبَالِي. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، هُوَ فِيهَا فَاجِرٌ، لَقِيَ اللهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ)) [1].

واتە: لە ئەشعەسی کوڕی قەیسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:لە نێوان من پیاوێکدا ناکۆکیەك هەبوو دەربارەی بیرێك جا ناکۆکی و ئاژاوەکەمان بردە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: دوو شایەت دەهێنیت کە هی تۆیە یاخود ئەو سوێند بخوات کە هی ئەوە. وتم جا ئەو سوێند دەخوات و گوێشی پێ نادات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك سوێندێکی درۆ بخوات بۆ ئەوەی ماڵی موسوڵمانێك بپچڕێت و بەدەستی بێنێت، وە لە سوێندەکەشیا درۆ بکات، کاتێك کە بەخوای گەورە دەگات لێی توڕەیە)).

٣٦١ – عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ الأنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – أَنَّهُ بَايَعَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم تَحْتَ الشَّجَرَةِ، وَأَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الإِسْلامِ، كَاذِباً مُتَعَمِّداً، فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَيْسَ عَلَى رَجُلٍ نَذْرٌ فِيمَا لا يَمْلِكُ)) [2]. وَفِي رِوَايَةٍ: ((وَلَعْنُ الْمُؤْمِنِ

---

١ البخاري (٦٦٧٧) مسلم (١٣٨)

٢ البخاري (١٣٦٣) (٤١٧١) (٦٠٤٧) (٦١٠٥) (٦٦٥٢) مسلم (١١٠)

كَقَتْلِه))[١] . وَفِي رِوَايَةٍ: ((مَنِ ادَّعَى دَعْوَى كَاذِبَةً لِيَتَكَثَّرَ بِهَا، لَمْ يَزِدْهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ إلاَّ قِلَّةً))[٢] .

واته: له ثابتی كوڕی ضه‌حاكی ئه‌نصاریه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) كه‌ یه‌كێك بوو له‌وانه‌ی كه‌ به‌یعه‌تی دابوو به‌ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) له‌ (بیعة رضوان) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی: ((هه‌ر كه‌سێك سوێند بخوات جگه‌ له‌ میله‌تی ئیسلام (واته‌ بڵێت جووله‌كه‌بم یاخود كافر بم یاخود گاور بم ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ وابێت) درۆش بكات و به‌ قه‌ستیشی بێت، ئه‌وه‌ وه‌ك ئه‌وه‌ وایه‌ (واته‌ سوێندی خواردووه‌ ببێت به‌چی ده‌بێت) وه‌ هه‌ر كه‌سێك خۆی به‌چی بكوژێت له‌ڕۆژی دوایدا به‌وه‌ ئه‌شكه‌نجه‌ ده‌درێت، وه‌ له‌سه‌ر كه‌س واجب نییه‌ نه‌زرێك كه‌ خاوه‌نی نه‌بێت (واته‌ شتێك له‌سه‌ر خۆی نه‌زر بكات نه‌ هه‌یبێت وه‌ نه‌ ده‌سه‌لاتیشی به‌سه‌ریدا هه‌بێت))).

وه‌ له‌ده‌ربڕینێكی تردا ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی: ((نه‌فرین كردنی ئیماندار وه‌ك كوشتنی وایه‌)).

وه‌ له‌ده‌ربڕینێكی تردا ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی: ((هه‌ر كه‌سێك بانگه‌شه‌ بۆ شتێك بكات و تیایدا نه‌بێت بۆ ئه‌وه‌ی ماڵی پێ زیاد بكات، ئه‌وا خوای گه‌وره‌ كه‌می نه‌بێت بۆی زیاد ناكات)).

---

١ البخاري (٦٠٤٧) (٦١٠٥) (٦٦٥٢) مسلم (١١٠)

٢ مسلم (١١٠)

# بَابُ النَّذْر - بەشی نەزر

واتە: خێرێك یاخود كارێكی چاكە لەسەر خۆی پێویست بكات كە واجب نییە لەسەری.

٣٦٢ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: قُلْتُ: ((يَا رَسُولَ اللهِ، إنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أنْ أعْتَكِفَ لَيْلَةً)) – وَفِي رِوَايَةٍ: ((يَوْماً – فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ. قَالَ: فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ)) [١].

واتە: لە عومەری كوڕی خەطابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لەسەردەمی نەفامیدا پێویستم كرد لەسەر خۆم كە شەوێك (لەدەربڕینێكی تردا) ڕۆژێك لەمزگەتی مەككەدا بمێنمەوە، فەرمووی نەزرەكەت بەجێبێنە)).

٣٦٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم ((أنَّهُ نَهَى عَنِ النَّذْرِ، وَقَالَ: إنَّ النَّذْرَ لا يَأْتِي بِخَيْرٍ. وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنْ الْبَخِيلِ)) [٢].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەڵێ: ((كە ڕێگری كرد لە نەزر كردن، وە فەرمووی: بێگومان نەزر كردن خێری تیادا نییە، وە بەهۆی نەزرەوە لەكەسی بەخیل و ڕەزیلەوە ماڵ دەردەهێنرێت)).

٣٦٤ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((نَذَرَتْ أُخْتِي أنْ تَمْشِيَ إلَى بَيْتِ اللهِ الْحَرَامِ حَافِيَةً فَأَمَرَتْنِي أنْ أسْتَفْتِيَ لَهَا رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَاسْتَفْتَيْتُهُ فَقَالَ: لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ)) [٣].

---

١ البخاري (٢٠٣٢) (٢٠٤٣) مسلم (١٦٥٦)

٢ البخاري (٦٦٠٨) (٦٦٩٢) (٦٦٩٣) مسلم (١٦٣٩/٤)

٣ البخاري (١٨٦٦) مسلم (١٦٤٤)

واته: له عوقبه‌ی كوڕی عامره‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ:((خوشكه‌كه‌م نه‌زری كرد كه به‌پێی پەتی بڕوا بۆ مه‌ككه فه‌رمانی پێكردم كه پرسیاری له پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) بۆ بكه‌م، منیش پرسیارم لێكرد، فه‌رمووی: با به پێش بڕواو به سواریش)).

٣٦٥ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّـهُ قَـالَ: ((اسْـتَفْتَى سَـعْدُ بْـنُ عُبَـادَةَ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّـهِ، تُوُفِّـيَتْ قَبْـلَ أَنْ تَقْـضِيَهُ، فَقَـالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : فَاقْضِهِ عَنْهَا)) [١].

واته: له عه‌بدوڵڵای كوڕی عه‌باسه‌وه (ڕه‌زای خوایان لێبێ) ده‌ڵێ:((سه‌عدی كوڕی عوباده (ڕه‌زای خوای لێبێ) پرسیاری له پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) كرد ده‌رباره‌ی نه‌زرێك كه له‌سه‌ر دایكم بوو، مرد پێش ئه‌وه‌ی به‌جێی بێنێت، پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی: تۆ له‌بری ئه‌و به‌جێی بێنه)).

٣٦٦ – عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنـه – قَـالَ: ((قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ الله، إِنَّ مِـنْ تَوْبَتِي: أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي، صَدَقَةً إِلَى اللهِ وَإِلَى رَسُولِهِ فَقَـالَ رَسُـولُ اللهِ صلَّى الله عليـه وسلم : أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ)) [٢].

واته: له كه‌عبی كوڕی مالیكه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ:((وتم ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) من ده‌رباره‌ی ته‌وبه كردنه‌كه‌م ده‌مه‌وێت هه‌موو ماڵه‌كه‌م بكه‌م به‌خێر بۆلای خودا و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی (ﷺ) ، جا پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی: هه‌ندێك له ماڵه‌كه‌ت بهێڵه‌ره‌وه بۆ خۆت ئه‌وه بۆ تۆ باشتره)).

---

١ البخاري (٢٧٦١) (٦٦٩٨) (٦٩٥٩) مسلم (١٦٣٨)

٢ البخاري (٦٦٩٠) مسلم (٢٧٦٩)

## كِتَابُ الْقَضَاءِ - پەرتووكی دادوەری كردن كردن

٣٦٧ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)) [1].

وَفِي لَفْظٍ ((مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)) [2].

واته: لە دایكمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((هەر كەسێك شتێك لەم ئاینەی ئێمەدا دابێنێت و لەو نەبێت ئەوە ڕەت دەكرێتەوە))

وە لەدەربڕینێكی تردا: دەڵێ:پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ((هەر كەسێك كارێك بكات كە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە ڕەت دەكرێتەوە)).

٣٦٨ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((دَخَلَتْ هِنْدُ بِنْتُ عُتْبَةَ – امْرَأَةُ أَبِي سُفْيَانَ – عَلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، لا يُعْطِينِي مِنْ النَّفَقَةِ مَا يَكْفِينِي وَيَكْفِي بَنِيَّ، إلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْ مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمِهِ. فَهَلْ عَلَيَّ فِي ذَلِكَ مِنْ جُنَاحٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : خُذِي مِنْ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ مَا يَكْفِيكِ وَيَكْفِي بَنِيكِ)) [3].

واته: له دایكمان عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:هندی كچی عوتبە كە خێزانی ئەبی سوفیانە هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو سوفیان پیاوێكی ڕەزیل و چروكە ئەوەندەخەرجیم ناداتێ كە بەشی خۆم منداڵەكانم بكات، جگە لەوە نەبێت كە بەبێ ئەوەی ئەو پێی بزانێت لە ماڵەكەی

١ البخاري (٢٦٩٧) مسلم (١٧١٨)

٢ البخاري تعليقا كتاب البيوع (٦٠) مسلم (١٧١٨/١٨)

٣ البخاري (٢٢١١) (٢٤٦٠) (٥٣٥٩) (٥٣٦٤) (٥٣٧٠) (٧١٨٠) مسلم (١٧١٤)

دەیبەم، ئایە بەوە هیچ تاوانم لەسەرە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: لە ماڵەکەی بەرە بە چاکی ئەوەندەی بەشی خۆت و منداڵەکانت دەکات)).

٣٦٩ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم سَمِعَ جَلَبَةَ خَصمٍ بِبَابِ حُجْرَتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: أَلا إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّمَا يَأْتِينِي الْخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ، فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ، فَأَقْضِي لَهُ. فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطعَةٌ مِنْ نَارٍ، فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَذَرْهَا)) [1].

واتە: لە ئوم سەلەمەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لە غەڵبە غەڵبی چەند کەسێکی ناکۆك بوو لە بەردەم دەرگای ژوورەکەیدا، فەرمووی: دڵنیابن منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە، وە خەڵکانی ناکۆك و کێشە دار دێن بۆلای من، پێدەچێت هەندێکاتن زمان پاراو ترو قسەزان تر بێت لە هەندێکتان، گومان وادەبەم کە ڕاست گۆیە ئیتر حوکمی بۆ دەدەم و مافی دەدەمێ، جا هەر کەسێك بڕیارم بۆ دا مافی موسوڵمانێکم دایە ئەوە پارچەیەك لە ئاگری بۆ بڕیار دەدەم، جا هەڵیبگرێت یاخود وازی لێبێنێت)).

٣٧٠– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنهما قَالَ: ((كَتَبَ أَبِي – وْ كَتَبْتُ لَهُ – إِلَى ابْنِهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ وَهُوَ قَاضٍ بِسِجِسْتَانَ: أَنْ لا تَحْكُمْ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ. فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: لايَحْكُمْ أَحَدٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ)) [2].

وَفِي رِوَايَةٍ: ((لا يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ)).

واتە: لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:باوکم نامەی نووسی – وەنامەمەم بۆنوسی – بۆ کوڕەکەی کە ناوی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی بەکرەیە کە دادوەر بوو لە سجستان، کە دادگایی لە نێوان دوو کەسدا نەکەی لەکاتێکدا

---

١ البخاري (٢٦٨٠) (٦٩٦٧) مسلم (١٧١٣/٥)

٢ البخاري (٧١٥٨) مسلم (١٧١٧)

کەتۆ تورە بیت، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: با کەس دادگایی لە نێوان دوو کەسدا نەکات لەکاتێکدا کە تورە بێت)).

وە لەدەربڕینێکی تردا هاتووە کە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بە دڵنیایی با دادگایی نەکات دادوەر لە نێوان دوو کەسدا لەکاتێکدا کە تورە بێت)).

٣٧١ – عَنْ أَبِي بَكْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ – ثَلاثاً – قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: الإِشْرَاكُ بِاَللهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَكَانَ مُتَّكِئاً فَجَلَسَ، فَقَالَ: ألا وَقَوْلُ الزُّورِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ، فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ)) [1] .

واتە: لە ئەبی بەکرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ): ((سێ جار فەرمووی ئایە هەواڵتان نەدەمێ بە گەورەترین تاوانە گەورەکان؟ وتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دان، وە خواردنی مافی دایك و باوك، جا پێغەمبەر (ﷺ) پاڵی دابۆوە دانیشتو فەرمووی: ئاگاداربن قسەی درۆ و پڕو پوچ و شایەتی دانی درۆش، ئیتر هەر دەیوتەوە هەتا وتمان خۆزگایە بێدەنگ ببوایە)).

٣٧٢ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لادَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ، وَلَكِنْ الْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ)) [2] .

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر خەڵکی بە گوێرەی داوای خۆیان پێیان ببەخشرێت، ئەوا خەڵکانێك داوای خوێن و ماڵی کەسانێکی تریان دەکرد، بەڵام سوێند خواردن لەسەر داوا لەسەر کراوە)).

---

١ البخاري (٢٦٥٤) (٥٩٧٦) (٦٢٧٣) (٦٩١٩) مسلم (٨٧)

٢ البخاري (٤٥٥٢) مسلم (١٧١١)

## كِتَابُ الأَطْعِمَةِ - پەرتوكی خواردەمەنیەكان

٣٧٣ – عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ – رضي الله عنه – قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ – وَأَشَارَ (وَ فِي رِوَايَةٍ وَأَهْوَى) النُّعْمَانُ بِإِصْبَعَيْهِ إِلَى أُذُنَيْهِ –: ((إِنَّ الْحَلالَ بَيِّنٌ، وَ إِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ، لا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ، فَمَنْ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ: اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ: وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلا وَإِنَّ حِمَى اللهِ مَحَارِمُهُ، أَلا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ. أَلا وَهِيَ الْقَلْبُ)) [1].

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) دەیفەرموو: ئامارەی دەكرد وە لەدەربڕینێكی تردا نوعمان (ڕەزای خوای لێبێ) دوو پەنجەی برد بۆ گوێی (واتە بەگوێی خۆم گوێم لێی بووە): ((بێگومان حەلاڵ ڕوون و ئاشكرایە وە حەرامیش ڕوون و ئاشكرایە وە لە نێوانیاندا چەند شتێكی گوماناوی هەن زۆر لە خەڵكی نایان زانن، جا هەر كەسێك خۆی لە گوماناویەكان بپارێزێت ئەوا شەرەف و ئاینەكەی خۆی پاراستووە، هەر كەسیش بكەوێتە ناو شتە گوماناویەكانەوە ئەوە كەوتۆتە ناو حەرامەوە، وەك شوانێك ئاژەڵەكانی لە دەوری قەدەغە كراوێك دەلەوەڕێنێت نزیكە كە تێی بكەون، ئاگادارین هەموو پادشایەك سنوورێكی قەدەغە كراوی هەیە، ئاگادارین سنووری قەدەغە كراوەكانی خودا حەرام كراوەكانێتی، وە ئاگادارین لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر چاك بێت ئەوا جەستە هەمووی چاك دەبێت، وە ئەگەر خراپ بێت ئەوا جەستە هەمووی خراپ دەبێت، بزانن كەئەوەش بریتیە لە دڵە)).

---

١ البخاري (٥٢) (٢٠٥١) مسلم (١٥٩٩)

٣٧٤ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: ((أَنْفَجْنَا أَرْنَباً بِمَرِّ الظَّهْرَانِ فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغَبُوا، وَأَدْرَكْتُهَا فَأَخَذْتُهَا فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ، فَذَبَحَهَا وَبَعَثَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلم بِوَرِكِهَا أَوْفَخِذَيْهَا. فَقَبِلَهُ)) [١].

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((شوێن کەروێشکێك کەوتین له " مَرِّ الظَّهْرَانِ " ((شوێنێکه لەباکوری مەککە)) خەڵکەکە دوای کەوتن هیلاك بوون، بەڵام من پێی گەشتم و گرتم هێنام بۆ ئەبو طەڵحە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەویش سەری بڕی ئینجا سمتی یاخود ڕانەکانی نارد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەویش وەری گرت)).

٣٧٥ – عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه قَالَتْ: ((نَحَرْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلم فَرَسًا فَأَكَلْنَاهُ)) [٢]. وَفِي رِوَايَةٍ ((وَنَحْنُ بِالْمَدِينَةِ)) [٣].

واته: له ئەسمائی کچی ئەبی بەکرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەسپێکمان سەربڕی خواردمان)).

وه لەدەربڕینێکی تردا: ئەسماء (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((ئێمە لە مەدینە بووین)).

٣٧٦ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، وَأَذِنَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ)) [٤].

وَلِمُسْلِمٍ وَحْدَهُ قَالَ ((أَكَلْنَا زَمَنَ خَيْبَرَ الْخَيْلَ وَحُمُرَ الْوَحْشِ، وَنَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلم عَنْ الْحِمَارِ الأَهْلِيِّ)) [٥].

---

١ البخاري (٢٥٧٢) (٥٤٨٩) (٥٥٣٥) مسلم (١٩٥٣)

٢ البخاري (٥٥١٠) (٥٥١١) (٥٥١٢) (٥٥١٩) مسلم (١٩٤٢)

٣ البخاري (٥٥١١)

٤ البخاري (٥٥٢٠) مسلم (١٩٤١)

٥ مسلم (١٩٤١/٠٠٠)

واته: له جابرى كوڕى عەبدوڵلاوه (ڕەزاى خوايان لێبىَ) دەڵىَ:((پێغەمبەر (ﷺ) گۆشتى گوێدرێژى ماڵى قەدەغە كرد، وه مۆڵەتى دا به خواردنى گۆشتى ئەسپ)).

وه لەدەربڕینێكى تردا لەلاى ئیمامى موسلیم به تەنیا: جابرى كوڕى عەبدوڵلا(ڕەزاى خوايان لێبىَ) دەڵىَ:((لە كاتى جەنگى خەیبەردا گۆشتى ئەسپ و گوێدرێژى كێویمان دەخوارد، وه پێغەمبەر(ﷺ) گوێدرێژى ماڵى قەدەغە كرد)).

٣٧٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أبِي أوْفَى – رضي الله عنه – قَالَ: ((أصَابَتْنَا مَجَاعَةٌ لَيَالِيَ خَيْبَرَ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ: وَقَعْنَا فِي الْحُمُرِ الأهْلِيَّةِ، فَانْتَحَرْنَاهَا فَلَمَّا غَلَتْ بِهَا الْقُدُورُ: نَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلم أنْ أكْفِئُوا الْقُدُورَ، وَرُبَّمَا قَالَ: وَلا تَأْكُلُوا مِنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأهْلِيَّةِ شَيْئاً)) [1].

واته: له عەبدوڵلاى كوڕى ئەبى ئەفاوه (ڕەزاى خواى لێبىَ) دەڵىَ:((شەوانى خەیبەر برسێتیمان تووش بوو، جا كاتێك ڕۆژەكەى بوو، كەوتین بەسەر گوێدرێژە ماڵێكاندا سەرمان بڕین، كاتێك كەخەریك بوو گۆشتەكە لەناو مەنجەڵەكەدا دەكوڵاو پىَ دەگەیشت، بانگ خوازێكى پێغەمبەرى خوا(ﷺ) بانگى كرد، كە مەنجەڵەكان هەڵگێڕنەوه (واته گۆشتەكە بڕژێن) وه وتیشى: هیچ له گۆشتى گوێدرێژى ماڵى مەخۆن)).

٣٧٨ – عَنْ أبِي ثَعْلَبَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: ((حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلم لُحُومَ الْحُمُرِ الأهْلِيَّةِ)) [2].

واته: له ئەبى ثەعلەبەوه (ڕەزاى خواى لێبىَ) دەڵىَ: ((پێغەمبەرى خوا (ﷺ) گۆشتى گوێدرێژى ماڵى حەرام كرد)).

---

١ البخاري (٥٥٢٨) مسلم (١٩٣٧)

٢ البخاري (٥٥٢٧) مسلم (١٩٣٦)

٣٧٩ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((دَخَلْتُ أَنَا وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم بَيْتَ مَيْمُونَةَ، فَأُتِيَ بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم بِيَدِهِ، فَقَالَ بَعْضُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ: أَخْبِرُوا رَسُولَ اللهِ بِمَا يُرِيدُ أَنْ يَأْكُلَ فَقُلْتُ تَأْكُلُهُ؟ وَهُوَ ضَبٌّ! فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ – صلَّى الله عليه وسلم يَدَهُ فَلَمْ يَأْكُلْ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَحَرَامٌ هُوَ؟ قَالَ: لا، وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ، قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ، فَأَكَلْتُهُ. وَالنَّبِيُّ – صلَّى الله عليه وسلم – يَنْظُرُ إِلَيَّ)) [1]

المَحْنوذُ: المَشْوِيُّ بالرَّضِيفِ وهِيَ الحِجارةُ المُحْمَاة.

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((من و خالیدی کوڕی وەلید (ڕەزای خوای لێبێ) لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چووین بۆ ماڵی مەیمونە (ڕەزای خوای لێبێ)، بزن مژەیەکی برژاویان هێنا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی بۆ برد هەندێك لەو ئافرەتانەی کە لەماڵی مەیمونەدا بوون وتیان، هەواڵ بدەن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی ئەوەی کە دەیەوێت بیخوات، وتم، ناخۆیت؟ بزن مژەیە. ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی بەرز کردەوەو نەیخواد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەرامە بزن مژە؟ فەرمووی: نەخێر بەلاَم لە خاکی قەومەکەی مندا نەبووە بۆیە دەبینی دڵم ناچێتە سەری. خالید (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ڕامکێشا بۆلای خۆم و لەت لەتم کردوو خوادم پێغەمبەریش (ﷺ) سەیری دەکردم)).

المَحْنوذُ: واتە برژاو بە بەردی گەرم کراو.

٣٨٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى – رضي الله عنه – قَالَ: ((غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم سَبْعَ غَزَوَاتٍ، نَأْكُلُ الْجَرَادَ)) [2].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئەفاوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەوت جەنگمان کرد، کوللەمان دەخوارد)).

---

١ البخاري (٥٥٣٧) مسلم (١٩٤٥) (١٩٤٦)

٢ البخاري (٥٤٩٥) مسلم (١٩٥٢)

٣٨١ – عَنْ زَهْدَمِ بْنِ مُضَرِّبٍ الْجَرْمِيِّ قَالَ: ((كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ. فَدَعَا بِمَائِدَةٍ، وَعَلَيْهَا لَحْمُ دَجَاجٍ، فَدَخَلَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللهِ، أَحْمَرُ، شَبِيهٌ بِالْمَوَالِي فَقَالَ: لَهُ هَلُمَّ، فَتَلَكَّأَ فَقَالَ لَهُ: هَلُمَّ، فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَأْكُلُ مِنْهُ))[1].

واته: له زەهدەمی کوڕی موضەرریبی جەرمیەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ:((ئێمە لەخزمەت ئەبی موسای ئەشعەریدا بووین (ڕەزای خوای لێبێ) بانگی کرد سفرە داخەن، وە گۆشتی مریشکی لەسەر بوو، پیاوێکیش هاتە ژوورەوە لە هۆزی " تَيْمُ اللهِ " سوور بوو لە مەوالیەکان دەچوو، پێی وت: فەرموو وەرە، کابرا وەستا دوو دڵ بوو لە هاتن، پێی وتەوە: فەرموو وەرە، چونکە من پێغەمبەری خوادام (ﷺ) دیوە لێی خواردوە (واتە لە گۆشتی مریشك))).

٣٨٢ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلا يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا))[2].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر یەکێك لە ئێوە خواردنێکی خوارد با دەستی نەسڕێت هەتا دەیلێسێتەوە)).

---

١ البخاري (٥٥١٨) مسلم (١٦٤٩/٩)

٢ البخاري (٥٤٥٦) مسلم (٢٠٣١/١٣٠)

## بَابُ الصَّيْدِ - بەشی ڕاوكردن

٣٨٣ – عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ رضي الله عنه قَالَ ((أَتَيْتُ رَسُولَ الله صلَّى الله عليه وسلم فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ، أَفَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ؟ وَفِي أَرْضِ صَيْدٍ، أَصِيدُ بِقَوْسِي وَبِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، وَبِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ. فَمَا يَصْلُحُ لِي؟ قَالَ: أَمَّا مَا ذَكَرْتَ – يَعْنِي مِنْ آنِيَةِ أَهْلِ الْكِتَابِ –: فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَلا تَأْكُلُوا فِيهَا وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا، وَكُلُوا فِيهَا. وَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ، فَذَكَرْتَ اسْمَ الله عَلَيْهِ فَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ، فَذَكَرْتَ اسْمَ الله عَلَيْهِ فَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرِ الْمُعَلَّمِ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ)) [1].

واته: لە ئەبی ثەعلەبەی خوشەنیەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە لە زەوی گەلانێكداین خاوەن كتێبی ئاسمانین، ئایە لە قاپ و قاچاغی ئەواندا شت بخۆین؟ وە لەزەویەكی ڕاو كردنداین، بە كەوانەكەم ڕاو دەكەم وە بەو سەگەم فێرە ڕاو نییە وە بەو سەگەش كەوا فێرە ڕاوە، ئاگادارم بكە چی لەوانە بۆ من حەڵاڵ؟ فەرمووی: ئەوی كە باست كرد واتە لە قاپ و قاچاغی خاوەن كتێبە ئاسمانیەكان ئەگەر جگە لە هی ئەوانتان دەست كەوت ئەوە لە هی ئەواندا مەیخۆن، وە ئەگەر دەستتان نەكەوت ئەوە بیشۆن ئینجا تیایدا بیخۆن، وە ئەوەی بە كەوانەكەت ڕاوت كرد و ناوی خوات لەسەر هێناوە بیخۆ، وە ئەوەی بە سەگە فێرە ڕاوەكەت ڕاوت كرد ناوی خوات لەسەر هێنا بیخۆ، وە ئەوەی كە بە سەگە فێرنەكراوەكەت ڕاوی دەكەیت ئەگەر فریای سەر بڕینی كەوتی بیخۆ)).

---

١ البخاري (٥٤٩٦) (٥٤٧٨) (٥٤٨٨) مسلم (١٩٣٠)

٣٨٤ – عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: ((قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، إنِّي أُرْسِلُ الْكِلابَ الْمُعَلَّمَةَ، فَيُمْسِكْنَ عَلَيَّ، وَأَذْكُرُ اسْمَ الله؟ فَقَالَ: إذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ وَذَكَرْتَ اسْمَ الله، فَكُلْ مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ. قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلْنَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلْنَ، مَا لَمْ يَشْرَكْهَا كَلْبٌ لَيْسَ مِنْهَا. قُلْتُ: فَإِنِّي أَرْمِي بِالْمِعْرَاضِ الصَّيْدَ، فَأُصِيبُ؟ فَقَالَ: إذَا رَمَيْتَ بِالْمِعْرَاضِ فَخَرَقَ، فَكُلْهُ وَإِنْ أَصَابَهُ بِعَرْضِهِ فَلا تَأْكُلْهُ))[1].

واته: له هەمامی کوڕی حارثەوه (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەویش لە عەدی کوڕی حاتەمەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من سەگی فێرە ڕاو دەنێرم بۆ نێچیرگرتن بۆم دەگرن و ناوی خوا دەهێنم، فەرمووی: کاتێك سەگە فێرە ڕاوەکەت نارد وە ناوی خوات لەسەر هێنا ئەوا ئەوەی بۆی گرتی بیخۆ. وتم: ئەگەر کوشتیشیان؟ فەرمووی: ئەگەر کوشتیشیان مادەم سەگێکی تری فێر نەکراو لەگەڵیدا بەژداری نەکەن، وتم: من نەقیزەکەم دەگرمە نێچیرەکەو دەشی پێکم؟ فەرمووی: ئەگەر نەقیزەکەت تێگرت و کونی کرد ئەوا بیخۆ وە ئەگەر بە باری پانی پێکای ئەوا مەیخۆ)).

٣٨٥ – وَحَدِيثُ الشَّعْبِيِّ عَنْ عَدِيِّ نَحْوُهُ، وَفِيهِ: ((إلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَإِنْ أَكَلَ فَلا تَأْكُلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ. وَإِنْ خَالَطَهَا كِلابٌ مِنْ غَيْرِهَا فَلا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ)).

وَفِيهِ ((إذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُكَلَّبَ " الْمُعَلَّمَ " فَاذْكُرْ اسْمَ الله عَلَيْهِ، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيّاً فَاذْبَحْهُ، وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قَتَلَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ فَكُلْهُ، فَإِنَّ أَخْذَ الْكَلْبِ ذَكَاتُهُ))

١ البخاري (٥٤٧٦) مسلم (١٩٢٩)

وَفِيهِ أَيْضًا ((إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فَاذْكُرْ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ)) وَفِيهِ ((وَإِنْ غَابَ عَنْكَ يَوْماً أَوْ يَوْمَيْنِ)).

وَفِي رِوَايَةٍ ((الْيَوْمَيْنِ وَالثَّلاثَةَ فَلَمْ تَجِدْ فِيهِ إِلاَّ أَثَرَ سَهْمِكَ فَكُلْ إِنْ شِئْتَ، فَإِنْ وَجَدْتَهُ غَرِيقاً فِي الْمَاءِ فَلا تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ لا تَدْرِي: الْمَاءُ قَتَلَهُ، أَوْ سَهْمُكَ)) [١].

واته: له فه‌رمووده‌ی شه‌عبیدا (ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێ) له عه‌دییه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێ) وه‌ك ئه‌م فه‌رمووده‌یه وه تیایدا هاتووه كه پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ((مه‌گه‌ر سه‌گه‌كه لێی بخوات، ئه‌گه‌ر خواردی تۆ مه‌یخۆ چونكه من ده‌ترسم بۆخۆی گرتبێت، وه ئه‌گه‌ر جگه له خۆی سه‌گی كه‌ی له‌گه‌ڵدا تێكه‌ڵ بوو ئه‌وا مه‌یخۆ چونكه تۆ ناوی خوات له‌سه‌ر سه‌گه‌كه‌ی خۆت بردووه ناوی خوات له‌سه‌ر هی كه نه‌بردووه. وه له‌م فه‌رمووده‌یه‌دایه كه پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: كاتێك سه‌گه فێر كراوه‌كه‌ت نارد نێچیرت بۆ بگرێت ئه‌وا ناوی خوای له‌سه‌ر بێنه، ئه‌گه‌ر نێچیری بۆ گرتیت و پێی گه‌شتیت به زیندویی ئه‌وا سه‌ری ببڕه، وه ئه‌گه‌ر پێی گه‌شتیت و كوشتبوی وه لێی نه‌خواردبوو ئه‌وا بیخۆ چونكه گرتنی سه‌گ سه‌ربڕینێتی. وه تیایدا هاتووه: ((كه فه‌رموویه‌تی: كاتێك تیره‌كه‌ت نا به نێچیرێكه‌وه ناوی خوای له‌سه‌ر بێنه)). وه تیایدا هاتووه: كه فه‌رموویه‌تی: ((ئه‌گه‌رچیش نێچیرێكه‌ت لێ وون بوو ڕۆژێك یاخود دوو ڕۆژ))، وه له‌ده‌ربڕینێكی تردا: ( دوو ڕۆژ وه سێ ڕۆژ هیچ هۆكارییێكی كوشتنت پێوه نه‌دیه‌وه جگه له شوێن تیره‌كه‌ی خۆت نه‌بێت ئه‌گه‌ر ویستت بیخۆ، وه ئه‌گه‌ر دۆزیته‌وه له ناو ئاودا خنكا بوو ئه‌وا مه‌یخۆ چونكه تۆ نازانیت ئاوه‌كه كوشتێتی یاخود تیره‌كه‌ی تۆ))).

---

١ البخاري (١٧٥) (٢٠٥٤) (٥٤٧٥) (٥٤٧٦) (٥٤٧٧) (٥٤٨٣) (٥٤٨٤) (٥٤٨٦) (٥٤٨٧) (٧٣٩٧) مسلم (١٩٢٩/٢،٧،٥،٣).

٣٨٦- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ ((مَنْ اقْتَنَى كَلْباً – إلاَّ كَلْبَ صَيْدٍ، أَوْ مَاشِيَةٍ – فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ)) [1]. قَالَ سَالِمٌ: وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقُولُ: ((أَوْ كَلْبَ حَرْثٍ))، وَكَانَ صَاحِبَ حَرْثٍ " [2].

واته: لـه سـالمی كـوڕی عەبدوڵڵای كـوڕی عومـەرەوە ئـەويش لـه بـاوكيەوە (ڕەزای خوايان لێبێ) دەڵێ:گوێم له پێغەمبەری خـوا (ﷺ) بـوو دەيفـەرموو: ((هـەر كەسـێك سەگێك ڕابگرێت جگه له سـەگی ڕاو و شـوانی نـەبێت ئـەوا هـەموو ڕۆژێـك بەئەنـدازەی دووشاخی وەكو شاخی ئوحود له چاكەكانی كەم دەكات)). سـالم دەڵـێ:ئـەبوهورەيرە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەيـوت: يـاخود سـەگی كـشتوكاڵ " چـونكه ئـەبوهورەيرە (ڕەزای خوای لێبێ) خۆی خاوەن كشتوكاڵ بوو.

٣٨٧ – عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم بِذِي الْحُلَيْفَةِ مِنْ تِهَامَةَ، فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ فَأَصَابُوا إبِلاً وَغَنَماً، وَكَانَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم فِي أُخْرَيَاتِ الْقَوْمِ، فَعَجِلُوا وَذَبَحُوا وَنَصَبُوا الْقُدُورَ فَأَمَرَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ فَعَدَلَ عَشَرَةً مِنْ الْغَنَمِ بِبَعِيرٍ، فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ، وَكَانَ فِي الْقَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ فَأَهْوَى رَجُلٌ مِنْهُمْ بِسَهْمٍ، فَحَبَسَهُ اللهُ. فَقَالَ: إنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا نَدَّ عَلَيْكُمْ مِنْهَا فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا، قُلْتُ: يَا رَسُولُ اللهِ، إنَّا لاقُو الْعَدُوِّ غَداً، وَلَيْسَ مَعَنَا مُدىً. أَفَنَذْبَحُ بِالْقَصَبِ؟ قَالَ: مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ، فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، أَمَّا السِّنُّ: فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ: فَمُدَى الْحَبَشَةِ)) [3].

---

١ البخاري (٥٤٨١) مسلم (١٥٧٤/٥١)

٢ مسلم (١٥٧٤/٥٤)

٣ البخاري (٣٠٧٥) (٢٤٨٨) (٢٥٠٧) (٥٥٠٩) (٥٥٤٣) (٥٥٤٤) مسلم (١٩٦٨)

واته: له ڕافعی کوڕی خەدیجەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین (ﷺ) له " ذي الْحُلَيْفَةِ " كه له " تِهَامَةَ " یه خەڵکی تووشی برسێتی بوون وە وشتر و مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان بەدەست هێنا (واتە هی جەنگ) وە پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆتایی خەڵکەکەوە بوو، پەلەیان کرد ئاژەڵیان سەربڕی و مەنجەڵیان لەسەر ئاگر دانا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بەوەی لەناو مەنجەڵەکاندایە بیڕژن، پاشان بەشی کرد، دە وشتری لە بەرامبەر دە مەڕ دانا (واتە ئەوەی وشترێکی بکەوتایە بەرامبەرەکەی دە مەڕی دەدایە) جا وشترێکیان یاخی بوو دوای کەوتن بە هیلاکی بردن وە لەناو خەڵکەکەدا ئەسپێکی کەم هەبوو، ئنجا پیاوێکیان تیرێکی پێوەنا، خوای گەورە ڕای گرت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەم ئاژەڵانە یاخی بوونێکیات تێدایە وەك یاخی بوونی کێوێکان هەرکام لەوانە لێتان یاخی بوو ئاوای لێبکەن، دەڵێ: وتم پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە سبەینێ بە دوژمن دەگەین وە چەقۆمان پێ نییە ئایە بە قامیش حەیوان سەربڕین؟ فەرمووی: هەر شتێك فیشقە بە خوێن بکات و ناوی خوای لەسەر هێنرابێت بیخۆن، جگە لە ددان و نینۆك نەبێت، وە پێتان دەڵێم ئەوانە بۆ نابن چونکە ددان ئێسقانە وە نینۆکیش چەقۆی حەبەشیەکانە)).

## بَابُ الأَضَاحِيَ - بەشی قوربانی کردن

٣٨٨ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((ضَحَّى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلم بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى وَكَبَّرَ وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا))[1].

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دوو مەڕی بۆری شاخداری کرد به قوربانی، به دەستی خۆی سەری بڕی، ناوی خوای هێناو الله أكبری کردوو قاچی خسته سەر لامليان)).

١ البخاري (١٧١٢) مسلم (١٩٦٦)

# كِتَابُ الأَشْرِبَةِ - پەرتووكی خواردنەوەكان

٣٨٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أَنَّ عُمَرَ قَالَ – عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم – أَمَّا بَعْدُ، أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ وَهِيَ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنْ الْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ. وَالْخَمْرُ: مَا خَامَرَ الْعَقْلَ ثَلاثٌ وَدِدْتُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم كَانَ عَهِدَ إِلَيْنَا فِيهَا عَهْداً نَنْتَهِي إِلَيْهِ: الْجَدُّ، وَالْكَلالَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا)) [١].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:عومەر(ڕەزای خوای لێبێ) لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی خەڵكینە كاتێك كە حەرام كردنی ئارەق دابەزی كە لە پێنج شتە: لە ترێ و خورما و هەنگوین و گەنم و جۆ ـ ئارەقیش ئەوەیە كە عەقڵ دابپۆشێت (بێ هۆش بێ ئاگای بكات) وە سێ شت هەیە خۆزگە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆی ڕوون دەكردینەوە ڕوونكردنەوەیەك پێویستمان بە هیچ نەبوایە ١ـ بەشی باپیرە لە میراتدا. ٢ـ الْكَلالَةُ: واتە: كەسێك بمرێت نە باوك و دایكو نە منداڵی لەدوا جێنەمێنێت میراتی لێ ببەن. ٣ـ چەند بەشێك لە بەشەكانی سوو))

تێبینی وەرگێڕ: ئەوە نەبێت كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم سێ شتەی ڕوون نەكردبێتەوە بەڵكو ئەو وەفاتی نەكرد هەتا هەموو شەریعەتی گەیاندو ڕوونی كردەوە بەڵام شتی واهەیە لەسەر كەسێكی ئەم ئومەتە نادیارە بەڵام كەسێكی تر دەیزانێت وەك پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لێبێ).

---

١ البخاري (٤٦١٦) (٥٥٨١) مسلم (٣٠٣٢/٣٣)

٣٩٠ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ((أَنَّ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم سُئِلَ عَنْ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ)) [١].

قَالَ رضي الله عنه: الْبِتْعُ: نَبِيذُ الْعَسَلِ.

واته: له دایكمان عائیشەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پرسیار كرا له پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی عارەقی هەنگوین، فەرمووی: هەر خواردنەوەیەك سەرخۆش بكات ئەوە حەرامە)).

الْبِتْعُ: واته: عارەقی هەنگوین.

٣٩١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ((بَلَغَ عُمَرَ: أَنَّ فُلاناً بَاعَ خَمْراً فَقَالَ: قَاتَلَ اللهُ فُلاناً، أَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((قَاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ، حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ، فَجَمَلُوهَا فَبَاعُوهَا)) [٢].

واته: له عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوه (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:گەیشت به عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) كه فلانه كەس مەیی فرۆشتووه، فەرمووی: خودا بیكوژێت، ئایه نازانێت كه پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: خودا جولەكەكان بكوژێت و له سۆزی خۆی دەریان بكات، كاتێك كه خوای گەوره بەز و پیوی لێ حەرام كردن توانیانەوەو، فرۆشتیان)).

---

١ البخاري (٢٤٢) (٥٥٨٥) (٥٥٨٦) مسلم (٢٠٠١)

٢ البخاري (٢٢٢٣) (٣٤٦٠) مسلم (١٥٨٢)

# كِتَابُ اللِّبَاسِ - پەرتووكى پۆشاك

٣٩٢ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((لا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ مَنْ لَبِسَهُ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَةِ)) [1].

واتە: لە عومەری کوڕی خەطابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((پۆشاکی ئاوریشم لەبەر مەکەن، چونکە هەر کەسێك لە دونیادا لەبەری بکات لە دوا ڕۆژدا لەبەری ناکات)).

تێبینی وەرگێڕ: ئەم قەدەغە کردنە تایبەتە بە پیاوانەوە بەڵام بۆ ئافرەتان حەڵاڵە.

٣٩٣ – عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَقُولُ: ((لا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَلا الدِّيبَاجَ، وَلا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلا تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهِمَا، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ)) [2].

واتە: لە حوذەیفەی کوڕی یەمانەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: ((پۆشاکی ئاوریشم و دیباج (کە ئەویش جۆرێکە لە ئاو ریشم) لەبەرمەکەن، وە لە قاپ و قاچاغی زێڕ و زیودا مەخۆنەوە، وە لە قاپ قاچاغی زێڕ و زیودا خواردن مەخۆن، چونکە لە دونیادا بۆ ئەوانە (واتە بێ باوەڕەکانە) وە لە دواڕۆژدا بۆ ئێوەیە)).

---

١ البخاري (٥٨٣٤) مسلم (٢٠٦٩/١١)

٢ البخاري (٥٤٢٦) (٥٦٣٢) (٥٦٣٣) (٥٨٣١) مسلم (٢٠٦٧/٥)

٣٩٤- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ((نَهَى عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ إلاَّ هَكَذَا، وَرَفَعَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم إِصْبُعَيْهِ: السَّبَّابَةَ، وَالْوُسْطَى)) [1].

وَلِمُسْلِمٍ ((نَهَى رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ إلاَّ مَوْضِعَ إِصْبُعَيْنِ أَوْ ثَلاثٍ، أَوْ أَرْبَعٍ)) [2].

واته: له عومەری کوڕی خەطابەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) ((ڕێگری کرد له لەبەر کردنی ئاوریشم جگه له ئەونده نەبێت جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستی بۆمان بەرز کردەوه)).

وه لەدەربڕینێکی تردا: عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا(ﷺ) ((ڕێگری کرد له لەبەر کردنی ئاوریشم جگه له جێگەی دوو یاخود سێ یاخود چوار پەنجه نەبێت)).

٣٩٥- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم ، لَهُ شَعَرٌ يَضْرِبُ إِلَى مَنْكِبَيْهِ، بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، لَيْسَ بِالْقَصِيرِ وَلا بِالطَّوِيلِ)) [3].

واته: له بەرائی کوڕی عازیبەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((هیچ خاوەن قژێکم نەدیوه له جلێکی سووردا له پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوانتر بێت، قژێکی هەبوو دەیدا له شانی، ناو شانی پان بوو، نه درێژ بوو نه کەرتیش بوو)).

---

١ البخاري (٥٨٢٩) مسلم (٢٠٦٩/١٤)

٢ مسلم (٢٠٦٩/١٥)

٣ البخاري (٥٩٠١) مسلم (٢٣٣٧/٩٢)

٣٩٦ – عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ – رضي الله عنه – قَالَ: ((أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلم بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: ١ـ أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ ٢ـ وَاتِّبَاعِ الْجِنَازَةِ ٣ـوَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ ٤ـ وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ (أَوْ الْمُقْسِمِ) ٥ـ وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ ٦ـ وَإِجَابَةِ الدَّاعِي ٧ـ وَإِفْشَاءِ السَّلامِ. وَنَهَانَا ١ـ عَنْ خَوَاتِيمَ – أَوْ عَنْ التَّخَتُّمِ – بِالذَّهَبِ ٢ـ وَعَنْ الشُّرْبِ بِالْفِضَّةِ ٣ـ وَعَنْ الْمَيَاثِرِ ٤ـ وَعَنْ الْقَسِّيِّ ٥ـ وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ ٦ـ وَالإِسْتَبْرَقِ ٧ـوَالدِّيبَاجِ))[1] .

واته: له بەڕائی کوڕی عازیبەوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردین بە حەوت شت، وە ڕێگری لێکردین لە حەوت شت، فەرمانی پێکردین بە سەردانی نەخۆش، و شوێنکەوتنی جەنازە، و دوعای خێر بۆ پژمیو (واتە کاتێك پژمیو وتی الحمد لله تۆ بڵێیت یرحمك الله) وە پشتگیری سوێند خۆر (بۆ ئەوەی سوێندەکەی نەکەوێت بەڵام کاتێك سوێند خواردنەکەی بۆ تاوان کردن نەبێت) وە یارمەتیدانی ستەم لێکراو، و چوون بەدەم دەعوەتەوە، و سەلام بڵاو کردنەوە، وە ڕێگری لێکردین لە ئەنگوستیلەکان یاخود لە لەپەنجە کردنی ئەنگوستیلەی ئاڵتون، وە خواردنەوە لە دەفری زیودا، وە لە زینی ئاوریشم بۆ وڵاغەکان، وە لە پۆشاکی کەتان کە تێکەڵ بێت بە ئاوریشم، وە لە لەبەر کردنی ئاوریشم و " إِسْتَبْرَقُ، دِيبَاجُ " کە دوو جۆرن لە جۆرەکانی ئاوریشم کە زۆر بەنرخ و گرانن)).

٣٩٧ – عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلم اصْطَنَعَ خَاتماً مِنْ ذَهَبٍ، فَكَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ إِذَا لَبِسَهُ، فَصَنَعَ النَّاسُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَنَزَعَهُ فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتِمَ، وَأَجْعَلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ، فَرَمَى بِهِ ثُمَّ قَالَ: وَاَللهِ لا أَلْبَسُهُ أَبداً فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ))[2] .

---

١ البخاري (١٢٣٩) (٢٤٤٥) (٥١٧٥) (٥٦٣٥) (٥٦٥٠) (٥٨٤٩) (٥٨٦٣) (٦٢٢٢) (٦٢٣٥) مسلم (٢٠٦٦)

٢ البخاري (٥٨٦٥) (٥٨٦٧) (٥٨٧٦) (٦٦٥١) (٧٢٩٨) مسلم (٢٠٩١)

وَفِي لَفْظٍ ((جَعَلَهُ فِي يَدِهِ الْيُمْنَى)) [١].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی لە ئاڵتون دروست کردبوو، هەر کاتێك لە پەنجەی بکردایە یاقوتەکەی دەخستە ناو لەپیەوە جا خەڵکیش هەروەك ئەویان کرد، پاشان لەسەر مینبەرەکەی دانیشت و ئەنگوستیلەکەی داکەندوو فەرمووی: من پێشتر ئەم ئەنگوستیلەیەم دەکردە پەنجەم وە یاقوتەکەشیم دەخستە دیوی لەپی دەستمەوە، جا فرێی داو فەرمووی: سوێند بەخوا هەرگیز لە پەنجەی ناکەم، خەڵکیش ئنگوستیلەکانیان فرێدا)).

وە لەدەربڕینێکی تردا: عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردیە دەستی ڕاستی)).

---

١ البخاري (٥٨٧٦) مسلم (٢٠٩١/٠٠٠)

# كتابُ الجهادِ - پەرتووكی جیهاد و تێكۆشان

٣٩٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى – رضي الله عنه –: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ – انْتَظَرَ، حَتَّى إِذَا مَالَتِ الشَّمْسُ قَامَ فِيهِمْ، فَقَالَ: ((أَيُّهَا النَّاسُ، لا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَاسْأَلُوا اللهَ الْعَافِيَةَ فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلالِ السُّيُوفِ ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، وَمُجْرِيَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الأَحْزَابِ: اهْزِمْهُمْ، وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ))[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی ئەفاوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەو ڕۆژانەی كە ڕووبەڕووی دوژمن دەبووەوە چاوەڕوانی دەكرد هەتا كاتێك خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو ئینجا هەڵدەسا لە ناویاندا و دەیفەرموو: ((ئەی خەڵكینە خۆزگەی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن مەخوازن و داوای سەلامەتی و پارێزراوی لە خوا بكەن ئەگەر ڕووبەڕوویان بوونەوە ئارام بگرن، وە بزانن بێگومان بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەكاندایە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: پەروەردگارا ئەی دابەزێنەری قورئان وە هێنەری هەورەكان وە ڕوخێنەری تاقمە بێ باوەڕەكان، تێكیان بشكێنە و سەرمان بخە بەسەریاندا)).

٣٩٩ – عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ – رضي الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَالرَّوْحَةُ يَرُوحُهَا الْعَبْدُ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالْغَدْوَةُ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا))[2].

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سەنگەر گرتنی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا چاكترە لە دونیاو ئەوەشی كە

---

[1] البخاري (٢٩٣٣) (٢٩٦٥) (٢٩٦٦) (٣٠٢٤) (٣٠٢٥) (٤١١٥) (٦٣٩٢) (٧٤٨٩) مسلم (١٧٤٢)

[2] البخاري (٢٧٩٤) (٢٨٩٢) (٣٢٥٠) (٦٤١٥) مسلم (١١٣،١١٤/١٨٨١)

لەسەرڕێتی، وە شوێن قامچی یەکێکتان لە بەهەشتدا چاکترە لە دونیاو ئەوەشی کە لەسەرڕێتی، وە سەر لە ئێوارەیەك یاخود سەر لە بەیانییەك بەندە دەرچێت لە پێناوی خوادا چاکترە لە دونیاو ئەوەشی کە تیایدایە)).

٤٠٠ – عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((انْتَدَبَ اللهُ (ولِمُسْلِمٍ: تَضَمَّنَ اللهُ) لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ، لا يُخْرِجُهُ إلاَّ جِهَادٌ فِي سَبِيلِي وَإِيمَانٌ بِي، وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي فَهُوَ عَلَيّ ضَامِنٌ: أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أُرْجِعَهُ إلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، نَائِلاً مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ)) [١].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە دەفەرموێ: ((خوای گەورە زامنی و کەفیلی کەسێك دەکات کە دەرچێت لە پێناویدا، وە هیچ شتێك دەری نەکات جگە لە پێناوی خوادا نەبێت و ئیمان هێنان پێی و بەڕاست زانینی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەوە زامنی لەسەر منە کە بیخەمە بەهەشتەوە، یاخود بیگێڕمەوە بۆ ماڵەکەی کە لێی دەرچووە وە بەدەست هێنانی ئەو پاداشتەی کە بەدەستی گەشتوە یاخود ئەو دەست کەوتە)).

٤٠١ – وَلِمُسْلِمٍ: ((مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ – وَاللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ – كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ، وَتَوَكَّلَ اللهُ لِلْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِهِ إنْ تَوَفَّاهُ: أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يُرْجِعَهُ سَالِماً مَعَ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ)).

وە لەدەربڕینێکی تردا لەلای ئیمامی موسلیم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((وێنەی موجاهید لە پێناوی خوادا، وە خوای گەورە خۆی زاناترە کێ جیهاد دەکات لەپێناویدا، وێنەی کەسێکە کە بەڕۆژ بەڕۆژووبێت و بە شەویش شەو نوێژ بکات، وە خوای گەورە کەفالەتی ئەو موجاهیدەی کردووە کە لەپێناویدا دەجەنگێ ئەگەر مراندی

---

١ البخاري (٣١٢٣) (٧٤٥٧) (٧٤٦٣) مسلم (١٨٧٦)

ئەوا بیخاتە بەهەشتەوە، یاخود بیگێڕێتەوە بە سەلامەتی لەگەڵ پاداشتی جیهادەکەدا یاخود بە دەست کەوتەوە)).

٤٠٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: ((مَا مِنْ مَكْلُومٍ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللهِ، إلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَكَلْمُهُ يَدْمَى: اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ، وَالرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ)) [1].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هیچ بریندارێك نییە بریندار بکرێت لە پێناوی خودا ئیللا ڕۆژی دوایی دێت و برینەکەی خوێنی لێ دەڕوات، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەی بۆنی میسکە " کە بۆنێکی خۆشە")).

٤٠٣ – عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((غَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ رَوْحَةٌ: خَيْرٌ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَغَرَبَتْ)) [2].

واتە: لە ئەبی ئەیوبی ئەنصاریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سەر لەبەیانی دەرچونێك لە پێناوی خوادا یاخود سەر لە ئێوارەیەك چاکترە لەوەی کە خۆر لەسەری هەڵدێت و ئاواش دەبێت)).

٤٠٤ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : ((غَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ رَوْحَةٌ: خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)) [3].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سەر لەبەیانی دەرچونێك لە پێناوی خوادا یاخود سەر لە ئێوارەیەك چاکترە لە دونیاو ئەوەشی تێیدایە)).

---

١ البخاري (٢٣٧) (٢٨٠٣) (٥٥٣٣) مسلم (١٠٥/١٨٧٦)

٢ مسلم (١٨٨٣)

٣ البخاري (٢٧٩٢) (٢٧٩٦) (٦٥٦٨) مسلم (١٨٨٠)

٤٠٥ - عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ - رضي الله عنه - قَالَ: ((خَرَجْنَا مَعَ رَسُول الله صلَّى الله عليه وسلم إِلَى حُنَيْنٍ - وَذَكَرَ قِصَّةً - فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ))[1] " قَالَهَا ثَلاثاً.

واته: له ئەبی قەتادەی ئەنصاریەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچووین بۆ جەنگی " حُنَيْنٍ " ئینجا باسی بەسەر هاتەکەی کرد و وتی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك کەسێکی کوشت و شایەتی لەسەری هەبوو ئەوا تفاقەکەی بۆ ئەوە (واتە جل و بەرگ و چەکەکەی و ولآخەکەشی))). جا ئەبو قەتادە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ جار وای فەرمووی.

٤٠٦ - عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ - رضي الله عنه - قَالَ: ((أَتَى النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم عَيْنٌ مِنْ الْمُشْرِكِينَ، وَهُوَ فِي سَفَرٍ، فَجَلَسَ عِنْدَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ، ثُمَّ انْفَتَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم : اُطْلُبُوهُ وَاقْتُلُوهُ فَقَتَلْتُهُ، فَنَفَّلَنِي سَلَبَهُ))[2].

وَفِي رِوَايَةٍ ((فَقَالَ: مَنْ قَتَلَ الرَّجُلَ؟ فَقَالُوا: ابْنُ الأَكْوَعِ فَقَالَ: لَهُ سَلَبُهُ أَجْمَعُ))[3].

واته: له سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) لە سەفەردا لەلای هاوەڵەکانی (ڕەزای خوایان لێبێ) دانیشتبوو، جاسوسێك لە بێ باوەڕەکان هاتە لای و پاشان ڕۆیشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دوای بکەون و بیکوژن، جا من کوشتم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو تفاقەکەی دا بەخۆم)).

---

١ البخاري (٣١٤٢) مسلم (١٧٥١)

٢ البخاري (٣٠٥١)

٣ مسلم (١٧٥٤)

وه لهدهربرِينێكى تردا: سهلهمه (رِهزاى خواى لێبىٚ) دهڵىٚ: پێغهمبهرى خوا(ﷺ) فهرمووى: كىٚ ئهو پياوهى كوشت؟ وتيان: كورِى ئهكوهع، فهرمووى: ههموو تفاقهكهى بۆ ئهوه)).

٤٠٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم سَرِيَّةً إِلَى نَجْدٍ فَخَرَجتُ فِيهَا، فَأَصَبْنَا إِبِلاً وَغَنَماً، فَبَلَغَتْ سُهْمَانُنَا اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيراً، وَنَفَّلَنَا رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم بَعِيراً بَعِيراً)) [1].

واته: له عهبدوڵلاّى كورِى عومهرهوه (رِهزاى خوايان لێبىٚ) دهڵىٚ: پێغهمبهرى خوا (ﷺ) هێزێكى نارد بۆ " نَجْدِ " منيش لهگهڵيدا رِۆيشتم، وشتر و مهرِێكى زۆرمان بهدهست هێنا، پشكى ههر يهكێمان گهشته دوانزه وشتر، وه پێغهمبهرى خواداش (ﷺ) يهكى وشترێكى تريشى پێداين)).

٤٠٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((إِذَا جَمَعَ اللهُ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ: يُرْفَعُ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ، فَيُقَالُ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلانِ بْنِ فُلانٍ)) [2].

واته: له عهبدوڵلاّى كورِى عومهرهوه (رِهزاى خوايان لێبىٚ) ئهويش له پێغهمبهرهوه (ﷺ) كه فهرموويهتى: ((كاتێك كه خواى گهوره ههموو مرۆڤهكان كۆدهكاتهوه له سهرهتاوه تا كۆتايى، بۆ ههموو بىٚ ناپاكێك ئاڵايهك بهرز دهكرێتهوه، دهوترێت ئهوه ناپاكيهتى فلانى كورِى فلانه)).

---

١ البخاري (٤٣٣٨) مسلم (١٧٤٩/٣٧)

٢ البخاري (٦١٧٧) (٦١٧٨) (٣١٨٨) مسلم (١٧٣٥)

٤٠٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما ((أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم قَتْلَ النِّسَاءِ، وَالصِّبْيَانِ)) [1].

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((ئافرەتێك بینرا لە هەندێك لە جەنگەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) بە کوژراوی، جا پێغەمبەر (ﷺ) نکۆڵی کرد لە کوشتنی ئافرەتان و منداڵان)).

تێبینی وەرگێڕ: کوشتنی ئافرەتان و منداڵان لە جەنگدا دروست نییە بەڵام کاتێك بێباوەڕەکان بیان کەن بە قەڵغان یاخود بە بۆچوون یارمەتیان بەن یاخود لە کاتی تیر باران و تۆپ باراندا ئەوا لە حاڵەتانەدا دروستە.

٤١٠ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضي الله عنه – ((أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ، شَكَيَا الْقَمْلَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم فِي غَزَاةٍ لَهُمَا فَرَخَّصَ لَهُمَا فِي قَمِيصِ الْحَرِيرِ فَرَأَيْتُهُ عَلَيْهِمَا)) [2].

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوام (ڕەزای خوایان لێبێ) لە جەنگێکدا لەتاو ئەسپێ سکاڵایان بردە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش مۆڵەتی پێدان بە پۆشینی کراسی ئاوریشم منیش دیم لەبەریاندا)).

٤١١ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضي الله عنه – قَالَ: ((كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ: مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ صلَّى الله عليه وسلم مِمَّا لَمْ يُوجِفْ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلا رِكَابٍ وَكَانَتْ لِرَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم خَالِصاً، فَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم

---

١ البخاري (٣٠١٤) (٣٠١٥) مسلم (٢٤،٢٥/١٧٤٤)

٢ البخاري (٢٩٢٠) مسلم (٢٦/٢٠٧٦)

يَعْزِلُ نَفَقَةَ أَهْلِهِ سَنَةً، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي الْكُرَاعِ، وَالسِّلاحِ عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ))[1].

واته: له عومەری کوڕی خەطابەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ماڵ و سامانی " بَنِي النَّضِيرِ " لەو دەستکەوتەی کە خودا بەخشی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) وە لەوەی کە موسوڵمانان نەچوونە سەری بە سواری ئەسپ و وشتر (واتە: بێ شەڕدەستی بەسەردا گیرا)، تەنیا بۆ پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەرجی یەك ساڵی خێزانەکانی لێ جیاکردەوە، پاشان ئەوەی کە مایەوە لە ئەسپ و ولاخە بەرزەکان و چەك و تفاقەکان ئامادەی دەکرد لە پێناوی خوادا (واتە بۆ جیهاد))).

تێبینی وەرگێر: فَيءُ ـ غَنِيمَة: هەردووکیان واتە دەست کەوت بەلاَم " فَيءُ " بەبێ جەنگ دەگیرێت ئەوە هەمووی بۆ پێغەمبەری خوادایە (ﷺ) بەلاَم لەدوای مردنی ئەو هەمووی لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکرێت، بەلاَم " غَنِيمَة " ئەو دەست کەوتەیە کە موجاهیدان بەشەڕ دەیگرن ئەوەش بۆخۆیانە تەنها پێنج یەکی نەبێت کە بۆ موسوڵمانان سەرف دەکرێت.

٤١٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((أَجْرَى النَّبِيُّ صلَّى الله عليه وسلم مَا ضُمِّرَ مِنْ الْخَيْلِ: مِنْ الْحَفْيَاءِ إلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ، وَأَجْرَى مَا لَمْ يُضَمَّرْ: مِنْ الثَّنِيَّةِ إلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَكُنْتُ فِيمَنْ أَجْرَى " [2].

قَالَ سُفْيَانُ: مِنَ الْحَفْيَاءِ إلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ: خَمْسَةُ أَمْيَالٍ، أَوْ سِتَّةٌ، وَمَنْ ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ إلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ: مِيلٌ.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پێغەمبەر (ﷺ) پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپانەی کە دابەستە کرابوون لە " حَفْيَاء " وە هەتا " ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ " وە پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپانەی کە دابەستە نەکرابوون لە " ثَنِيَّةِ " وە

١ البخاري (٢٩٠٤) (٤٨٨٥) مسلم (١٧٥٧)

٢ البخاري (٤٢٠) (٢٨٦٨) (٢٨٦٩) (٢٨٧٠) (٧٣٣٦) مسلم (١٨٧٠)

هەتا مزگەوتى "بَنِي زُرَيْقٍ" عەبدوللاى كوڕى عومەر (ڕەزاى خوايـان لێبـىٚ) دەڵـىٚ:مـن يەكێك بووم لەوانەى كە پێشبڕكێم كرد)).

سوفيان (ڕەحمەتى خواى لێبىٚ) دەڵىٚ:لە " حَفْيَاء " وە هەتا " ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ " پێنج ميلە وە لە " ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ " وە هەتا مزگەوتى " بَنِي زُرَيْقٍ " ميلێكە.

حَفْيَاء: شوێنێكە لە دەرەوەى مەدينە.

ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ: بە ڕێگەيەك دەوترێت لە نێوان دوو شاخدا بێت.

٤١٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: ((عُرِضْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم يَوْمَ أُحُدٍ، وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي فِـي الْمُقَابَلَـةِ، وَعُرِضْـتُ عَلَيْـهِ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ، فَأَجَازَنِي)) [١].

واتە: لە عەبدوللاى كوڕى عومەرەوە (ڕەزاى خوايان لێبـىٚ) دەڵـىٚ:((ڕۆژى جـەنگى "أُحُد" چواردە ساڵ بووم پيشانى پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) درام، مۆڵـەتى پـىٚ نـەدام، لەسـاڵى داهـاتوودا ڕۆژى جـەنگى " خَنْـدَق " پـانزە سـاڵ تەمـەنم بـوو پيـشانى درام مۆڵەتى پىٚ دام)).

٤١٤ – وَعَنْهُ { يَعْنِي إِبْنُ عُمَرَ رضـي الله عنهمـا } : ((أَنَّ رَسُـولَ اللهِ صلَّى الله عليـه وسلم قَسَّمَ فِي النَّفَلِ: لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ، وَلِلرَّجُلِ سَهْماً)) [٢].

واتـە: هـەر لـە عەبـدوللاى كـوڕى عومـەرەوە (ڕەزاى خوايـان لێبـىٚ) دەڵـىٚ: ((پێغەمبەرى خوا (ﷺ) دەست كەوتى بەش دەكرد، بـۆ سـوار دوو بـەش، بـۆ پيـادە يەك بەش)).

ڕوونكردنەوە: ئەگەر كەسێك لە جەنگدا سوارى پێبێت ئەوا بۆ سوارەكەى دوو بەشە بۆ خۆشى بەشێكە واتە سىٚ بەشى دەكەوێت.

---

١ البخاري (٢٦٦٤) (٤٠٩٧) مسلم (١٨٦٨)

٢ البخاري (٢٨٦٣) (٤٢٢٨) مسلم (١٧٦٢)

٤١٥ – وَعَنْهُ ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : كَانَ يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ فِي السَّرَايَا لأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً سِوَى قَسْمِ عَامَّةِ الْجَيْشِ)) [١].

واتـه: هـەر لـه عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەرەوه (ڕەزای خوایـان لێبـێ) دەڵـێ: ((پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دەسـت کـەوتی زیـادەی دەدا بـه هەنـدێك لـەو هێزانـەی کـه دەیناردن بۆ جەنگ به تایبەتی بۆ خۆیان، جگه له کۆی گشتی دەست کـەوتی جـەنگی سوپاکه دەیدا پێیان)).

٤١٦ – عَنْ أَبِي مُوسَى – عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاحَ فَلَيْسَ مِنَّا)) [٢].

واته: له ئـەبی موسـاوه (ڕەزای خـوای لێبـێ) کـه نـاوی عەبـدوڵڵای کـوڕی قەیسه: ئەویش له پێغەمبەرەوه (ﷺ) دەفەرموێ: ((هەر کەسێك چەکمان لێ هـەڵبگرێت ئـەوه له ئێمه نییه)).

ڕوونکردنـەوه: چـەك هـەڵگرتن وه هـەموو جـۆره کەرەسـتەیەك مەترسـی هـەبێت هەڵگرتنی ڕووبەڕوی موسـوڵمان هـەتا بـۆ سـۆعبەت و گاڵتـەکردنیش بێـت حـەرام و نـا شەرعیه.

٤١٧ – عَنْ أَبِي مُوسَى – رضي الله عنه – قَالَ: ((سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم عَنْ الرَّجُلِ: يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً. أَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم : مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ)) [٣].

واته: له ئەبی موساوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پرسیار کرا له پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دەربارەی پیاوێك که دەجەنگێت لەبەر ئازایەتی، وه پیاویش هەیـه دەجـەنگێت

---

١ البخاري (٣١٣٥) مسلم (١٧٥٠/٤٠)

٢ البخاري (٧٠٧١) مسلم (١٠٠)

٣ البخاري (١٢٣) (٢٨١٠) (٣١٢٦) (٧٤٥٨) مسلم (١٩٠٤)

وەك دەمار گیریەك بۆ خاك و قەوم و كەسەكەی، وە پیاویش هەیە دەجەنگێت بۆ سومعەو بەرچاوی، كام لەمانە لە پێناوی خودادایە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەر كەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرز و بڵند بێت ئەوە لە ڕێگەی خودادایە)).

## كِتَابُ الْعِتْقِ - پەرتووكى كۆيلە ئازاد كردن

٤١٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَا يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ: قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأُعْطِيَ شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ)) [1].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هەر كەسێك بەشێكی خۆی لە كۆیلەیەكی هاوبەشدا ئازاد بكات وە ئەوەندەی هەبوو كە بگاتە نرخی كۆیلەكە ئەوا نرخی كۆیلەكەی لەسەر دەخەمڵێنرێت، نرخی بەشەكانی تر دەدرێت بە هاوبەشەكانی وە كۆیلەكەش ئازاد دەبێت، وە ئەگەر ماڵی نەبوو ئەوە ئەوەندەی ئازاد بووە كە ئازادی كردووە)).

٤١٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رضي الله عنه – عَنْ النَّبِيِّ صلَّى الله عليه وسلم قَالَ: ((مَنْ أَعْتَقَ شِقْصاً مِنْ مَمْلُوكٍ، فَعَلَيْهِ خَلاصُهُ كُلُّهُ فِي مَالِهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ قُوِّمَ الْمَمْلُوكُ قِيمَةَ عَدْلٍ، ثُمَّ اُسْتُسْعِيَ الْعَبْدُ، غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ)) [2].

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) كە فەرمویەتی: (( هەر كەسێك بەشێك لە كۆیلەیەك ئازاد بكات، ئەوا پێویستە لەسەری كە بەتەواوی ئازادی بكات لە ماڵی خۆی، ئەگەر ماڵی نەبوو ئەوا نرخی كۆیلەكە دەخەمڵێنرێت پاشان پێی دەوترێت بۆ ئیش كردن (واتە بۆ ئەوەی كە پارەی ئەوانی تریش باتەوەو بەتەواوی ئازاد بێت) بەلآم كارێك نا كەنەتوانێت و گران بێت لە سەری)).

---

١ البخاري (٢٥٢٣) مسلم (١٥٠١)

٢ البخاري (٢٤٩٢) (٢٥٠٤) (٢٥٢٧) مسلم (١٥٠٣)

## بەشی فرۆشتنی کۆیلەی چاوەڕوانکراو

العبد المدبر: واتە: بە بەندەیەك دەوترێت کە سەیدەکەی پێی بلێت تۆ ئازادیت پاش مردنم.

٤٢٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: ((دَبَّرَ رَجُلٌ مِنْ الأَنْصَارِ غُلاماً لَهُ))[1].

وَفِي لَفْظٍ: ((بَلَغَ النَّبِيَّ صلَّى الله عليه وسلم : أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ أَعْتَقَ غُلاماً لَهُ عَنْ دُبُرٍ – لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ فَبَاعَهُ رَسُولُ اللهِ صلَّى الله عليه وسلم بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، ثُمَّ أَرْسَلَ ثَمَنَهُ إِلَيْهِ))[2].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:((پیاوێك لە ئەنصاریەکان کۆیلەیەکی گەنجی هەبوو ئازادی کرد دوای مردنی)).

وە لەدەربڕینێکی تردا هاتووە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: ((گەیشت بە پێغەمبەری (ﷺ) کە پیاوێك لە هاوەڵانی کۆیلەیەکی گەنجی هەبوو ئازادی کردووە دوای مردنی، وە ماڵی نەبوو جگە لەو کۆیلەیە نەبێت، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فرۆشتی بە هەشت سەد درهەم، پاشان پارەکەی بۆ نارد)).

تم بعون الله تعالى في رمضان

١٤ـ٨ـ ٢٠١٢ میلادي — ٢٥ـ ٩ـ ١٤٣٣هجري

---

١ البخاري (٢١٤١) (٢٤٠٣) (٢٤١٥) (٦٧١٦) (٦٩٤٧) مسلم (٤١/٩٩٧)

٢ البخاري (٦٩٤٧) مسلم (٩٩٧)

# پيْرِستى بابەتەكان